هۆشمەند عەلی مەحمود

# ڕاپەڕینی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٩١دا



"توێژینەوەیەکی مێژوویی-سیاسییە"



٢٠٠٩

هۆشمەند عەلی مەحمود

# ڕاپەڕینی شاری هەولێر

# لەساڵی ١٩٩١دا

"توێژینەوەیەکی مێژوویی-سیاسییە"

چاپی یەکەم
٢٠٠٩

**ناوی کتێب: ڕاپەڕینی شاری هەولێر لەساڵی ١٩٩١دا**

**نووسینی: هۆشمەند عەلی مەحمود**

**پیتچنین: باوکی سان**

**نەخشەسازیو بەرگ: محەمەد بابۆڵی**

**چاپخانە: کۆمەڵگای چاپەمەنی شەهاب لە هەولێر**

**تیراژ: --٢ دانە**

**چاپی یەکەم/ کانونی یەکەمی ٢-٩**

ژمارەی سپاردنی ( 2547 ) ساڵی ( 2009 )

# بروسکەی ئازادکردنی هەولێر

"لەباوکی ڕێناسەوە

بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بروسك، تکایە

دەست بەکاربن"

**کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی**

**شەوی ١٠-١١/٣/ ١٩٩١**

# پێشکەشە

به گیانی پاکی هاوڕێم

**هێمن جەوهەر مەنتك**

له ٢٣/٤/٢٠٠٣ ماڵئاوایی لێکردین.

## ناوەرۆك

# پێشەکی

باشووری کوردستان لە دوادەیەی سەدەی بیستەم قۆناغێکی تایبەتمەندو جیاوازتر بوو لە مێژووی نەتەوەی کورددا، کە لەم سەردەمەدا گۆڕانکاریەکانی جیهان کاردانەوەی ڕاستەوخۆیان بۆسەر نێوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتیو باشووری کوردستان بەتایبەتی هەبوو، و بە هۆیەوە راپەڕینێکی جەماوەری سەرتاسەری نێوچەکانی کوردستانی گرتەوە، کە لە شارۆچکەی (ڕانیە)وە دەستی پێکردو دواتر زۆربەی ناوچەکانی دیکەش ئازاد کران، تا لە ڕۆژی ١١/٣/١٩٩١دا شاری هەولێریش ئەو ئازادیەی بەخۆیەوە بینی.

راپەڕینی ئازاری ١٩٩١ی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەگشتیو راپەڕینی شاری هەولێر بەتایبەتی ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ بوو لە مێژووی نەتەوەی کورددا، چونکە ئەو شارە یەکەم جاربوو ئەو ئازادییە بەخۆیەوە ببینێ، هەروەها کاریگەری گەورەشی بەسەر شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستاندا هەبوو، بەتایبەتی بوو بەڕێگەیەکی سەرەکی بۆ ئازادکردنی شاری کەرکوك لە دواتردا، بەڵام تائێستاش ئەم ڕووداوە مێژووییە بەشێوەیەکی زانستیانە لێی نەکۆڵراوەتەوە، بەڵکو نووسینەکان زیاتر لەشێوەی ووتاردا بڵاوکراونەتەوە یاخود گوزارشتی لە بۆچوونی لایەنێك لەلایەنە سیاسیەکانی کوردستان کردووە. هەموو ئەمانەش هاندەری سەرەکیم بوون تا بەشێوەیەکی زانستیانە قۆناغەکانی راپەڕینی شاری هەولێر لە ئازاری ١٩٩١دا لە توێژینەوەیەکی زانستی سەربەخۆدا بە پشت بەستن بە چەندین سەرچاوەی زانستیو مەیدانی، بخەمە ڕوو.

ئـەم نووســینەی لەبـەر دەســتدایە لــە دەســت پێکێــك‌و چــوار بـەش پێکهاتووەو بەم شێوەیە دابەشمان کردووە:

لە دەسپێکدا باس لە سەرەتایەکی مێژوویی شاری هـەولێر کـراوە، کـە تیایدا ئاماژە دراوە بە مێژووی دێرینی هەولێرو سنووری جوگرافی‌و گرنگـی ئەم شارە لەسەردەمە کۆنەکان‌و ئێستاشدا.

بەشی یەکەم: بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان‌و ناوچەکە بەر لـە راپەڕین‌و ڕۆڵی لە هەڵگیرساندنی راپـەڕینی بـەهاری ١٩٩١ لـە باشـووری کوردستان، لە دوو باسدا خراوەتە ڕوو بەم شێوەیە:

باسی یەکەم: بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان بـەر لـە ڕاپـەڕین شیکراوەتەوە بە باسکردنێکی کـورتی هەریەکـە لـە: سیاسـەتی بەعـەرەب کـردن (ألتعریـب)، سیاسـەتی بەبەعـسی کـردن (التبعـیس)، سیاسـەتی جینۆساید بەرامبەر بەکورد، وەك: (ئەنفال، بەکارهێنانی چەکی کیمیـایی، وێران کردنی گوندەکانی کوردستان، گرتن‌و لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ).

جگە لە مانەش لەم قۆناغەدا تیشك خراوەتە سەر: یەکگرتنەوەی پارتـە کوردیەکان لەیەك بەرەدا، و گرنگی دان بە ڕاگەیاندن، وەك: ڕادیۆی دەنگـی گەلی کوردستان، ڕادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق.

ئەمانەش دەکرێت وەك چـەند هۆکـارێکی گرنگـی نـاوخۆیی سـەیریان بکەین بۆ هەلآیسانی ڕاپەڕینی باشووری کوردستان لە ساڵی ١٩٩١دا.

باسی دووەم: بارودۆخی عێـراق‌و نێوچـەکەو ڕۆڵـی لـە هەڵگیرسـاندنی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی کوردستان خراوەتە ڕوو بە باسکردنی هەریەکە لە بابەتە جیاوازەکانی وەك: داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق، کۆتـای هـاتنی جەنگی ساردی نێـوان یـەکێتی سـۆڤیەت وئـەمریکا، هانـدان‌و پـشتگیری وڵاتانی دونیا بـۆ هەلآیـسانی ڕاپـەڕین، هەلآیـسانی ڕاپـەڕین لـە خـوارووو ناوەڕاستی عێراق.

بەشی دووەم: تایبەت کراوە بە بارودۆخی شاری هەولێر بەر لە ڕاپەڕین، کە بەسەر سێ باسی سەربەخۆ دابەشکراوە:

باسی یەکەم: ڕاپەڕینی ئۆردووگای خەبات لە ١٩٩١/٣/٤ باسکراوە، و باسی دووەم: خۆپیشاندانەکەی حیزبی شیوعی عێراق لە ١٩٩١/٣/٦ دا شیکراوەتەوە، باسی سێیەمیش: هەڵوێستی حیزبی بەعس بەرامبەر خەڵك بەچەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕینی خەڵکی ئەو شارە خراوەتە ڕوو.

بەشی سێیەم: باس لە ڕاپەڕینی هەولێر دەکات لە ١٩٩١/٣/١١داو بەسەر سێ باسی سەربەخۆ دابەشمانکردووە، بەم جۆرە: باسی یەکەم: دەربارەی هەنگاونان بۆ زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕینی هەولێرە، کە تیایدا هەوڵەکانی سەرکردایەتی سیاسیی کورد بۆ دابەش کردنی شاری هەولێرو شارۆچکەکانی دەوروبەری‌و دابەشکردنی بەسەر چەند بەشێکدا (میحوەر)، لەسەر بنەمای نەخشەی بنەڕەتی‌و سەربازی هەولێرو ودروست کردنی شانەی چەکدار، مەفرەزە پارتیزانەکان بەشێوەیەکی گشتی کراوە.

باسی دووەم: دەربارەی بەرنامەی ئازادکردنی هەولێرە، کە پێشمەرگە بە پاڵپشتی جەماوەر لە دوای ئازادکردنی ناوچەکانی ڕانیەو سلێمانی‌و شەقڵاوەو .....هتد، بە هاوبەشی لەگەڵ ڕێکخستنە نهێنیەکان‌و شانە چەکدارەکان بەرنامەی ئازادکردنی ئەوشارە دادەڕێژن‌و سەرجەمیان لەسەر ڕۆژی ١٩٩١/٣/١١ ڕێك دەکەون وەك ڕۆژی ڕاپەڕینی هەولێر.

باسی سێیەم: ڕۆژانی ئازادکردنەکەی خراوەتە ڕوو، کە باس لە قۆناغەکانی هێرش کردن بۆ ئازادکرنی شاری هەولێر دەکرێت لەلایەن هێزەکانی پێشمەرگە بەهاوبەشی‌و هاوکاری شانە نهێنییەکانی ڕێکخستن‌و چین‌و توێژە جیاوازەکان.

بەشی چوارەم: باس لەشاری هەولێرو شکستی ڕاپەڕین دەکات، کە لە دوو باس پێك هاتووە:

باسی یەکەم: دەربارەی هێرشی سوپای عێراق‌و داگیر کردنەوەی هەولێرە، کە ئاماژە بەوە دراوە چۆن سووپای عێراق لە چەند قۆڵێکەوە هێرشی بۆ سەر ئەو شارە هێناوە، پاش بەرگری چەند ڕۆژەی هێزەکانی پێشمەرگە لە دەردەو ناوەوەی شار، بەڵام سەرەنجام شارەکە لەلایەن ڕژێمەوە داگیر کراوەتەوە.

باسی دووەم: دەربارەی هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕینی ١٩٩١ی باشووری کوردستانە بەگشتی، کە دابەشکراوەتە سەر دوو تەوەرە: (هۆکارە دەرەکییەکان‌و هۆکارە ناوخۆییەکان)، وە هەریەکە لەو تەوەرانەش دابەشکراون بەسەر چەند خاڵێك دا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی گەلی کورد لە باشووری کوردستان، مێژووەك کە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لەم بەشەی کوردستان بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی دەیەی سەدەی بیستەم، بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی زیاتر بۆ نەوەی داهاتوو. بۆیە هیوادارم ئەم هەوڵەی من بەشێکی کەم بێت لەو هەوڵە زانستیانەی کە لەم بوارەدا دراون‌و لە داهاتووش دەدرێن، بەمەبەستی زیاتر خزمەتکردنی کتێبخانەی کوردی لەلایەك‌و نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی گەلەکەمان لەلایەکی دیکە.

ئەوەندەی من ئاگادارم ئەمەی من تاکە هەوڵی زانستیە تا ئێستا سەبارەت بە ڕاپەڕینی هەولێر لە ساڵی ١٩٩١دا درابێت، بەڵام سەبارەت بە شارەکانی دیکەو ڕاپەڕینی باشووری کوردستان لە ١٩٩١ بەگشتی، چەند هەوڵێکی زانستی پوخت هەن، وەك لێکۆڵینەوەکەی هاوڕێی خۆشەویستم (م.پشکۆ حمە تاهیر/ ڕاپەڕینی شاری کەرکوك لە ساڵی ١٩٩١، چ١، مەکتەبی ڕووناکبیری (ی.ن.ك)، ٢٠٠٣)، هەروەها کتێبەکەی: هاوڕێ قادر ڕەسول: لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان.

شایانی باسە ئەم لێکۆڵینەوەیەی من لەساڵی ٢٠٠٢-٢٠٠٣ وە خەریکم و ساڵی ٢٠٠٧ بەشێکی پوختی بەناونیشانی (ڕاپەڕینی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٩١دا) لە ژمارە (٧)ی گۆڤاری زانستی زانستە مرۆییەکانی زانکۆی کۆیە بلاوکراوەتەوەو بەمەش بوو بە سەرچاوەیەکی بەکەڵك و بەسوود بۆ ماستەرنامەی برای ئازیزم (م.ئاراس عبدالرحمن) بەناونیشانی (ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ لە باشووری کوردستان)و ساڵی ٢٠٠٨ پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی زانستەکۆمەلایەتیەکانی زانکۆی کۆیەی کرد. هەر لەوکاتیشدا بەشێك لەم لێکۆڵینەوەیە لە ژمارە ( ٤ )ی گۆڤاری k21 دا بلاوکراوەتەوە.

ئومێدەوارم توانیبێتم خزمەتێکی بچوك پێشکەش بکەم، وە داواکارم لەسەرجەم ئەو تێکۆشەرانەی کەوا ڕۆڵی بەرچاویان لەم ڕووداوە مێژووییانەدا هەبووە لەڕێی نوسین و بلاوکردنەوەیان ئەو کەم و کوڕیانەی ئێمەش پڕبکەنەوە، چونکە من نەم توانیوەو بۆم نەلواوە سەرجەمیان بەسەر بکەمەوەو بەشداری گێڕانەوەی ڕووداوەکانیان پێبکەم بۆ نوسینەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بۆیە داوای لێبوردن لەهەر کەم و کوڕیەکی زانستانە دەکەم.

کانوونی دووەمی ٢٠٠٩

کۆیە

# دەسپێك

## سەرەتایەکی مێژوویی شاری هەولێر:

هەولێر هەرلەدێر زەمانەوە پلەو پایەکی گرنگی لەجیهاندا هەبووە، بەتایبەتی لەمێژووی ڕۆژهەلاتی کۆندا، چونکە چەندین وولاتو میرنشین حوکمڕانیان بەسەر داکردووەو ململانێیەکی زۆر لەنێوان ئەو نەتەوە دێرینانەی کە لەم ناوچەیەو دەوروبەریدا ژیاون، ڕوویداوە.

ئەم تایبەتمەندیەش لەڕووی مێژووییەوە وای لێکردووە ببێتە شوێنێکی مێژوویی و جوگرافی ئەوتۆ، کە مێژوونوسانو لێکۆلەرەوان بەرەو ناخی ڕابردووی ئەم شارە شۆڕببنەوەو زیاتر لە بنجو بنەوانیو لە ڕەوشە جیاجیاکانی بکۆڵنەوەو بەدوای شوێنەوارە دێرینەکانی دا بگەڕێن بۆئەوەی ڕابردوو وئیستای ئەم شارە لە زنجیرەیەکی توندوتۆڵ بەیەکترەوە ببەستنەوە.

بەمەش یەکێکە لەشارە گرنگەکانی مێژوو، چونکە هەر لە سەردەمە دێرینەکانەوە یەکەمین جار کە مرۆڤ فێری نیشتەجێبوون بوو لەوشارەو ناوچەکانی دا نیشتەجێبوون دروست بووە، یەکەم جار بەشێوەی گوندی کشتوکاڵی لەنزیکەی شەش هەزار ساڵی بەر لە زایین، واتە لەوکاتەوەی مرۆڤ گوندی کشتوکاڵیو ژیانی کۆمەڵایەتی ساکاری پێکەوە ناوە.[1]

---

(١) زبير بلال إسماعيل: تأريخ اربيل، من مطبوعات مجلة (هەولێر)، ١٩٩٨، ص٣٧.

سەبارەت بەناوەکەی لەمێژوودا بەچەند شێوەیەك هاتووە، بۆنمونە کۆنترین ناوی (٢٠٠٠سال پ.ز) لە نووسینەکانی شای سۆمەری (شولکی) بە (ئوربیلم) هاتووە[١]، لە دەقە بابلیو ئاشوریەکانیش دا بە (ئەربائیلۆ) هاتووەو واتای (اربعە ألهە-چوارخوا) دەگەینێ[٢]، لە دەقە فارسیە کۆنەکاندا کە بەپێنوسی بزماری نوسراون ناوی بە (ئەربیرا) هاتووە[٣]، لە سەرچاوە یۆنانیو ڕۆمانیەکانیشدا بە (ئاربیلا) یان (ئەربەلا) ناوی براوە[٤]، لە سەردەمی ئەسکەندەری گەورەش (٣٣١پ.ز) بە (ئەربیلاو ئەربلا) ناوبراوە[٥].

هەروەها لە سەردەمی ئیسلامیدا بە (أربل) ناوبراوە[٦]، هەندێکی دیکە دەڵێن ناوەکەی لە (هیلۆ)ی خوای ڕۆژ وەرگیراوە، بۆیە بە واتای (شاری ڕۆژ) دێ[٧]، کوردیش پێی دەڵێن (هەولێر)[٨].

بۆیە (هەولێر) بێ، یان (ئەربیل-ئەربیلا-ئەرابیلو-ئەربیلو-ئەربەئیلو-ئەربائیلا-ئەربائیلو-ئەربل)، ئەوا هەموویان لەیەك نزیکنو

---

(١) شارەوانی هەولێر: هەولێر، لەیادی سەد ساڵەی دامەزراندی شارەوانی هەولێردا، شارەوانی هەولێر دەری کردوە، مطبعة علاء- الوزيرية، ١٩٨٥، ل٢٩١.

(٢) عبدالرزاق الحسني: موجز تأريخ البلدان العراقية، ط٢، ص١٧٦.

(٣) هادي رشيد چاوشلي: تراث اربيل التاريخي، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥، ص١٧.

(٤) زبير بلال اسماعيل: م.س، ص٣٧.

(٥) د.فەرهاد پیربال: هەولێر ناوەکەی لەچی یەوە هاتووە، گۆڤاری (هەولێر)، ژمارە (٥)، زستانی ٢٠٠٠، ل١٠٨.

(٦) ياقوت الحموي: معجم البلدان، الجزء الاول، الطبعة الثاني، ل١٣٨،١٣٧. کی لسترينج: بلدان الخلافة الشرقية، ت: نشير فرانسيس وکورکيس عواد، ص١٢٠.

(٧) هادي رشيد چاوشلي: م.س، ص١٧.

(٨) شارەوانی هەولێر: س.پ، ل١٢٧.

دەچنەوە سەر یەك بنچینە، کە ئەویش مانای بوونی چوار خوایە لەم شوێنەدا[1].

بەمەش دەکرێت بڵێین لەگەڵ ئەوەی مێژوونوسان کۆك نین لەسەر ناوی شاری هەولێر، بەڵام پێمان وایە کە ناوی شارەکە لە (ئەربائیلۆ)ی ئاشوریەکانەوە هاتووە، کە مانای بوونی چوار خواوەند دەگەیەنێ لەم شوێنەدا.

زەوییەکانی ناوچەی هەولێر دەکەوێتە دەشتێکی فراوان و لەنێوان دۆڵی هەردوو زێی گەورەو بچوك دا، هەروەها هاوسنورە لە باکورەوە لەگەڵ تورکیا، لە باشورەوە لەگەڵ لیوای کەرکوك، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە لەگەڵ ئێران و بەشێك لە لیوای سلێمانی و لە ڕۆژئاواشەوە لیوای موسڵ هاوسنوریەتی[2]، دەکەوێتە سەر هێڵی پانی (١١-٣٦) پلە باکورو هێڵی درێژی (٢-٤٢) پلە ڕۆژهەڵات، واتە ناوەڕاستی باشووری کوردستان، ئەم شارە شوێنێکی ستراتیژی گرنگی هەیەو هەر لە کۆنەوە مەڵبەندی بووژاندنەوەی ئابوری ناوچەکەو چەقی جموجۆڵە سەربازی و بازرگانیەکان بووە.[3]

بۆیە لەڕووی جوگرافیەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، دەبینین کە فراوانخوازیەکانی سەرجۆنی ئەکەدی (٢٣٧١-٢٣١٦پ.ز) بە هەولێریش گەیشتوە، ئەمەش بەمەبەستی دەست بەسەراگرتنی

---

(١) یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی: مێژووی شاری هەولێر، لەکۆنەوە تاسالانی شەست، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٧.

(٢) عبد الرزاق الحسنی: موجز تاریخ البلدان العراقیة، ص١٧٤، العراق قدیما وحدیثا، مطبعة عدنان-صیدا، ١٩٥٦، ص٢٣٥.

(٣) سترك: دائرة المعارف الاسلامیة (مادة لربل)، ج٢، ص٥١٦،٥٢١.

ئەوڕێگاو بانانەی لە باکورەوە بۆ ناوەڕاستو باشوور دەچوونو دەرامەتیان پێدا تێدەپەڕی[١].

هەروەها ئەم شارە لە سەردەمە جیاجیایە مێژووییەکاندا، وەك پێگەیەکی گرنگی نێوچەکە تووشی شاڵاوو داگیرکاری بۆتەوە، بۆیەش کاتێك (گۆتیەکان)[٢] دەستیان بەسەر دەوڵەتی ئەکەدی داگرت، هەولێرو کەرکوکیش کەوتنە چوارچێوەی ئەودەسەڵاتەوە، هەولێریش لەوماوەیەدا یەکێك بوو لەپێگە هەرە سەرەکیەکانی گۆتیەکان[٣].

دوای گۆتیەکان هەولێر ڕووبەڕووی هێزێکی تازە بۆوە ئەویش فەرمانڕەوایانی ئوری سێیەمن (٢٠٥٠-١٩٥٠پ.ز) دەستیان گرت بەسەر گۆتیەکان لەڕووی سیاسیەوە، بەڵام لەتواناباندا نەبووە پارێزگاری تەواوی لێبکەن، ئەمەش بەهۆی دووری ئەوشارە لە مەملەکەتی ئوری سێیەم لە باشوور[٤]. بۆیە کاتێك (کاشیەکان) دەرکەوتن، هەولێر کەوتە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەوانەوە[٥].

---

(١) د.هاشم خضير الجنابي: مدينة اربيل، دراسة في جغرافية الحضر، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٧، ص١٠.

(٢) (گۆتیەکان): بەشێکی نەتەوەی کورد پێك دێنن، کە لەناوچەکانی باشووری دەشتی شارەزووردا ژیاون، مەڵبەندی سەرەکیان شاری (ارابخا-کەرکوکی ئێستا) بووە، لەماوەی (١٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایەتیاندا، نزیکەی (٢١) مەلیك فەرمانڕەوایەتیانکردوە، یەکەم مەلیکیان ناوی (Erridupizir)، دەسەڵاتی دوا مەلیکیان (تریکان)ە، کە بەدەستی (ئوتو حیکالی) سۆمەری ڕوخاوە، بڕوانە: (د.جمال رشيدو فوزي رشيد: تأريخ الكرد القديم، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٠، ص٥٢-٥٩)، (نيكولاس يوستغيت: حضارة العراق واثارة، ت.سمير عبد الرحمن الجلبي، دار المأمون الترجمة والنشر، بغداد-١٩٩١، ص١٣١).

(٣) اربيل في ضلال بيان ازار التاريخي، مطبعة الصباح، حله، ١٩٧٢، ص٣٠.

(٤) د.هاشم خضير الجنابي: م.س، ص١٠.

(٥) طة باقر: مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة، ج١، ص١٣٠،١٢٩.

سەرهەڵدانی دەوڵەتی کاشیەکان هاوکات بوو لەگەڵ پێگەیشتنی مەملەکەتی ئاشووری لەباکورو دەرکەوتنی چەند نەتەوەیەکی تازە لەناوچەکەدا، وەك (میتانی) و(خوریەکان)، کە لە نێوچەیەکی فراواندا بڵاوبونەوە، هەر لە چیای زاگرۆسەوە درێژ دە بۆوە تا دەریای ناوەڕاست. دەسەڵاتی میتانیەکان لەوماوەیەدا لە باشووری کوردستانی ئەمڕۆ زۆرتر بڵاوبوو بۆوە، تەنانەت ئاشوریەکانیش کەوتبونە ژێر ڕکێفیانەوە، لەبەرئەوەش بوو دەشتەکانی ئاشورو هەولێرو کەرکوك لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتە تازەیەدابوون[٢].

لەسەردەمی دەوڵەتی ئاشووریدا هەولێر بەجوانترین ڕۆژگارەکانی دا تێپەڕدەبوو، بە تایبەتی کە ببووە پایتەختێکی ئاینی ئاشووریەکان، لەوکاتەدا بەیەکێك لە مەڵبەندەکانی پەرستنی خواوەند (عشتار) ناوبانگی دەرکردبوو، کە ئەوخواوەندە بەناوی عشتار (أربلا) دەناسرا. ناوی پەرستگاکەشی لە نووسینە بزماریەکاندا بەشێوازی (أی-کشان-کلاما) هاتووە، واتە ماڵی خاتوونی هەرێم، کە پەرستگایەکی بۆ خواوەند ئاشوور تێدابوو[٣].

هەولێر وەك شارێکی دێرین چەند گرنگی یەکی تایبەت بەخۆی هەیە، لەم ڕوانگەشەوە هەردوو مێژوونووس (زبیر بلال و عبدالرزاق الحسنی)، بەم شێوەیە ئاماژەیان پێداوە:

١- دەکەوێتە نێوچەیەکی بەپیت و بەرەکەت.

٢- بەهۆی پێگە گرنگەکەی ببوە مەڵبەندی سەرەکی کاروانە بازرگانیەکان، کە دەکەوتە سەر ڕێگا بازرگانیەکان، هەروەها دەکەوتە سەر ڕێگای مێژوویی لەسەر دەمی بابلی-ئاشوریەکان، ئەم ڕێگایەش

---

(٢) محمد أمين زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، ل٧٢-٧٦.

(٣) طة باقر و فواد سفر: المرشد الى مواطن الاثارو الحضارة، وزارة الشقافة والارشاد، الرحلة الخامسة، بغداد،١٩٦٦، ص٣.

سەرەتا لە نەینەوا دەستی پێکرد، بۆ (اربا-ایلۆ)، دوایی بۆ (ارابخا-کەرکوك) پاشان بۆ وولاتی بابل.

٣- هەرێمی هەولێر بەشی گەورەی دەولەتی ئاشوری پێك دەهێنا، هەروەها پێگەی شارەکە کە کەوتۆتە ناوەڕاستی دەشتێکی بەپیت، وای لێکرد کەوا ببێتە شارێکی سەرەکی لەسەدەکانی کۆن[1].

٤- ئەم شارە سەرباری پێشکەوتنی ژیاری و ئاوەدانی، یەکێك بوو لە بنکە سەربازیەکانی ئاشوریەکان بۆ شالاوە سەربازیەکانیان بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەلات.

٥- مەڵبەندێکی گرنگی پەرستگای خواوەندی (عشتار) بوو، کە پەرستگاکەی مەڵبەندێك بوو بۆ(فال) وەکو (دلفوس)ی یۆنانی.

٦- لەبەر ئەوەی ناوچەی هەولێر دەولەمەند بوو بەئاوی ژێرزەوی و کارێزەکانی، ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لەسەر ژیان لەشارەکەدا، وداگیر کەران نەیان توانیوە کارێزو سەرچاوە ئاوییەکانی تێك بدەن، وەك چۆن سەرچاوەکانی ئاوی بابل و شارەکانی باشوریان تێکدا[2].

شاری هەولێر وەك شارێکی کۆن ناسراوەو وەبەردەوام بووەو پارێزگاری لەناوی کردوە تا ئەمڕۆ بە هۆی ئەو ئەدگارو خەسڵەتانەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دا، بۆیە بەکۆنترین شاری زیندوو ئاوەدانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهان دادەنرێت[3].

شاری هەولێر بۆماوەیەك لەژێر فەرمانڕەوای هەخامەنشینەکان مایەوە تا ئیمپراتۆریەتەکەیان زەوت کرا لەلایەن ئەسکەندەری

---

(١) زبیر بلال اسماعیل: م.س، ص٣٨.

(٢) عبدالرزاق الحسنی: العراق قدیماو حدیثا، ص٢٣٨-٢٣٩.

(٣) زبیر بلال اسماعیل: م.س، ص٣٨.

مەکەدۆنی لە شەڕێکی یەکلا کەرەوە، کە لەنزیك شاری هەولێر هەڵگیرسا[1].

بەمەش بوو بە بەشێك لە ئەمپراتۆریەتە فراوانەکەی ئەسکەندەر، ئەوکاتەش ساڵی (۳۲۳پ.ز) کە ئەسکەندەر لەبابل کۆچی دوایی‌کرد، بوو بە موڵکی یەکێك لەسەر کردەکانی کە ناوی (سلۆقس) بوو[2]. هەروەها فرثیەکانیش لەسەر شانۆی ناوچەکە دەرکەوتن (۱٤۸پ.ز-۲۲٦ز)و دەستیان بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سلۆقیەکان داگرت‌و بەداگیرکاری وولاتێکی یەکگرتوویان قووت کردەوە، کە لە ژمارەیەك میرنشینی یەکگرتووی وەك: میرنشینی روهاو تدمرو سنجار وحضر، دواتریش میرنشینی حدیاب پێك هاتبوو، کە هەولێر لە گرنگترین شارەکانی حدیاب بووە[3].

ئەم گۆڕانە لە هێزی سیاسی ناوچەکە بەردەوام دەبێت، بۆیە پاش فرثیەکان، هەولێر تووشی داگیرکاری دەبێتەوە لەلایەن ڕۆمانەکان، لە بەناو بانگترین ئەو مەلیکانەی ڕۆمانیش کە هەولێری داگیرکرد، (کراکلا)بووە.[4]

دوای ئەو قۆناغە مێژووییانەی پێیدا تێپەڕی، کە چەندین هێزی سیاسی جیاجیا لەو ناوچەیە حوکمیان کردووەو ڕۆڵی مێژوویی خۆیان هەبووە لەسەر ئەو شارە، دەبینین ئەمجارە ڕووبە ڕووی هێرش‌و پەلاماری هێزێکی تازە دەبێتەوە ئەویش هێزی ئیسلامە، کە

---

(۱) طه باقر: مقدمة فی التاریخ الحضارات القدیمة، ج۱، بغداد، ۱۹٥٦، ص٤٤٤-٤٤٥.

(۲) طه باقر و فواد سفر: المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الرابعة، ص۸.

(۳) د.هاشم خضیر الجنابی: م.س، ص۱۱.

(٤) طه باقر و فواد سفر: المرشد إلى مواطن الآثار والحضارة، الرحلة الخامسة، ص٤.

لەسەردەمی خەلیفە (عمر بن خطاب خ.ل) دا هەولێر دەکەوێتە چوار چێوەی دەوڵەتی ئیسلامیەوە .[1] دوای ئەوەی (عقبە بن فرقد) دەستی بەسەر موسڵ داگرت، توانی زۆربەی شارەکانی کوردستان یەك لە دوای یەك داگیر بکات، وەك نێوچەکانی زاخۆو ئامێدیو دهۆكو ئاکرێ، وێڕای هەولێرو سلێمانیش.[2]

لەچوار چێوەی دەسەڵاتی ئیسلامیش دا هەولێر بارێکی ئاسایی و ئارامی بەخۆوە نەبینی، بەڵکو بەردەوام شوێنی ململانێی و کێشەکانی نێوخۆییان بووە، بۆ نمونە: لە نزیك هەولێر شەڕێکی گەورەو بەهێز لەنێوان عەباسیو ئومەویەکاندا ساڵی (١٣٢ك-٧٥٠ز) هەڵگیرسا و بەشەڕی (الزاب) ناسرا، تێیدا مەروانی کوڕی محمدی دوامیرنشینی بەنی ئومەویە شکستی هێنا[3]، بەمەش هەولێر بوو بە بەشێك لە چوار چێوەی ئیمپراتۆریەتە فراوانەکەی دەوڵەتی عەباسی.

هەروەها چەندین میرنشین حوکمی تیادا کردووە، بۆ نمونە لەسەر دەمی بوەیهیەکاندا کە دەستیان بەسەر خەلافەتی عەباسیدا گرتبوو (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٤-١٠٥٥ز)، (هەزبانیەکان) توانیان میرنشینایەتییەکی شیاو بۆ خۆیان دروست کەن، هەولێریشیان کرد بە پایتەختی خۆیان، بەڵام هەرزوو بەزوو ئەم میرنشینە کوردیە کەوتە ناکۆکیەوە لەگەڵ میرنشینێکی دیکەی کوردا (میرنشینی عقر الحمیدیە)[4].

---

(١) شوان عوسمان مستەفا: کوردستانو پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد، (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە)، سەنتەری چاپو پەخشی تەما، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ٢٣٥.

(٢) شارەوانی هەولێر: س.پ، ل٢٩٢.

(٣) شوان عوسمان مستەفا: س.پ، ل٢٤٩.

(٤) د.محسن محمد حسین: اربیل فی العهد الاتابکی، بحث فی اوضاع اربیل السیاسیةو الاقتصادیةو العسکریةو الاداریةو الثقافیة فی العهد الاتابکی، رسالة ماجستیر، مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٧٦، ص٣٩.

ساڵی(٥٣٩/١١٤٤ز) زين الدين علی كوچك كوڕی بكتكين كوڕی محمد، كە سەركردايەتی قەڵای موسڵی بۆ عمادالدين زنكی دەكرد، توانی میرنشینێکی نێوچەیی لە هەولێرو دەوروبەری دروست بكات، كە بەناوی میرنشینی ئەتابەكی ناسراوە، جگە لە هەولێر، شارەزورو چەند ناوچەیەكی دیكەشی دەگرتەوە[1].

كاتێك زين الدين (٥٦٣ك/١١٦٨ز) كۆچی دوایی كرد، كوڕە بچوكەكەی (زين الدين يوسف) شوێنی گرتەوە، دوای ئەویش (مظفرالدين كوكبری) برای لەساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز) دەسەڵاتی گرتە دەستو هەولێر لە فەرمانڕەوایەتی ئەم میرەدا بوو بە بەهێزترین میرنشینە ئیسلامیەكان[2]، هەر لە سەردەمی ئەمیشدا بەجوانترینو باشترینو گەشترین ڕۆژگاری دا تێپەڕی، بەجۆرێك بەدرێژایی سەدەكانی ناوەڕاست گەشەكردنێكی وای بەخۆوە نەدیبوو[3].

شایانی باسە لەسەردەمی مظفرالدين و دوای ئەویش ڕوو بەڕووی مەترسی داگیركاریەكانی مەغۆل بۆوە، بەتایبەتی كاتێك ساڵی (٦٥٦ك-١٢٥٨ز) بەغدا بەدەستی هۆلاكۆ ڕووخا، بەڵام هەولێر یەكێك بوو لەو شارانەی بەرگریو بەرەنگاریەكی زۆری كرد[4]. لەكاتی ئەم هێرشو پەلامارانەدا، بێگومان زوڵمی زۆری بەدەستی مەغۆلەكان دیوەو بەشێكی زۆریشیان لە قەڵاكەی ڕووخاندوە.

دوای ئەم ڕووداوانە شاری هەولێر چووە ژێر دەسەڵاتی توركمانی قەرە قۆینلوو ئاق قۆینلو لە ساڵی ١٤١٠زدا، دواتر لە ساڵی ١٥٠٨زدا،

---

(١) اربيل (هەولێر)، بين الماضي و الحاضر، ص٣١.

(٢) د.هاشم خضير الجنابي: م.س، ص١٣.

(٣) شارەوانی هەولێر: س.پ، ل٢٩٤.

(٤) د.عبد الله محمد علی علياويی: الكرد في عهد المغولي، رسالة ماجستير، هەولێر، ٢٠٠٠، ص٨٧.

کەوتە ژێردەستی سەفەوییەکان تا ساڵی ١٥١٤ز کاتێك کە سەفەوی یەکان لەشەڕی چاڵدێران دا بەرامبەر بە عوسمانیەکان شکان،[١] ئیدی لێرەوە کەوتە ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کە ئەوکات قەزایەك بوو سەر بە بەغدا، بەڵام لەسەردەمی محمد پاشای ڕەواندز لە ساڵی ١٨٣٦ز پایتەختی سەردەمی میرانی سۆران بووە.[٢]

دوای عوسمانیەکان هەولێر لەلایەن بەریتانیاوە لە(١٠ی تشرینی دووەمی١٩١٨)داگیرکراوەو یەکەم یاریدەدەری حاکمی سیاسیان بەناوی نەقیب (های) لە حوزەیرانی ١٩١٩ بۆ داناو لە رۆژی تشرینی دووەمی ١٩١٩ لیوای هەولێریان پێکهێناوە.[٣]

بەمەش کەوتە قۆناغێکی دیکەی مێژوویییەوە، قۆناغێك لە ژێر ستەمو زوڵمی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقی تازە دامەزراو، هەتا دوای نەمانی دەسەڵاتی پاشایەتی لە عێراق و ڕاگەیاندنی کۆماری عێراق لە ١٩٥٨، بە دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسیشەوە لە ١٩٦٨ تا ساڵی ١٩٩١، ئەو شارە چەندین ڕووداوو گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینیوە، لەسەروو هەموویانەوە پێشهات و ڕووداوو گۆڕانکارییەکانی سەرەتای دەیەی ساڵی ١٩٩٠ی عێراق و گەیشتن بە ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی ئازاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان بوو.

---

(١) زبیر بلال اسماعیل: م.س، ص١٣٧.

(٢) هادی رشید چاوشلی: م.س، ص٢٢-٢٣.

(٣) زبیر بلال اسماعیل: م.س، ص٢١٦،٢١٧.

# بەشی یەکەم

## بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان و نێوچەکە بەر لە ڕاپەڕین و ڕۆڵی لە هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینی ١٩٩١

### باسی یەکەم

بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان بەر لە ڕاپەڕین.

### باسی دووەم

بارودۆخی عێراق و نێوچەکەو ڕۆڵی لە هەڵگیرساندنی ڕاپەڕین.

# باسی یەکەم
# بارودۆخی سیاسیی باشووری کوردستان بەر لە ڕاپەڕین

ماوەی نێوان سالانی ١٩٨٠بۆ١٩٩٠، کوردستان تووشی گەلێك ڕووداو کارەساتی ناهەمواربۆوە، گەلێك دەرفەتی بۆ ڕەخساو نالەبارییەکی زۆریش ڕووی تێکرد بۆ لەناوچوونی بەری ئەم دەرفەتانە.

پاش جەنگی جیهانی دووەم هیچ ڕووداوێك هێندەی (جەنگی عێراق -ئێران) کاریگەری لەسەر کوردستان نەبووەو لەسەرەتادا لەبەرژەوەندی کورد دابوو، بە قازانج بۆ شۆڕشی کوردو میللەتی کورد دەگەڕایەوە، چونکە دەسپێکردنی ئەو جەنگە هەلی گەشانەوەی بۆ بزووتنەوەی چەکداریی کورد ڕەخساند، کە بەغدای ناچارکردبوو بەشێکی زۆری هێزەکانی بکێشێتەوە بۆ بەرەکانی جەنگ لەناوەندو باشووری عێراق دا[1].

---

(١) کۆمەڵێك نوسەری کوردو بیانی: گەلێکی پەژموودەو نیشتمانی پەرت، و. محمد گۆمەیی، سوید، ١٩٩٨، ل٤٠٤.

بەم کشانەوەیەش سنووری چالاکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان فراوان بوو[1]، بۆ کورد ئەم جەنگە وەهایکرد کە جگە لەوچەند سەد پێشمەرگەیەی کە پاش هەرەسی ١٩٧٥ لەدەرەوەی عێراق لەگەڵ سەرکردەکانیاندا مابونەوەو دەستیان بەشەڕی دژ بەرژێم کردبۆوە، سەدان کەسی تر لە (ئۆردووگا زۆرە ملێ یەکان)، کە ڕژێم بۆ خەڵکە ڕاگوێزراوەکانی دروستکردبوو، بەرەو چیاکان‌و سنوری (هـ.پ.ك) کۆچ بکەن[2].

بەمەش دەبینین لەڕووی زیادبوون‌و چەندایەتیەوە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەتەواوی گەشەی کرد بوو، چونکە بەسەدان کەس لەو سەربازانەی ریزەکانی سوپای عێراقیان جێ دەهێشت بەشێکی زۆریان، هەم لەترسی تۆڵەی حکومەت یان بەگیانی بەرگری‌و بڕوا بەخۆبوونەوە دەچوونە ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لەوانە دەیان کەسیان وەك کادیری سیاسیی‌و پێشمەرگە ڕۆڵی خۆیان گێڕا لە گەشەکردنی شۆڕشی کوردستاندا.

لەبەرئەم هۆیانە شەڕی عێراق-ئێران سوودی زۆری بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەبووە لە ڕووی زیاد بوونی ژمارەی هێزی پێشمەرگەوە، چونکە پێش ڕوودانی ئەم شەڕە هەموو هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بە ووتەی (ڕێباز) خۆی لە نزیکەی (٤٠٠٠ تا ٥٠٠٠) کەس نەدەدا.(٣)

---

(١) ڕێباز: قەندیل بەغدای هەژاند، بەشی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین، ١٩٩٣، ل٣٣.

(٢) کۆمەڵێك نوسەری کوردو بیانی: س.پ، ل٤٠٤.

(٣) ڕێباز: س.پ، ل٣٢.

هەروەها لایەنێکی باشەی دیکەی ئەم جەنگە بۆ کوردو هێزی پێشمەرگە لەوەدابوو کە حکومەتی عێراقی بەهۆی ئەم جەنگەوە توانای سەربازی کەم ببۆوە، شپرزە بوو بوو، توانای هێرشی بۆ سەر بنکەو مەفرەزەکانی پێشمەرگە لاواز ببوو، کۆپتەرەکانیش سەرقاڵی جەنگ بوون، کە چەکێکی کوشندە بوو بەرامبەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان، جگە لەمەش بەهۆی ئەم جەنگەوە هەر زوو هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەسەڵاتی بەسەر کوردستان زیادی کرد، بەتایبەتی بەهۆی کشانەوەی هێزەکانی دوژمن لە هەندێ نێوچە، لەبەرامبەردا هێزی پێشمەرگە بارەگای لێ دامەزراند.(١)

لەبەرئەوەی بەهۆی ئەو جەنگەوە حکومەتی بەعس نە دەپرژایە سەرکارەکانی وەك پێویست، هەروەها نەی دەتوانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەتەواوی کۆنترۆڵ بکاتو رێگری بکات لەبەردەم چالاکیو هاتوو چۆکانیان لەنێوان دێهاتو هەتابگرە لەنێوان شارە گەورەکانی کوردستانیشدا، بەجۆرێك هێزی پێشمەرگە جیا لەجاران دەیانتوانی بەرۆژ هاتوو چۆبکەن لە دەوروبەری شارەکان، کە پێشتر ئەمەیان بەئاسانی بۆ مەیسەر نەدەبوو لەبەر درندەیی دووژمن، لەم بارەیەوە( رێباز) لە کتێبی (قەندیل بەغدای هەژاند)دا، دەڵێت: "ئەو رۆژەی کە شەڕی عێراق-ئێران دەستی پێکرد لە ناوچەی دەشتی هەولێر بووین، رۆژێکی زۆر خۆش بوو بۆیەکەمین جار بەرۆژ لەگوندەکان سووڕاینەوە بە ئوتومبێل هەتا دەوروبەری بێستانەی گەورە لە ناحیەی قوشتەپە هاتین، ئومێدی شۆڕشگێران بە

---

(١) رێباز: س.پ، ل٣١-٣٣.

شۆڕشەکەیان زیاتربوو خەڵکیش هەرچەندە ترس و سامی بەعسیەکانی لەسەرنیشتبوو، بەڵام بەوشەڕە کوردایەتی سەرلەنوێ لەدڵ و دەرونیان بوژایەوە هیواو ئاواتیان پەیداکردەوە".(١)

تاپێش کۆتایی هاتنی جەنگی عێراق-ئێران، بارودۆخەکە لەبەرژەوەندی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازانەی کورد بوو، وەك کە باسمان کرد، بەڵام کاتێك (جەنگی عێراق-ئێران)(٢) وەستا، بارودۆخەکە پێچەوانە بۆوە، چونکە کۆتایی هاتنی جەنگ و پێکدادان بەپێی هەلومەرجی عێراق دەرفەتێکی مێژوویی لەباری بۆ ڕەخساند، تا هەوڵ و تەقەلای خۆی بگەینێتە لووتکەو کورد بێنێ بەچۆکدا.(٣) بەمەش ڕاوەستانی جەنگ بووە هۆی شکستێکی گەورەی هێزە چەکدارییە کوردییەکان لە خوارووڕۆژهەڵاتی کوردستان، چونکە ڕژێمی عێراق یارمەتی ئەوهێزە کوردیانەی دەدا کە شان بەشانی شەڕی ئێرانیان دەکرد، هەروەها ڕژێمی ئێرانیش یارمەتی ئەوهێزە کوردیانەی دەدا کەشان بەشانی شەڕیان دەکرد دژی عێراق، بەڵام

---

(١) هـ.س، ل٢٥.

(٢) پەسەندکردنەی بڕیاری (٥٩٨)ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٨ی تەمموزی ١٩٨٨ لەلایەن ئێرانەوە، بوو بەهۆی ڕاگەیاندنی ئاگربەسی ٨ی ئابی ١٩٨٨، (کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی و هیوای سەربەخۆیی، و.ئەکرەمی میهرداد، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٨٥).

(٣) میدڵ ئیست ووچ: جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و.سیامەندی موفتی زادە، چاپخانەی خاك، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٤٢.

بەکۆتایی هاتنی جەنگ، عێراق و ئێران وایان دەربڕی دەوری هێزە کوردییەکان کۆتایی هات، بە ئاشت بوونەوەی نێوانیان.(١)

هەرچەندە سەرکردایەتی سیاسیی کورد تا ڕادەیەك هەستی بەم مەسەلەیە کردبوو، بۆ نمونە، ئەحمەد بامەڕنی نوێنەری (ی.ن.ك) لە فەرەنسا، پێش ئەم ڕووداوانە ئەوەی ڕاگەیاندبوو کە ئەگەری ئاگربەسی نێوان عێراق وئێران ئەنجامەکەی کارەساتێکی گەورە دەبێت بۆکورد.(٢)

لەڕاستیدا ئەنجامەکانی وەستانی جەنگ وەك هەستی پێکرابوو هەروابوو، زۆر زوو کاریگەرییە خراپەکانی بەدیکراو بەجۆرێك باروذۆخی کوردستان پێش ڕاپەڕین باروذۆخێکی زۆر نالەباربوو، چونکە سوپای عێراق بەهەموو توانای خۆی هاتە سەر کوردستان،(٣) بۆ نمونە، لە٢٨ی ئابی ساڵی ١٩٨٨دا عێراق بەهێزێکی سووپایی گەورە، هێرشێکی دڕندانەی کردە سەر کوردستان و پێش چەندمانگێکیش هەزاران گوندی بەناوی (عملیات الانفال) تەخت کرد، خەڵکانی بێ تاوان و ئەوانەی بەردەست کەوتن کوژران،(٤) هەروەها بەشێوەیەکی بەرنامەڕێژ چەکی کیمیاوی لەچوار چێوەی ئۆپەراسیۆنی (ئەنفال)(٥) دا بەکارهێنا، کە ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازیە بەرفراوانە

---

(١) جواد ملا: كردستان والكرد، وطن مقسم وامة بلا دولة، تقديم: جمال نەبەز، دار الحكمة-لندن، ٢٠٠٢، ص٩٦.

(٢) کریس کۆچێرا: س.پ، ل٩٠.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا بەختیار)، سلێمانی،٢٠٠٢/١١/٢٦.

(٤) ڕێباز: نرکەی کوردستان (بەرلەڕاپەڕین، لەگەڵ ڕاپەڕین، دوای ڕاپەڕین)، هەولێر، ١٩٩٢، ل٢٤.

بووە هۆی ترس و بێ هێزی و لاوازی بزووتنەوەی کورد، چونکە حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو لە کارە دڕندانەکانی و لە هێرش و پەلامارە بێ شومارەکانی بۆ قرکردنی کورد، تەنانەت ڕۆژی ٥ی ئابی ١٩٨٨ پێش ئاگر بەس لەگەڵ ئێران، بە (١٢) لەشکری سەربازی و (١٨) تیپی جاش خەفیفە (جاشی کورد)، بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی پارتی (پ.د.ك) لەنێوچەی سیدەکانی سەر بە پارێزگای هەولێر.[1]

هەروەها سیاسەتی خاپور کردنی ژێرخانی ئابووری و ژیانی کۆمەڵایەتی دێهاتی کوردستانی لەڕێی دەرکردن و کاولکردنەوەدا، بەجۆرێك ئەو دێهاتانەی ڕاستەو خۆ لەبەرەی جەنگ دانەبوون لە سنووری دەسەڵاتی پێشمەرگە، هەموو جۆرە خزمەتگوزاریەکی کۆمەڵایەتی، تەندروستی و ڕۆشنبیریان لێبڕا، ئەمەش بۆئەوەی دانیشتوانی ئەودێهاتانە ناچاربکات کۆچ بەرەو بازێرو شارەکان بکەن، بۆنمونە، بڕیاری داخستنی (٧٤٨) قوتابخانەی سەرەتایی دا لە دێهاتەکانی سەربە هەولێرو سلێمانی و دهۆك.[2] لەئەنجامی ئەو کارەساتانەدا بارودۆخی ئابوری خەڵکی کوردستان، بە تایبەتی

---

(٥)(ئەنفال): ووشەیەکی عەرەبیە بەواتەی (تالآنکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ)، هەروەها ناوی سوڕەتی هەشتەمی قورئانە، کە تێیدا باسی یاساکانی جەنگ و مافی داگیرکاری و فتوحات دەکات، سەرباری ئەمە ئەنفال بۆ بەعسیەکانی عێراق، ناوی ئۆپەراسیۆنی بێویژدانانەی قڕکردنی کورد بووە، بڕوانە: (کۆمەڵێك نوسەری کورد و بیانی: س.پ، ل٤١٠)؛ (جواد ملا: م.س، ص٩٤).

(١) کریس کۆچێرا: س.پ، ل٨٥،٨٦.

(٢) کۆمەڵێك نووسەری کورد و بیانی: س.پ، ل٤٠٧.

ئەوانەی لەلادێ کانەوە دەگوێزرانەوە بۆ ئۆردوگاو شارو شارۆچکەکان زۆر شپرزە ببوو،[1] شۆڕشی کوردیش بە ئەندازەی نیوەی سەردەمی شۆڕشی ١٩٧٤ هێزو توانای نەمابوو،[2] بەڵام ئەگەر ئەو ڕۆژگارانەی ئەوسەردەم بەراورد بکەین بەنسکۆی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٧٥، ئەوا ساڵی ١٩٨٨ کارەساتەکە زۆر نالەبارتر بوو، چونکە هیچ دێهاتێکی کوردستان نەمابوو، هەروەها حکومەتی عێراقی چەندین سیاسەتی جۆراوجۆری گرتە بەر بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد، کە دەکرێت بەم شێوەیە بیانخەینەڕوو:

١-سیاسەتی بەعەرەب کردن (ألتعریب): سیاسەتی بەعەرەب کردن، یەکێکی ترە لە سیاسەتەکانی ڕژێمی عێراق بەرامبەر بە کورد، کە مەبەستی داگیرکردنی کوردستان‌و تواندنەوەی نەتەوەی کورد بوو، بۆئەوەی کوردستان بکاتە نیشتمانی عەرەب‌و بەشێکیش لە کورد بە عەرەب لەقەڵەم بدات، تا لەلایەکەوە چەند بۆی بکرێ باشووری کوردستان پارچە پارچە بکات‌و بەعەرەبی بکات، لەلایەکی تریشەوە نەخشەی دیمۆگرافی کوردستان‌و عێراق بگۆڕێ، تا لەڕێیەوە بەشێك لە نەتەوەی کورد بکاتە عەرەب.[3]

ئەم سیاسەتە لە باشووری کوردستان سیاسەتێکی نوێ‌و کاتی نەبوو، بەڵکو مەبەست‌و ڕیشەی مێژووی درێژ خایەن‌و ستراتیژی خۆی

(١) ڕێباز: نرکەی کوردستان، ل٢٥.

(٢) مەلا بەختیار: س.پ ، ل٢٥٤.

(٣) ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی عێراق‌و سێکوچکەی بەعسیان: (تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی دووەم، ١٩٩٩، ل٢٢٩.

هەبوو، لەپێناوی چەسپاندنی بۆچوون و تیۆرییە شۆڤینی یەکانی خۆیان، لەسەر دەست بەسەرداگرتنی بەرووبوم و سامانە سروشتیەکانی کوردستان و تواندنەوەی گەلەکەی لەناو گەلی عەرەبی سەردەستدا.[1]

لەگەڵ بەهێزبوونی تەیارە نەتەوە پەرستەکانی عەرەب و پاش ئەوەی توانی جێگەی خۆی لەسەر شانۆی سیاسی نێوچەکە بکاتەوە، دەبینین هەر لەسەرەتاوە جولانەوەی کوردیان بەکۆسپی بەردەمی یەکێتی عەرب داناوە، کوردیان بە بەشێك لە عەرەب و کوردستانیش بە بەشێك لە نیشتمانی عەرەب دادەنا، بۆیە بەربەرەکانی کورد و بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستان و مافە نەتەوایەتی یەکەیان، لەڕێگەی بەعەرەب کردنەوە گرتبووەبەر.[2]

بۆیە ئەگەر چاوێك بەجوگرافیای کوردستان و مێژووی پێك هاتەکەی دابگێڕین بەر لە ڕاپەڕین، دەبینین زۆر شێواندن و گۆڕان بەدی دەکرا، کە نەخشەی باشووری کوردستان و باری دیمۆگرافی و لایەنی ئابووری و کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵ و باغ و بێستان و سەرچاوەی ئاوو بیرو کانی و ناوچەدێهاتیەکان...تاد، زۆربەیان لە جێگەی خۆیان نەمانوو خاپووركران.[3]

---

(١) دەزگای ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك): کەرکوك و سیاسەتی تەعریب، چاپخانەی شەهید ابراهیم عەزۆ، ئایاری-١٩٨٥، ل٢٩.

(٢) مەحمود مەلا عززەت: بازنەکانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد، چاپخانەی ڕەنج، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٣٣، ٣٤.

(٣) مەحمود مەلا عززەت: س.پ، ل٧٣.

سیاسەتی بەعەرەب کردن سەرتاپای کوردستانی گرتبۆوە بێ جیاوازی، بۆیە شاری (هەولێر)یش وەك شارەکانی دیکەی کوردستان بێبەش نەبووە لەم سیاسەتە. بەجۆرێك سنووری ئەم پارێزگایە دووچاری ئەم سیاسەتە چەواشەیە بۆوەو زۆرێك لە زەویەکانی خەڵکی عەرەبی تێدا نیشتە جێ کران،[1] ئەم پرۆسەیەش لە ڕێگەی هێنانی خەڵکی خێڵەکی عەرەبی باشووری عێراق، بەهاندان‌و دەم چەورکردن‌و یارمەتی دان‌و خان‌و بەرە بۆدروست کردن ئەنجامدەدرا، پاش ئەوەی دەخرانە سەرکەڵکەڵەی ئەوەی بێن بۆ باشووری کوردستان، سەرەنجام جوتیارە کوردەکانی لە ڕەگ‌و ڕیشە هەڵدەکەندوو لە ئۆردووگا زۆرەملێ یەکانی ژێر دەسەڵاتی، کە بەدرێژایی ڕێگەو بانە سەرەکیەکان دروست کرابوون، نیشتەجێ دەکران.[2]

لە شاری هەولێر بێ ڕەوشتی دەزگاکانی (بەعس‌و ئەمن) گەیشتبوە ڕادەیکی وا کەکەس پێی قبوڵ نەدەکراو لەهەمان کاتدا بەعەرەب کردنیش بێکۆسپ‌و تەگەرە بووە لەبەردەم بەعسیەکاندا.[3]

لەبەرئەوەی ئەم سیاسەتە زۆربەی شارەکانی کوردستانی گرتەوە، بۆیە دەتوانین بەعەرەب کردن بەیەکێك لە هۆکارەکانی دیکەی ڕاپەڕینی ئازاری ۱۹۹۱ دابنرێت.

۲-سیاسەتی بەبەعس کردن (التبعیس): حیزبی بەعس لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی بیستەم، لەسوریا، لەبارودۆخێکی (ئابوری، سیاسی،

---

(۱) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ۲۰۰۲/۱۱/۲۹.

(۲) میدڵ ئیست ووچ: س.پ، ل۱۰۰.

(۳) ڕێباز: نرکەی کوردستان، ل۲۷.

کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی)ی دواکەوتودا جوڵانەوەیەکی نەتەوە پەرست بەناوی (جوڵانەوەی بەعسی عەرەب)و بەقۆستنەوەی ئەوبۆشاییە سیاسی و ئایدۆلۆژیەی ئەوسەردەم سەری هەڵداو، لە دەروازەیەکی نەتەوەپەرستانەی قاڵبو لەناوبۆتەی نازیزم دا هاتەکۆڕی ژیانی سیاسی عەرەبەوە، کە بۆیەکەم جار لەعێراقدا"١٩٦٣/٢/٨" بۆچەند مانگێك دەسەڵاتی گرتەدەستو پاشان بۆجاری دووەم لە "١٩٦٨/٧/١٧" بەپێ ی پلانێکی ئیمپریالیستیانە، دەسەڵاتی لە عێراق گرتەوە دەست،[1] تاراپەڕینی ١٩٩١ لەکوردستان جڵەوی ئەودەسەڵاتەی هەر بەدەستەوە بوو.

بەگرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن حزبی بەعس لە عێراقدا، گەلی عێراق بەگشتی و نەتەوەی کورد بەتایبەتی لە سەختترین ڕۆژانی (سیاسی-کۆمەڵایەتی) خۆیان دا دەژیان، چونکە هەڵگرتنی هەرجۆرە ئایدیایەك، جگە لەئایدیای بەعس قەدەغەو ئەنجامەکەشی گرتنو کوشتن بوو، کە بەعس بەگوێرەی ئەوسەرەتایە هەنگاوی هەڵدێناو دەیگوت: " ئەوەی لە گەڵم دانەبێ دژمە".[2]

هەربۆیە سەرجەم شارو شارۆچکەکانی کوردستان ڕووبەڕووی ئەم سیاسەتە بوونەتەوە، کە بە بەعسی کردنی هاووڵاتیان کارێکی ڕۆژانەی بەردەوام بووە، بۆنمونە زۆربەی خوێندکارانی کچ و کوڕ

---

(١) ئەمین قادر مینە: س.پ ، ل٦٤-٦٦.

(٢) هـ.س، ل٧٤،٧٥.

لەخانەی مامۆستایان، یان لە پەیمانگاو کۆلێژەکان وەرنەدەگیرا ئەگەربە (واژۆ)یەك بە بەعسی بوونی خۆی نەسەلماندبوایە.[1]

دەبینین ڕژێمی بەعسی عێراق بەشێوەیەکی چڕوپڕ ئەم سیاسەتەی بەرامبەر بەکورد گرتبوەبەر، لەچوارچێوەی جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە شاری (هەولێر)یش لێی بەدەر نەبوەو ڕژێم چەندین ڕێگای جیاجیای بەکارهێناوە بۆ بە بەعسی کردنی هاوولاَتیان لەم شارەو سەرجەم شارەکانی دیکەی کوردستان. بەشێوەیەکی گشتی ئەو ڕێگایانەی کە گیرابوونە بەر بۆ بە بەعسی کردنی کورد لە باشووری کوردستان، ئەمانەبوون:-

١-دامەزراندنی بەعسیەکان لەدام‌ودەزگاکان.

٢-بە بەعسی کردنی خوێندکاران لە ناوەندەکانی خوێندن.

٣-بە بەعسی کردنی نەتەوەکان (کورد، تورکمان، ئاشووری،...هتد).

٤-دابەشکردنی گەڕەکەکان لەسەر بنەمایەکی حیزبی‌و بە بەعسی کردنی بە زۆر.[2]

پاش بێزار کردنی خەڵك لەڕێگەی ئەم سیاسەتەوە، دەتوانین بە بەعسی کردنیش بەیەکێك لە هۆکارەکانی دیکەی ئەم ڕاپەڕینە دابنێین.

<u>٣-سیاسەتی جینۆساید بەرامبەر بە کورد:</u> سیاسەتی جینۆساید (قڕکردنی بەکۆمەڵ)ی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە نەتەوەی کورد،

(١) ڕێباز: نرکەی کوردستان، ل٢٧.

(٢) لەتیف فاتیح فەرەج: کوردو کەرکوك، پەیڤین (گۆڤار)، ژمارە(٢)، ئۆکتۆبەری١٩٩٧، ل٥٨،٥٧.

مێژوویەکی لەپێشینەی دوورو درێژی هەیە، بەڵام ئەوەی کە زیاتر کاریگەربوو لەسەر کورد پەلامارەکانی ساڵی (١٩٨٧-١٩٨٩) بوون، چونکە بەقوڵی ڕەگیان لە مێژووی نەتەوەی کورد لە باشووری کوردستاندا کوتاوە،[1] ئەم پەلامارانەش چەند خاسیەتێکی پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤیان لە خۆگرتبوو، کە ئەمانەن:-

**أ-(ئەنفال):**

ئەنفالەکان بەدناوترین و نەگریسترین پەڵەیە لە مێژووی ڕژێمی عێراق و حیزبی بەعس و خودی سەدام حسێن، هەروەها ئۆباڵێکی سیاسی و مرۆیی گەورەشە لەسەر شانی ئەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کە لەبەر بەرژەوەند بازی خۆیان لەجەنگی سارددا، ڕژێمی عێراقیان پڕچەکی کوشندەی کیمیاوی کردو لەکاتی بەکارهێنانیشی دژی کورد، تاوانی بێدەنگیان هەڵبژارد، جگە لەوەی دەوڵەتانی عەرەبی (سوریاو لیبیای لێ دەربهاوێن)، سەرجەم ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پشتیوانی سەدام بوون[2].

ئەنفال تەنیا پرۆسەی جینۆسایدکردنی کت و پڕی مرۆڤی کورد نەبوو، بەڵکو ئەزموونێکی (٣٠) ساڵەی بەرنامە بۆ داڕێژراو بوو لەسەر نەخشەیەکی بەربڵاو بۆ لە ناوبردن و تواندنەوەی ڕەچەڵەکی کوردو گۆڕینی ڕەگەزی کورد بەعەرەب و شێواندنی جوگرافیا و دیمۆگرافی کوردستان، ئەم پرۆسەیە بەپێی هەل و مەرجە دژوارو تایبەتیەکانی

---

(١) مێدڵ ئیست ووچ: س.پ، ل٥٠.

(٢) حیکمەت محمد کریم (مەلا بەختیار): شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکاریەکانی سەردەم (خەباتی شاخەکان یان ڕاپەڕینی شارەکان)، چاپی سێیەم، هەولێر-١٩٩٤، ل٢٥٣.

گـــۆڕانی بەســـەر داهـــاتوەو بەچـــەندین تاکتیـــك و قۆنـــاغی جیـــاواز داتێپەڕیوە[1].

قۆنـــاغی یەکـــەمی ئەنفالـــەکان لـــەمانگی (١٩٨٨/٢) تامـــانگی (١٩٨٨/٣)و دووەمیـان لەمانگی (٤تا٥ /١٩٨٨)و سێیەمیان لەمانگی (٥تا١٩٨٨/٨)و دوا قۆناغیش لەمانگی (٨) دەستی پێکردو لەمانگی (٩)دا کۆتایی پێهات[2].

پرۆسەی ئەنفال لەساڵی ١٩٨٨دا سەراپا ناوچە ئازادکراوەکانی گرتەوە، بەتایبەتی ئەوناوچانەی کەلەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەو شۆڕشـدابوون، کەناوچـەکانی (دۆڵـی جافایـەتی، شـارباژێر، مەرگـە، پشدەر، قـەرەداغ، تـەواوی گـەرمیان، شـارەزوور، هـەورامان، پێنجوێن، گۆپتەپەو عەسکەر، دەشتی هـەولێر، بالیسان، باڵەکایـەتی، بادینـان)ی دەگرتـەوە، کەئـەم پرۆسـەیە گـەورە تـرین و سـامناکترین شێوەی ئـەنفال بوو، لەهەمانکاتدا هێزی پێشمەرگە چی لەتوانا بوو بەرگری کرد، بەڵام دەرەنجامەکـەی بـێ سـەرو شـوێن کردنـی (چارەکە ملیۆنێك) کـوردی لێ کەوتەوە[3].

هێرشـــە ســـەربازیەکانی ســـوپای عێـــراق کەراســـتەوخۆ بـــۆ وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان و بێ سەرو شوێن کردنـی بەکۆمـەڵی دانیشتوانی ئەوگوندانەو تـاڵانکردنی مـاڵ و سـامانیان ئاراستەکرابوو،

---

(١) عەبـــدوڵلا کـــەریم مـــەحمود: ڕەشـــەبای ژەهـــرو ئـــەنفال، بـــەرگی یەکـــەم، لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی، بەڕێوەبـەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠٠٢، ل٤.

(٢) کۆمەڵێك نوسەری کوردو بیانی: س.پ، ل٤١٠.

(٣) عەبدوڵلا کەریم مەحمود: س.پ، ل١٠.

لەگـەڵ کارەسـاتی (هۆلۆکۆسـت)[1]دا، بەڕەچـاوکردنی جیـاوازی لـە ژمـارەی قوربانیـانی ئـەو دوو ڕوو داوە گەورەیـە، جیاوازیـەکی ئـەوتۆی نەبووە[2].

لەگـەڵ ئـەوەی کەپرۆسـەی ئـەنفال زۆربـەی شـارو شارۆچـکەکانی کوردسـتانی گرتـەوە، دەبیـنین پارێزگـای (هـەولێر)یـش وەك سـەرجەم ناوچـەکانی تـری کوردسـتان، بـەدور نـەبوە لـەم پرۆسـەیە، چونکە ئـەم پارێزگایـە دەوڵەمەنـدە بەسـامانی کـانزایی بەتایبـەتی نـەوت، کەنـەوت کەوتۆتـە خـوارووی پارێزگاکـە لەناحیـەی (تـەق تـەق)ی سـەر بەقـەزای (کۆیە)، کاری ئەنفالیش بەپلەی یەکەم دانیشتوانی ئەم گوند نشینانەی گرتـەوەو، سـەرەنجام گونـدەکانی سـەر بەم پارێزگایـە لەقەزای (کۆیـە)و ناوچە دەشتاییەکانی دەوڵەمەند بەکانزاو ناوچە شوێنەواریەکان، یـەك لـەدوای یـەك خـاپورکران‌و بەرپرۆسـەی ئـەنفال کـەوتن[3]، دواتـر

(١) (هۆلۆکۆست): ئەوقەتڵ‌و عامەیە، نازییەکانی ئەڵمانیا بەسەرۆکایەتی (هیتلەر) دوای ئـەوەی کەلـە (٣٠کـانوونی دووەمـی ١٩٣٣) دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت، بەرامبـەر بەجوولەکـەکانی وڵاتـانی ئـەوروپا ئـەنجامیان دا، کـە لـەکاتی جـەنگی دووەمی جیهانی لەژێر ڕکێفی ئەڵمانیادا بوون، ئەم پرۆسەیەش بەڕێگەی دەست نیشانکردن، کۆکردنـەوە، ڕاگواسـتن، پاشـان کوشـتن‌و لەناوبردن، ئەنجام دەدرا، کە ئەنفالەکانیش هاوشێوەی ئەم کارەساتە بوون، ( ستیفن برۆکفیڵدو پۆل ئە. لیڤن، بۆنەوەکانتانی بگێڕنـەوە،( دەربارەی ئـەو هۆلۆکۆسـتەیە کە لە ئـەورووپای ١٩٣٣-١٩٤٥دا ڕوویـداوە)، و.ئیـبراهیم خ.ئەحمـەد، لـە بڵاوکراوەکـانی دەزگـای چاپ‌و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٧-٧٨).

(٢) زیاد عبدالرحمن: تونی مەرگ (هێرشەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامـەکانی ڕژێم دا)، تەورێز، ١٩٩٥، ل٣.

(٣) م. محمـد عبداللـە عومـەر: ئـەنفالی پارێزگـای هـەولێر (هۆکـارو دەرئـەنجام)، سەنتەری برایەتی (گۆڤار)، ژمارە (٢٤)، هاوینی ٢٠٠٢، ل٢٩٤،٢٩٣.

هێرشەکانی ئەنفال بەردەوام بوو بۆسەر ناوچەکانی هەولێر تابە (عملیات خاتمە الانفال) لەڕۆژی ٢٦/ئابی/١٩٨٨لە بادینان تەواو بوو[١].

بۆیە دەبینین ئەنجامی ئەم کردارانەی ڕژێمی عێراق، (١٨٢) هەزار کوردی لەنێرو مێ کۆکردەوە کەتەمەنیان لەنێوان (١٢-١٨) ساڵان دابوون، لەناوچەو گوندە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان، پاش ئەوەی کۆیان کردنەوەو باریان کردن لەبار هەڵگری گەورە، دواتر بردیانن بۆبیابانەکانی خواروی عێراق‌و، بلدۆزەر چەندین چاڵی گەورەیان بۆ هەڵکەندن‌و سەرجەمیان تێدا زیندە بەچاڵکردن[٢].

**ب- بەکارهێنانی چەکی کیمیایی:**

یەکەم هێرشی کیمیاوی نەخشە بۆکێشراو لە ١٩٨٧/٤/١٥ ئەنجامدرا، بەڵام دۆکۆمێنت‌و سەرچاوە کوردیەکان هاوباوەڕن لەوەدا کە لەشکری عێراق بۆیەکەم جار لەناوەندی مانگی چواری ١٩٨٧دا چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە[٣]، پاشان لە ١٩٨٧/٤/١٦ بۆچەند کاتژمێرێك زیاتر بە چەکی کیمیایی بۆردومانی گوندەکانی (شێخ وەسانانی دۆڵی بالیسان)ی سەر بەهەرێمی هەولێری کردووەو، زیاتر لە (٣٠٠)هاووڵاتی ژن‌و منداڵ‌و پیر، شەهیدو بریندار بووینە[٤].

---

(١) نەوشیروان مستەفا ئەمین: خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی ڕوداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٨٤-١٩٨٨، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٥٢.

(٢) جواد ملا: م.س، ل٩٥،٩٤.

(٣) کۆمەڵێك نوسەری کوردو بیانی: س.پ، ل٤١٠،٤٠٩.

(٤) عەبدوڵلا کەریم مەحمود: س.پ، ل٧.

بەڵام گەورەترین کارەسات بەهۆی چەکی کیمیایی لەشارۆچکەی هەڵەبجە ڕوویدا، کەکاتێك گەرمەی شەڕی نێوان عێراق-ئێران بوو، ئێران لەزۆرلاوە بەشێوەیەکی پەرش و بڵاو هێرش و پەلامارەکانی بۆسەر ناوچەکانی (کوردستانی باشوور)دەست پێکردبوو، تادواجار بەهاوکاری هێزی پێشمەرگەو لەڕوو بەڕوو بوونەوەی شەڕێکی گەورە بەرامبەر بەعێراق، کەتیایدا لە ٨٠٪ هێزەکانی عێراق کوژران و ئەوانی تریش بەدیل گیران، دەستیان بەسەر شارۆچکەی هەڵەبجەدا گرت. بەم ڕووداوەش ڕژێمی بەعس بەبۆمبارانکردنی هەڵەبجە لە ١٦و١٧/٣/١٩٨٨ بەگازی کیمیایی وەڵامی ئێران و دانیشتوانی هەڵەبجەی دایەوەو، سەرەنجام (٥) هەزار هاووڵاتی کورد لەناوچوون[١].

پەلاماری کیمیایی بۆسەر هەڵەبجە نوقڵانە لێ دەری سیاسەتی لەوەو پاشی ئەنفال بوو، کەلەو هەشت قۆناغەی پەلامارە سەربازییەکەدا ئەم چەکە قەدەغانە دژ بەگوندەکانی کوردستان بەکار دەهات، بەڕادەیەکی وا کەدانیشتوانیان بتۆقێنێ و ئەوەی لە هەڵەبجەدا ڕووی دا وەبیری بێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کەوا هەڵەبجە بەشێك نەبوو لە ئەنفال، بەڵام بەگەورەترین کاری دڕندەیی جەنگ دەژمێردرێت دژ بە کورد.[٢]

<u>ج- وێران کردنی گوندەکانی کوردستان:</u>

لەناوەڕاستی هەفتاکانەوە، واتە بەر لەهاتنە پێشەوەی بیرۆکەی ئەنفال، حکومەتی عێراقی پلانی تێك دانی گوندەکانی کوردستانی

---

(١) کریس کۆچێرا: س.پ، ل٨٤.

(٢) میدڵ ئیست وۆچ: س.پ، ل٢١٤.

بەپێی ڕێبازو قۆناغی جیاجیا، داڕشتبوو. یەکێك لە قۆناغەکانی تێك دانی گوندەکان بۆ پاش ساڵی ١٩٧٤ دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی پاش سازکردنی چەند کۆنگرەیەکی کشتوکاڵی لەلایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی عێراق،کەتیایدا پلانی ڕاگواستنی گوندنشینەکانی خستەناو چوار چێوەیەکی (زانستی)یەوە بۆجێ بەجێ کردنی ئەم پلانەی کەپێ یان دەگوت (اصلاح زراعی)[1].

حکومەتی عێراق لە ژێر ئەم پلانەدا، سەرەتا سەدەها گوندی بەناو (هاوچەرخ)و(سۆسیالیستی)و(زانستی)، لەسەرانسەری عێراق دا دروست کرد، هەر لەچوار چێوەی ئەم پلانەدا، چەندەها گوند لە باکورو ناوەڕاستو باشووری عێراق دا خاپورکرانو لەجێگایاندا ئۆردوگای زۆرەملێ دروست کران[2].

بۆیە دەبینین لەنێوان ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٩ ژمارەی ئەوگوندانەی خاپورکران، گەیشتە (٧٤٢) گوند کە زۆربەیان کەوتبونە ناوچە سنوریەکانی (باڵەك، چۆمان، مێرگەسور، ناودەشت، زاخۆ، گۆرەتو، مەیدان، شێروان، گرمگ، خورماڵ، خانەقینو بیارە)[3].

---

(١) د.ئازاد شێخانی: ئەنفال لەناو چوارچێوەی قۆناغەکانی دروستکردنی ئۆردوگا زۆرە ملێ یەکاندا، سەنتەری برایەتی (گۆڤار)، ژمارە (٢٤)، هاوینی ٢٠٠٢، ل٤٣٧.

(٢) د.خليل اسماعيل: انماط الاستطيان الريفي في العراق، بغداد، مطبعة الحوادث، ١٩٨٢، ص٣٦.

(٣) سليمان عبدالله اسماعيل: تهجير المستوطنات الريفية في اقليم كوردستان العراق، گولان العربي (مجلة)، العدد(٣٩)، ئابی ١٩٩٩، ص٥٧.

پاش بالأدەست بوونی میلیتاریانەی ڕژێمی دیکتاتۆری بەغدا، سەرجەم کاولکاری‌و کارەساتی تراژیدی سەیرو سەمەرەی بەدوای خۆی داهێناو زیاتر لە (٤٠٠٠) هەزار گوند خاپورکران، بەمەش سەرجەم ناوچە گوندنشینەکان خاپورکران‌و چیاو گردۆڵکەکان کرابوونە پایەگای سەربازی‌و مین ڕێژ کرابوون[1].

ئەم سیاسەتە لەهەموو جێگەیەکی کوردستاندا پیادە دەکراو، بەمەش کوردستان ببوە تاقیگەی جێ بەجێ کردنی بیرو ئایدۆلۆژیاکانی حزبی بەعس[2].

## د- گرتن‌و لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ:

یەکێ لەسیاسەتەکانی تری حیزبی بەعس کە بەرامبەر بە نەتەوەی کورد پیادەی دەکرد، گرتن‌و لەسێدارەدانی بەکۆمەڵ بوو. بۆیە دەبینین ئەم ڕژێمە بەشێوەیەکی هەرەمەکی هەڵدەستا بەگرتنی گوندنشینەکان لەناوچە (قەدەغەکراوەکان)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ناوچانە زێدی باب‌و باپیرانی خۆیان بوون، کەتیایدا لەسێدارەدانی بەکۆمەڵ‌و بێ سەرو شوێن کردنی دەیان هەزار خەڵکی بێ تاوانی ئەنجام دەدا، کەزۆرجار ژمارەیەکی زۆر ئافرەت‌و منداڵی لەخۆدەگرت، جاری واش هەبوو کۆمەڵ کوژی بەرامبەر تەواوی دانیشتوانی گوندێك ئەنجام دەدرا(٣).

---

(١) ف.رەش: خوێندنەوەی سیاسی لە نێوگرەوی ئەگەرەکاندا، هەڵوێستی نیشتمانی (گۆڤار)، ژمارە(٥)، ئاياری ٢٠٠٠، ل٤٥،٤٤.

(٢) ئەمین قادر مینە: س.پ، ل٧٥.

(٣) میدڵ ئیست ووچ: س.پ، ل٤٩،٤٨.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم سیاسەتە لەشارەکانی هەولێرو دهۆك‌و سلێمانی، پیادە دەکراو بەهەزاران کەس لە سێدارە دەدران‌و بەهەزارانیش لە گرتوو خانەکان دا چاوەڕوانی چارەنوسی نادیاریان دەکرد(١).

زەبرو زەنگی ڕژێم بەرامبەر بەخەڵکی کوردستان گەیشتە ڕادەیەك، تەنانەت کە ئەم زەبرو زەنگ‌و ترسە لەسەر دەروونی پیاوانی ڕژێم‌و ئەڵقە لە گوێیەکانیشی ڕەنگ بداتەوە، چونکە هیچ کەسێك نەمابوو کەسێکی یان ناسیاوێکی بەدەستی ڕژێم نەکوژرابێت یان زوڵمی دەرهەق نەکرابێت، بۆیە خەڵك کەوتە ناڕازی دەربڕین‌و چیتر ئەم ڕژێمە قبوڵ نەکەن(٢).

لەلایەکی ترەوە حکومەتی عێراقی پشتیوانی گەورەی هەبوو لەلایەن دەوڵەتانی ناوچەکەو جیهانەوە، هێزێکی بەهێزی هەبوو کە پێك هاتبوو لە (٤٠) فرقەی سەربازی‌و زیاتر لە (١٧٠) فەوجی خەفیفە، و بەهەزاران تانك‌و تۆپخانەی هەبوو(٣).

نەوشیروان مستەفا لەباسی ئەو ڕۆژگارانەی ئەوسەردەم نوسیوویەتی:" هێرشەکانی ئەنفال‌و بەدوای ئەوەدا گرتنی هەموو بارەگا گرنگەکانی ی.ن.ك‌و ئینجا داگیرکردنی هەموو کوردستانی عێراق‌و گیران‌و بزرکردنی دەیان هەزار کەس لە دانیشتوانی ناوچە ئازادەکان‌و وێرانکردنی هەموو دێهاتی کوردستان، کارەساتێکی

---

(١) ف.رەش: س.پ، ل٤٥.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت رسول عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

نەتەوەیی بەسەر کورد دا هێنا، بەمەش کوردستان بوو بەزیندانێکی تەنگو کورد بەگەلێکی دیل"(١).

لەگەڵ هەموو ئەو کارەساتانەدا، خەڵکی کوردستان ئیرادەی هەربەهێز بوو، هێزی پێشمەرگە لە گورز وەشاندن نەکەوت بەرامبەر بە ڕژێم، پێش ئەنفالەکان گەورەترین چالاکی هێزی پێشمەرگە بەسەر کردایەتی ی.ن.ك، بەرامبەر بە حکومەتی عێراقی ئەنجامدرا، کە گرتنی (سەری ڕش) بوو لە ( ١٩٨٨/١/٢٦) توانیان زەرەرو زیانێکی زۆر بە دوژمن بگەیەننو (٢٥٠٠) کلانشیکۆف دەست بەسەر دابگرن، کە بۆیەکەم جاربوو لە مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی دا، هێزی پێشمەرگە بتوانێت لە چالاکیەکدا زەبرێکی ئاوا کوشندە بە دوژمن بگەیەنێت(٢). بەقسەی مسعود بارزانی ئەو جەنگەی کە لەڕۆژی ١٩ی تموز تا ٥ی ئەیلول لە ناوچەی خواکورك لە باشوری سنوری هاوبەشی ئێران- عێراق و تورکیا ڕووی دا، یەکێك بوو لە گەورەترین داستانەکانی مێژووی بەرگری کورد، پێشمەرگەکان سەرەڕای بەکارهێنانی گازی کیمیایی لە بەرامبەریاندا نیشانیاندا کەلەم ٤٨ ڕۆژەدا (١٩تموز-٥ئەیلول)، تەنها جەنگی کەنداوی نێوان ئێران-عێراق نەبووە، بەڵکو جەنگێکی دیکە بەناوی جەنگی کوردستان هەبووە(٣).

ئەگەر جاروباریش ئاکامی خۆپیشاندانو ڕاپەرینی ئەمو ئەو شاری کوردستان، هەوڵدرابێ جەماوەری شارەکان هانی شێوەکانی

---

(١) نەوشیروان مستەفا امین: س.پ، ل١٥٣.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت رسول علی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

(٣) کریس کۆچێرا: س.پ، ل٨٦،٨٧.

دیکەی خەبات بدرێن، بەڵام لەبەرئەوەی خەباتی چەکداری کرابووە ستراتیژو سوننەتی ڕزگاری کوردو جەماوەر، بەگیانی پشت بەستن بەم ستراتیژە گۆش دەکراو ئومێدی هەرە گەورەیان سەرکەوتنی خەباتی چەکداری بوو، هاوشانی بەردەوامی جەنگی ناوخۆ لەکاتی خۆپیشاندان و ڕاپەڕینەکانی ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٦دا نەتوانرا خرۆشانی جەماوەری شارەکان پەرەپێبدرێ و ستراتیژێکی نوێ بۆ گەلەکە گەڵاڵە بکرێ، سوور بوون لەسەر ستراتیژی چەکداری و لەناو خەباتی چەکداریشدا سووربوون لەجەنگی ناوخۆ، ساڵانی زێڕین لەکیس دران و هەڵکەوتی کەم وێنە لەمێژووی ڕاپەڕینە چەکدارەکانی کوردستان بەفیڕۆ چوون(١).

بەم جۆرە باری کوردستان وای لێهات کە جێگەی هیچ جۆرە بەرخودانێکی تێدا نەبێتەوە، نە بەچەکداری و نەنا چەکداری، لە کۆتاییەکانی ١٩٨٨دا سەرکردایەتی کورد بەو پێشمەرگانەوە کە ڕزگاریان ببوو، ناچار سنووریان بڕی و خۆیان بەئێران و سوریاداکرد، دەرگاش بۆ بەغدا خرایەسەرپشت کەبەشێنەیی پلانەکانی (ئاسایشی ستراتیجی) سەر سنورەکان ئەنجامبدات(٢)، بەم شێوەیە هێزی پێشمەرگە لەخاکی کوردستان نەمان، تەنیا چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگە، لەشێوەی پارتیزانی لەناوچە جیا جیا کانی کوردستان مابۆوە(٣). ئەمەش کۆتایی قۆناغێك بوو، قۆناغی خەباتی چەکداری

---

(١) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٥٥.

(٢) کۆمەڵێك نوسەری کوردو بیانی: س.پ، ل٤١١.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ڕەهبەر سەید برایم)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٤.

سیاسیی لە شاخەکانی باشووری کوردستاندا، بەڵام کۆتاییەکی زۆر تراژیدی(١).

بەڵام دوای ئەو هەموو کارەساتانە، جارێکی دیکە پارتە سیاسیە کوردستانیەکان چەند هەنگاوێکی گرنگی سیاسییان هەڵێنا وەك بەرنامەی کاری سیاسیی خۆیان و لە هەمان کاتیشدا وەك ئامادە باشیەك بۆ هەر گۆڕانێکی گەورەی سیاسیی کە بەسەر حکومەتی عێراقی دابێت، ئەم هەنگاوانەش دەکرێت گرنگترینیان بەم شێوەیە بخەینەڕوو:

١- یەکگرتنەوەی پارتە کوردیەکان لەیەك بەرەدا:

یەککگرتن و یەك دەنگی پارتە کوردیەکان لەکۆتایی هەشتاکاندا، بە هۆکارێکی دیکەی گرنگ دادەنرێت بۆ راپەڕینی بەهاری ١٩٩١. بۆیە دەبینین پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان لەناوەڕاستی هەشتاکاندا، هەوڵی لێك نزیك بوونەوەیان لەگەڵ یەکتری دا، کە زۆر دانیشتنی دوولایەن لەنێوان (ی.ن.ك) و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان و پاسۆك و پاشان پارتی دیموکراتی گەل (سامی عبدالرحمن)، لەبەهاری ١٩٨٦ بەمەبەستی بەدیهێنانی زەمینەیەکی گونجاو ئەنجام درا، دواتریش لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٦ دیدارێك لەنێوان مام جەلال و ئیدریس بارزانی هەربۆ ئەم مەبەستە پێك هات، پاشان لەساڵی ١٩٨٧ بۆنزیك بوونەوە لەیەکتری کۆبوونەوەیەك لەنێوان (پ.د.ك) و پارتی سۆسیالیستی کوردستان (ڕەسوڵ مامەند) و پاسۆك،

---

(١) نەوشیروان مستەفا امین: س.پ، ل١٥٣.

لەسەرکردایەتی پارتی لەپاژانی خاکی ئێران ئەنجام درا(١). ئامانجی هەموو ئەم کۆبوونەوانە بۆیەك دەنگی نێوانیان بوو بەرامبەر بەرژێمی بەغدا.

سەرجەمی ئەم کۆبوونەوانەی کەباسکران بۆیەك دەنگی پارتە کوردیەکان، حزبی شیوعی عێراقی بەشداری تێدا نەکرد، لەهەمان کاتدا ئەوەشی ڕاگەیاند کەدژی ئەم کۆبوونەوانە نی یە، تادواجار لەناوەڕاستی ١٩٨٧ لەبارەگای (یەکێتی) نزیك سەردەشتی خاکی ئێران کۆبوونەوەیەك ئەنجام درا، کە ئەمجارەیان نوێنەرێکی حزبی شیوعی عێراقی (د. رحیم عەجینە) بەشدار بوو، پاشان بەشدار بوان لە سەر پێویستی پێك هێنانی بەرەیەك لە پارتەکانی کوردستان پێك هاتن(٢).

بەم شێوەیە بەرەی کوردستانی لە ١٩٨٧/٥/٧دا پێك هاتو ئەندامانی جگە لە (ی.ن.ك)و(پ.د.ك)، بریتی بوون لە (سۆسیالیست)و(پاسۆك)و(پارتی گەل)و(حزبی شیوعی عێراق- لقی کوردستان)و پاشان لەساڵی ١٩٩٠ دوو حزبی تریش هاتنە ناو ئەم بەرەیەوە، کەئەوانیش (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان)و(جوڵانەوەی دیموکراتی ئاشووری) بوون.

دوای پێك هێنانی بەرە بەرنامەیەکی کاریان داناو کەتیایدا بەرەی کوردستانی بڕیاری دا بەدوو هێڵی هاوسەنگ جوڵەبکات بەم شێوەیە: هێڵی یەکەمیان: هەوڵدان بۆ کردنەوەی کەناڵی پەیوەندی لەگەڵ

(١) کریس کۆچێرا: س.پ، ل٨٠.

(٢) هـ.س، ل٨٠.

سەرکردایەتی ڕژێمی دەسەڵاتدار لەبەغدا، ئەوەش بەناردنی وەفدێکی بەرە بۆ (تونس) بەسەرۆکایەتی (د. محمود عوسمان)، بۆ ئەوەی لەوێوە کەناڵی پەیوەندی لەگەڵ بەغدا بکەنەوە(١)، بەڵام هەوڵەکانیان سەری نەگرت چونکە ڕژێمی بەغدا لەلایەن خۆیەوە لەساڵانی (١٩٨٩و١٩٩٠) خۆی ئەوەندە پێ بەهێز بوو، کەپەیام بۆ هەموو سەرکردەکانی ئۆ پۆ زسیۆن بەکوردەکانیشەوە، بنێری و داوایان لێ بکات کە بگەڕێنەوە ڕیزەکانی بەرەی نیشتمانی(٢).

هەرچەندە (مام جەلال) پێ ی وابووە کەشەڕ ڕوودەدات و سەدام حسین پاشەکشە ناکات و گفتوگۆ لەگەڵی داسوودی نیە، چونکە پاش ئەوەی لە (تونس) چاویان بە (حكم بلعاوی) کەوتووە، بەڵێنی پێداون کەبچێت بۆ بەغداو لەڕێگەی (سبعاوی) برای سەدام حسین (سەرۆکی مخابەراتی گشتی بۆ ئەو کاتە)، پێشنیاری گفتو گۆیان بۆ بکات لەگەڵ ڕژێم، بەڵام مام جەلال ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەگوێ بیستی هیچ وەڵامێك نەبووینەوەو شەڕ ڕووی داو عێراق دۆڕا(٣).

بەڵام هێڵی دووەم: بەشداری کردن بوو لەو هەوڵانەی کە گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەستیان پێ کردبوو بۆ گەیشتن بەدارشتنی کاری هاوبەش، کە بەپێك هێنانی لیژنەی کاری هاوبەش کۆتایی پێ هات و لە ١٩٩٠/١٢/٢٧ بەیانی دامەزراندنی دەرچوو،

---

(١) صلاح الخرسان: التيارات السياسية في الكردستان العراق، قراة فى ملفات الحركات والاحزاب الكردية فى العراق ١٩٤٦-٢٠٠١، مؤسة البلاغ للطباعة والنشر والتوزيع، الطبعة الاوُلى، ٢٠٠١، ص٥٢٤.

(٢) کۆمەڵێك نوسەری کوردو بیانی: س.پ، ل٤١٥.

(٣) صلاح الخرسان: م.س، ص٥٢٤.

کەناوەڕۆکەکەی تێکۆشان بوو بۆ جێبەجێ کردنی کۆمەڵێك ئامانج، لەوانە: (هەڵوەشاندنەوەی سیاسەتی جیاکاری نەتەوەیی و نەهێشتنی پاشماوە سیاسی و دیمۆگرافیەکانی دانیشتوان، بۆ هەوڵدان بۆ گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی و مێژوویی ناوچەی کوردستانی عێراق، وەچارەسەر کردنی کێشەی کورد بەشێوەیەکی ڕاستو پێ دانی مافە نەتەوەیی و سیاسیە ڕەواکانیان لە ڕێگای جێ بەجێ کردن و گەشەپێدانی بەندەکانی ڕێك کەوتن نامەی، (١٩٧٠/٣/١١) وەکوخۆی، ئەوەی کەگەلی عێراق سەپاندی لەچوارچێوەی یەکێتی نەتەوەیی عێراقی دا، وەبۆ چەسپاندنی برایەتی عەرەب و کورد، وەمسۆگەر کردنی مافە رۆشنبیری و کارگێڕیەکانی کەمەنەتەوەکان وەك تورکمان و ئاشووری و....هتد(١).

بەم شێوەیە دەبینین پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان ڕۆڵیان هەبووە لەهاندانی کۆمەڵانی خەڵك بۆ ڕاپەڕین، لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و دروستکردنی شانەی چەکدارو هەڵگەڕانەوەی تێکڕای ڕۆڵەکانی کوردستان لە چەکدارەکانی فەوجەکان و گەڕانەوەیان بۆ کۆڕی خەبات و تێ کۆشانی کوردایەتی، ئەمەش لەڕێگەی دەرکردنی لێبوردنێك بەناوی (ئاشتبونەوەی گشتی) لەلایەن بەرەی کوردستانیەوە بۆ چەکدارەکانی فەوجەکان و مستەشارەکان و سەرجەم پیاوانی ڕژێم، کە ڕۆڵی گەورەی بینی بۆیەك ڕیزی گەلی کورد بۆ ڕاپەڕین(٢).

---

(١) صلاح الخرسان: م.س ، ص٥٢٥،٥٢٤.

(٢) چاوپێکەوتن لە گەڵ ( ڕەهبەر سەید برایم)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٤.

بۆیە دەتوانین بڵێین کە (بەرەی کوردستانی) ڕۆڵی سەرەکی بینی لەیەك ڕیزی پارتە کوردیەکانو ڕووبەڕوو بوونەوەیان بۆ ڕووداوو پێش هاتەکان، چونکە ئەو خۆڕاگرتنەی (بەرەی کوردستانی) ئەگەر قازانجی سیاسی ئەوەی تێدا نەبوو ڕژێم ئاوڕی مفاوەزاتیان لێ بداتەوە، ئەم قازانج نەکردنە نەك بەزیان نەگەڕایەوە بەڵکو بەڕاستی بوو بە گەورەترین قازانجو، دوای داگیرکردنی کوێت بەرەی کوردستانی بەهۆی ڕاپەڕینەوە کردی(١).

## ٢- گرنگی دان بە ڕاگەیاندن:

پێش ڕاپەڕینو لە کاتی چەخماخەی بەرپابوونی ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١زدا، ڕاگەیاندنی کوردی ڕۆڵی گرنگی بینی بۆ جۆشدانی جەماوەرو هۆشیار کردنەوەی خەڵك بۆ هەستان بەبەرپاکردنی ڕاپەڕین. بۆ ئەم مەبەستەش (ڕادیۆی) پارتو ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان ڕۆڵی گرنگیان بینیو لەسەرووی هەمووشیانەوە ڕادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان)و ڕادیۆی (دەنگی کورستانی عێراق) بوون.

لێرەدا هەوڵدەدەین ڕۆڵی هەریەکە لەم دوو ڕادیۆیە بخەینە ڕوو:-

أ- ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان(٢):

ڕادیۆی (ی.ن.ك) بوو ڕۆڵی سەرەکیو بەرچاوی بینی لە ڕاپەڕینی ١٩٩١، چونکە بەچەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕین کاری ئامادەباشی بۆ ئەم

---

(١) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٦٦.

(٢) بۆ مێژووی سەرەتای دامەزراندنی ئەم ڕادیۆیە، بڕوانە: ( د.خدر مەعسووم: دامەزراندنی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٥٢)، چاپی دەرەوە، هەینی ٢٢ی ئایاری ١٩٩٨، ل٥).

مەبەستە بۆ کرابوو، بەتایبەتی کاتێك لە ١٩٩١/٢/١٧دا (نەوشیروان مستەفا ئەمین) لە قاسمەڕەش ڕێنمایی دەرکرد بۆ نوسینگەی ناوەندی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك) بەوەستاندنی هەموو بلاوکراوەو چالاکیەکانی تر، وەپێك هێنانی کادیر بۆ (ڕادیۆی گەڕۆك*) لە سەر شەپۆلی (٤١م) کاربکاتو، بگوازرێتەوە نێوچەی زەڵێ لەناوخاکی عێراق، کەشان بەشانی ڕادیۆی جێگیری (یەکێتی) کە لەشاری سەقزی ئێران لە سەر شەپۆلی (٧٥م) بوو کاربکات، بۆیە دەبینین ڕادیۆ گەڕۆکەکە دەستی کرد بە بانگەوازەکانی بەهەردوو زمانی کوردیو عەربی پاش جێگیر بوونی لە (زەڵێ)، لەبەرنامەکانی دا بانگەوازی هاولاتیانی دەکرد بۆڕاپەڕین دژی ڕژێمی دەسەلاتدار، هەروەها ئەم بانگەوازانە سوپاو سوپای میللیو فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی (جاش)و دەزگاکانی ئاسایشی دەگرتەوە(١).

دەنگی گەلی کوردستان ڕۆڵی گرنگی بینی لەبەیەك گەیشتنەوەی هێزەکانی پێشمەرگەو ئاگادارکردنەوەیان لەیەکتری، چونکە ئەو سەردەم هێزی پێشمەرگە جیهازی بێتەلیمی کەم بوو، هەروەها ڕۆڵی باشی گێڕا بۆشانە چەکدارەکانی ناوشارو ئاگادار کردنەوەیان

---

* (ڕادیۆی گەڕۆك): ی.ن.ك دووڕادیۆی هەبوو، ڕادیۆیەکیان لە سەقز بو، ئەوی تریشیان گەڕۆك بوو لەزەڵێ کاری دەکرد، پێ ی دەگوترا (ڕادیۆی ڕاپەڕین)، چونکە بۆ ئەم مەبەستە دامەزرابوو پێش ڕاپەڕینو تەوجیهی شانە نهێنیەکانی ناوشاری دەکرد بەچ شێوەیەك کاربکەن، ئەوانەی لەم ڕادیۆیە کاریان دەکرد، بریتی بوون لە: عباس بدری، ئازاد چالاك، شوان کەریم کابان، م.محسنو م.عبدالرحمن، چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٨.

(١) صلاح الخرسان: م.س، ص٥٢٥.

لەڕاسپاردەکانی سەرکردایەتی، پاشان ڕۆڵی زۆر کاریگەری بینی لە جۆشدانی جەماوەر بۆڕاپەڕین(١)، چونکە کەناوچەیەك ئازاد دەکرا یەك سەرو ڕاستەوخۆ هەواڵەکەی دەگەیاندە جەماوەرو، بەمەش خەڵکی هاندەدا بۆ ڕاپەڕین لەناوچەیەکی تر، بۆیە دەبینین ئەم ڕادیۆیە ڕۆڵی بەرچاوی بینی لەگەیاندنی ڕاپەڕینی ناوچەیەك بەخەڵکی ناوچەیەکی دیکە(٢).

ب- ڕادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق:

دەنگی کوردستانی عێراق کە ڕادیۆی (پ.د.ك) بوو، لەساڵانی پێش ڕاپەڕین ڕۆڵی بەرچاوی بینی لەپیشاندانی زوڵم و ستەمەکانی ڕژێمی بەعس، کە بەرامبەر بەگەلی کورد ئەنجامی دەدا، ئەمەش بەشێوەی پێش کەش کردنی بەرنامەو خوێندنەوەی ووتارو خستنەڕووی تاوانەکانی ڕژێم دەرهەق بەگەلی کورد، لەڕێگای ئەم ڕادیۆیەوە ئەنجام دەدرا. هەروەها لەکاتی ڕاپەڕینیش بەرنامەی تایبەتی هەبوو بۆ ئەو ڕۆژە مێژووییەو هانی خەڵك و جەماوەری کوردستانی دەدا بۆ هەڵسان بەڕاپەڕین(٣).

---

(١) چاوپێکەوتن لە گەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا بەختیار)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٦.

(٣) گوێندەی ئێزگەی دەنگی کوردستان بارزان مەلا خالید، برایەتی (ڕۆژنامە)، هەینی ١٩٩٤/٣/١١، ژمارە (١٨٩٤)، ل٢.

بۆ یەکاتێك بارودۆخی ڕاپەڕین هاتەکایەوە، ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان سەرکەوتووترین ڕۆڵی بینی و پاشان ڕادیۆی کوردستانی عێراق شان بەشانی ئەو، کوردستانیان سەراپا خرۆشاند(١).

دەتوانین بڵێین کەڕادیۆی (دەنگی کوردستانی عێراق) لەڕۆژانی ڕاپەڕین، ڕۆڵێکی کەمتری بینی لە بەرامبەر ڕادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان)، چونکە چەند هۆکارێکی (دەرەکی و ناوەکی) وایانکرد کە ئەم ڕادیۆیە، زیاتر لەهەموو ڕادیۆکانی تری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەگشتی و ڕادیۆی پارتەکانی ناوبەرەی کوردستانی بەتایبەتی، ڕۆڵی سەرەکی ببینێت بۆ ڕاپەڕین. ئەوهۆکارە دەرەکی یانەی کە وایانکرد ئەم ڕادیۆیە، ڕۆڵی سەرەکی و گرنگ ببینێت لە ڕاپەڕین، ئەمانەن:

١-گەلی کورد تینوی ئەوە بوو کەگوێ لەم دەنگە بگرێ، چونکە دەنگی شۆڕشگێڕانەی کوردستان و پێشمەرگە بوو بەمانا ڕەسەنەکەی.

٢-نەبوونی باوەڕ بەڕادیۆی عێراق بەگشتی، چونکە ئەم ڕادیۆیە شکانەکانی سوپای عێراقی بەسەرکەوتوو بڵاودەکردەوەو ڕایدەگەیاند، گوایە عێراق سەرکەوتنی بەسەر دوژمنەکانی بەدەست هێناوە، کە بەداستانی (أم المعارك) ناوی دەبرد.

٣- پاش ڕووخان و شکستی ڕژێمی عێراق ئارەزووی جەماوەری کوردستان بۆ چاودێری کردنی ڕووداوو پێش هاتەکان زیادی کرد، لەهەمان کاتدا نەمانی پەخشی تەلەفزیۆن و پچڕانی ووزەی کارەباو نەبوونی ڕۆژنامە، یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە خەڵکی زیاتر گرنگی

---

(١) سەرکەوت: دور اذاعة صوت شعب كردستان فی الانتفاضة، سەرهەڵدان (گۆڤار)، ژمارە (٢)، ئایاری ١٩٩٣، ص٨٥.

بەم ڕادیۆیە بدەن، چونکە سەرجەم نێوچەکانی کوردستان و ناوچەکانی تری عێراق، پەخشی ئەم ڕادیۆیەی پێ دەگەیشت(١).

٤- زۆر بەئاسانی شەپۆلەکەی دەدۆزرایەوە، لەهەمان کاتدا بەهۆی لێدانی هاوپەیمانان لە عێراق مەڵبەندی تەشویشیان تێك چوو، بۆیە تەشویشی بەعس لەسەر ئەم ڕادیۆیە نەماو لەسەرجەم ناوچەانی کوردستان و دەوروبەری وەردەگیرا(٢).

٥- یەکێکی تر لەو هۆکارە دەرەکی یانەی کەوایکرد ئەم ڕادیۆیە ڕۆڵی سەرەکی ببینێت، ئەوە بو کەلەو کاتەدا ڕادیۆکانی تری پارتەکانی ناوبەرەی کوردستانی لاوازبوون، چونکە ڕادیۆی (دەنگی کوردستانی عێراق) کەڕادیۆی (پ.د.ك) بوو، بەشێوەزاری بادینی بەرنامەکانی پێش کەش دەکرد، کە خەڵکانێکی زۆر لێ ی تێ نەدەگەیشتن، هەروەها ڕادیۆی (حزبی سۆسیالیست) ئەوکات لای (p.k.k) بوو، نەتواندرا سوودی لێ وەربگیرێت، بۆیە ئەمانە وایان کرد زیاتر گرنگی بەڕادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان) بدرێت(٣).

لە گرنگترین ئەوهۆکارە ناوخۆیی یانەی وایانکرد کەئەم ڕادیۆیە ڕۆڵی سەرەکی ببینێت لە ڕاپەڕین، ئەمانە بوون:-

١- ڕاست گۆیی ڕادیۆکە لە گەیاندنی هەواڵ و ڕاستی ڕووداوەکان بەجەماوەر.

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمان ٢٠٠٣/١/١٨.

(٣) محمد حاجی محمود: ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك، بەرگی سێیەم (١٩٨٧-١٩٩١)، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٦٥.

٢-پەخش کردنی سروده حەماسیەکان، کە ئەبووە هۆی بەرزکردنەوەی گیانی شۆڕشگێڕیو وورەی جەماوەر.

٣-ڕادیۆکە بانگەوازەکانی ئاراستەی گەلی عێراق بەگشتیو گەلی کوردستان بەتایبەتی دەکرد، بانگەوازەکان تایبەت نەبوون بەکورد، بەڵکو سەرجەم کەمەنەتەوەکانی کوردستانی دەگرتەوە بە (عەرەبو تورکمانو ئاشووری) بێ جیاوازی.

٤-ئەم ڕادیۆیە بە هەرسێ زمانی (عەرەبی، کوردی، تورکی)، بەیانو بانگەوازەکانی بەشێوەیەکی حەماسی پەخش دەکرد، کەکاریگەری زۆر بوو لەسەر گوێ گران(١).

٥-لەوکاتانەی کە ڕادیۆ ئیشی دەکرد، لە زۆر جێگا خەڵك دەیان بەست لە میکرۆفۆنی مزگەوتەکان، بەمەش ناوچەکە سەراپا گوێ بیستی هەواڵەکانی ڕاپەڕین دەبوون.

٦-گەڕۆکی ئەم ڕادیۆیە، کەسەرەتا لە (زەڵی) بوو، دواتر هاتە (ڕانیە)و پاشان (سلێمانی)، ئەمەش یەکێك بوو لەوهۆکارانەی کەئەم ڕادیۆیەی سەرخست لە ڕاپەڕیندا(٢).

لەسەروی هەموو ئەمانەوە، پاش ڕزگارکردنی ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەتی ناوچەکانی دەوروبەرو نزیکی هەولێر، وەك (کۆیە، شەقلاوەو هاوینەهەواری سلاح الدینو....هتد )، پاشان نزیك بونەوەی چەخماخەی ڕاپەڕین لە هەولێر، ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە جۆشدانی خەڵكو پێشمەرگە بۆ

(١) سەرکەوت: س.پ، ل٨٦.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٨.

ڕزگارکردنی هەولێر، لە ڕێگەی بانگەوازو ووتارە حەماسیەکانی بەوەی کە هەولێر (پایتەختی هەرێمی کوردستانە(١).

لە ئەنجامی ئەو زوڵمو زۆرەی ڕژێم بەرامبەر بەگەلی کورد، پاشان بەهاتنە پێشەوەی هەلومەرجەکان لەبەرژەوەندی جەماوەر، ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ی لێ کەوتەوە. دوای گەورەترین کارەسات، بزووتنەوەی کورد چۆکی بەتەواوی دانەداو بەشێوەی پارتیزانی درێژەی بەخەبات دا هەتا توانی درێژەی خەبات بگەێنێتە ڕۆژگاری داگیر کردنی کوێت، ئەوساتە بوژانەوە بۆ زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕین ساز بوو(٢).

---

(١) عباس بدري: يوميات الانتفاضة، يوميات الانتفاضة، طبعت في مطبعة جامعة صلاح الدين- اربيل، بدون سنة الطبع، ص٢٨.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا بەختیار)، سلێمانی، ٢٠٠٢/١١/٢٦.

## باسی دووەم
## بارودۆخی عێراقو نێوچەکەو ڕۆڵی لە هەڵگیرساندنی ڕاپەڕین:

**یەکەم: داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق:**

پاش ئەوەی حکومەتی عێراق بەبیانووی چەند هۆکارێکی مێژوویی و جوگرافی و مرۆیی و ...تاد، لە بەرواری (۱۹۹۰/۸/۲) وڵاتی کوێتی داگیرکرد،(۱) دەسپێکی ڕەوشێکی نوێ لەلایەن سوپای عێراقەوە لەو بەروارە بەدواوە دەست پێدەکات.

هەرچەندە لەگەڵ ئەم داگیرکردنە سوپای عێراق کەوتە حاڵەتی ئامادە باشی و بەم شێوەیە حاڵەتی نائاسایی ڕاگەیاندو سەرجەم گەشتە ئاسمانیەکانی بۆناوەو دەرەوەی وڵات یاساغ کراو وەستێنرا، ئەم دۆخە کە لەڕوکەشدا نواندنی هێزو دەسەڵات بوو، بەڵام لەناوەڕۆکدا پەلەقاژێی مەرگ بوو، چونکە دەست بەجێ نارەزایی فراوان لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی و ئاستی وڵاتانی عەرەب بەرامبەر

---

(۱) بۆ زیاتر لەبارەی هۆکارەکانی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە، بڕوانە: (مراقب کردی: اجتیاح وضم الکویت، کانون الاول، ۱۹۹۰، ص۱-۸).

بەدەسەڵاتی دیکتاتۆری ڕژێمی بەغدا دەستی پێکردوو داوای کشانەوەی دەست بەجێ و بێ قەیدومەرجیان لێی کرد(١).

پاش ئەم ڕووداوە، هەڵوێستی وولاتانی دونیا بەرامبەر بە عێراق گۆڕا، بۆنمونە وولاتانی عەرەبی دژە هەڵوێستیان نواند، بەشێوەیەك هەشت ڕۆژ دوای داگیرکردنی کوێت، بەشێوەیەکی نائاسایی، لە ڕۆژی هەینی بەرواری (١٠/٨/١٩٩٠) کۆنگرەیەکیان بەست لەقاهیرە، تیایدا بەزۆرینەی دەنگی (١٢)وولات و (٣) دەنگی دژوو- کە بریتی بوون لە (عێراق و لیبیا و بزوتنەوەی ئازادی خوازی فەلەستین)- و(٥) وولاتیش هەردەنگیان نەدا - کە بریتی بوون لە (ئەردەن، جەزائیر، سودان، موریتانیا، یەمەن)- و وولاتی (تونس)یش لەبنەڕەتدا ئامادەی کۆنگرەکە نەبوو، بە توندی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە مەحکوم کراو، کۆنگرە خوازیاری کشانەوەی هێزەکانی بەغدا بوو لەکوێت(٢).

لەهەمان کاتدا ئەو دەوڵەتانەی بەروو کەشیش وایان نیشاندەدا گوایە لەگەڵ عێراقدان، ئامۆژگاری صدام یان کرد لەکوێت بکشێتەوە، بەڵام نەك هەر بەقسەی نەکردن بەڵکو دەستی بەمانۆڕی سەربازی کردوو بەیانێکی ئاگرینیشی دەرکرد، تیایدا بانگەوازی گەلانی عەرەبی دەکرد بۆئەوەی پشتگیری ڕژێمی عێراق بکەن، لەهەمان کاتدا هەڕەشەی لەئیسرائیل دەکردوو مەسەلەی کوێتی بەمەسەلەی فەلەستین

(١) ف.ڕەش: خوێندنەوەی سیاسی لەنێو گرەوی ئەگەرەکاندا، هەڵوێستی نیشتیمانی (گوڤار)، ژمارە (٥)، ل٤٦.

(٢) مراقب کردی: م.س، ص١٥.

بەستەوە، وای لەخەڵکی گەیاند تا ئیسرائیل نەکشێتەوە لە فەلەستین، ئەویش لە کوێت ناکشێتەوە(١). بەجۆرێك جوڵاندنی هەستی نەتەوەیی، سۆزی دینی بەکارهێنا، بۆئەوەی پشتگیری وولاتانی عەرەب بەدەست بێنێت، بەڵام بە نەکشانەوەی پشتگیری عەرەبی لەدەستدا(٢).

سەبارەت بەهەڵوێستی وولاتانی ئەوروپی، بەگشتی پێناخۆشی و دژایەتیەکی زۆریان پێوە دیاربوو، چونکە بەداگیرکردنی کوێت بەرژەوەندیان کەوتە مەترسیەوە، ئەویش لەدوولاوە:

١-دروست بوونی شەڕو ئاژاوە لەو نێوچە ستراتیژییە، کە خۆیان درووستی نەکەن ئەوا لەبەرژەوەندی هیچ ڕۆژئاواییەکدا نیە، چونکە ئەو وولاتانە بەهۆی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکانیانەوە پەیوەندیەکی پتەویان لەگەڵ عێراق و وولاتانی میرنشینی عەرەبی هەبوو، بۆیە هەر شەڕێك هێمنایەتی نێوچەکە بشێوێنێ، بەرژەوەندی ئابووری ئەوانیش دەکەوێتە مەترسیەوە.

٢-هاتنەوەی ئەمەریکا بۆ نێوچەکە بەبەرگێکی دیکەو کۆتایی پێ هێنان بەنفوزی هەموو لایەك لەم نێوچەیەو قۆرخکردنی بەرهەم هێنان و گواستنەوەو فرۆشتنی نەوتی نێوچەکە، هەرتەنها بۆ مۆنۆپۆڵەکانی خۆیان دەبێت و بەس. بۆیە پاش ئەوەی نەیانتوانی کار لەهەڵوێستی چەوتی صدام بکەن، وولاتانی ئەوروپا سیاسەتێکی دژ بەعێراقیان

---

(١) ڕێباز: س.پ، ل٣٨،٣٩; مراقب کردی: م.س، ص١٥.

(٢) مراقب کردی: م.س، ص١٥.

گرتەبەرو تێکڕا بەشداریان کرد لەیارمەتی دانی ئەمەریکاو دەزگاکانی ڕاگەیاندنیشیان لە دژیدا خستەکار.(١)

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش، (ئەنجومونی ئاسایش)یش کەوتە هەوڵدان بۆچارە سەرکردنی دۆخەکە، ئەوەبوو چەند بڕیارێکی یەك لەدوای یەکی دەرکرد، هەر لەگەمارۆدانی ئابوورییەوە تا بەکارهێنانی هێز بۆدەرکردنی لەکوێت، تا دواجار لە بەرواری (١٩٩٠/١٢/١٥)ەوە مۆڵەتدرا بەعێراق کە لە (١٩٩١/١/١٥) لەکوێت دەربچێت.(٢)

پێش لێدانی عێراق لەلایەن هاوپەیمانانەوە، بارودۆخی عێراق زۆرخراپ ببوو، چونکە لەکاتی دەست پێکردنی کێشەی کەنداو بارودۆخی نێوخۆیی گۆڕانکارییەکی زۆر خراپی بەسەر داهات، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دامەزراوو دەزگەکانی دەوڵەت بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوون، سەربازەکانی لەکاتی وەرگرتنی مۆڵەت ڕایان دەکرد لەبەرەی کوێت و بەمەش هەڵهاتن ڕۆژ بەڕۆژ لەزیاد بوون دابوو. ئەم دۆخەش زۆر کاری لەعێراق کرد، پێش شەڕو دوای شەڕیش. بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایش و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبوو لە (١٩٩١/١/١٦) عێراق بەتەواوی بکشێتەوە لەکوێت، بەڵام عێراق لەکاتی دیاری کراو بڕیارەکەی جێبەجێ نەکردوو کوێتی چۆڵ نەکرد، بۆیە ئەمەش ترسناك بوو بۆ جیهان و نێوچەکە، بەتایبەتی بۆ گەلانی عێراق لە هەموان زیاتر پڕ مەترسیتربوو، کە شەڕێکی وێرانکەر هەڕەشەیان لێ دەکات، بەڵام وێڕای مەترسیەکان (کوردو کوەیتی یەکان) پێ دەچوو

---

(١) ڕێباز: س.پ، ل٤٢-٤٤.

(٢) ڕێباز: س.پ، ل٤٥.

ئەم شەڕەیان پێ خۆش بووبێ، چونکە هەردوولایان هیچیان نەمابوو تا لەدەستی بدەن(١).

هەروەها کورد بەهیوایەکەوە سەیری دەکرد کە ببێتە تێکشکان و لەنێوچوونی یەکجارەکی حکومەتی عێراقی و هاتنە پێشی دەرفەتێکی لەباری مێژوویی گەورە، بۆ ڕزگاربوون لە چنگی و بەدیهێنانی ئازادی و دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکان. بۆیە دەبینین پاش ئەوەی کە عێراق هەر سوور بوو لەسەر دەرنەچوونی لە کوێت، شەوی ١٦-١٧ی کانونی دووەمی ١٩٩١ گێژەڵوکەی بیابانەستی‌پێکرد(٢)، هێزی هاوپەیمانان کاتژمێر (٢)ی شەو بەهێرشی ئاسمانی دەستی پێکرد بۆسەر یەکە سەربازی و دامەزراوە سەربازی و پیشەسازی و نەوتیەکان و هێڵەکانی ڕاگەیاندن و وێستگەی کارەباو شوێنە گرنگەکانی تری عێراق کەنزیکەی یەك مانگی خایاند، کە بەتەواوی ووزەو تواناو جوڵەی ڕژێمی بەغدای دووچاری ئیفلیجی کرد، دوابەدوای ئەوەش هێرشی زەمینی دەستی پێکرد، بەبێ‌ئەوەی سوپای عێراق توانای بەرگری و بەرپەرچدانەوەیەکی ئەوتۆی هەبێ، ئەوە بوو لەماوەیەکی کەمدا شکستێکی بێ وێنەی بەخۆیەوە بینی، هەرزووش لەووڵاتی کوێت پاشەکشەی کرد و تەسلیم بەئیرادەی هێزە هاوپەیمانەکان بوو سەرجەم

---

(١) محمد حاجی محمود: س.پ، ل٢٥٩،٢٥٨.

(٢) سەفین مەلا قەرە: (ی.ن.ك) داینەمۆو ڕێکخەرو دەستپێشخەری ڕاپەڕین بوو، کوردستانی نوێ(ڕۆژنامە)، ساڵی دەهەم ، ژمارە (٢٣٩٢)، پێنج شەممە ٢٠٠١/٣/١،ل٢.

مەرجە سەپێنراوەکانی هێزە هاوپەیمانەکانی بێ قەیدو مەرج پەسەند کردو پاشان لە (١٩٩١/٢/٢٨)دا ئاگر بەست ڕاگەیەنرا(١).

بۆیە پاش ئەوەی هاوپەیمانەکان لەبەر بەرژەوەندی خۆیان، عێراقیان لەکوێت دەرکردوو لەشەڕ شکاندیان، پاشان دەبینین هۆشیاری خەڵك و ڕابەرانی بۆ ڕاپەڕین دەرکەوت، بەتایبەتی کاتێك خاڵی لاوازی ڕژێمیان قۆستەوەو سازدانی ڕاپەڕینیان کردە بەرنامەی خۆیان. بۆیە دەتوانین بڵێین داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق و پاشان تێك شکان و لاوازکردنی لەلایەن هێزی هاوپەیمانان، یەکێك بووە لە هۆکارە هەرە گرنگەکان بۆ هەڵایسانی ڕاپەڕین لەباشووری کوردستان و ناوەڕاست و خوارووی عێراق.

**دووەم: کۆتای هاتنی جەنگی سارد:**

جەنگی سارد، لە ڕواڵەتدا ساردو لە ناوەڕۆکدا گەرم بوو، کە لەجەنگی دووەمی جیهانی بەدواوە تاپێش ڕاپەڕین (١٩٤٦- ١٩٩٠) درێژەی کێشا(٢).

لەم جەنگەدا سۆڤیەت دەیویست سیستەمی سۆسیالیستی دامەزرێنێ لەوشوێنانەی کە دەستی تێدا هەبوو، ئەمەریکاش بەگژ ئەوسیاسەتە دادەهاتەوە، لەهەمان کاتدا لەزۆربەی وڵاتانی دونیا شەڕو پێکدادان هەبوو، گەلانی ئەو وڵاتانەش ببوونە قوربانی

---

(١) ف.ڕەش: س.پ، ل٤٦.

(٢) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٥٦.

سیاسەتی ئەو دوو زلهێزەو میللەتی کوردیش بێبەش نەبوو لەزیانی ئەم جەنگە(١).

لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی سیاسیی کورد، بە درێژایی نیو سەدەی جەنگی سارد، چاوەڕێ بوو شورەوی ببێتە پشتیوانی شۆڕشی چەکداری کوردو، بەو ئومێدە لە دوای کۆماری مهابادەوە شۆڕشی ئەیلول سەری نایەوە، دوای ئەمەش سەرلەنوێ خەباتی چەکداری هەتا ئەنفالەکان (١٩٧٦-١٩٨٨) بەنائومێدی لە پشتیوانی شورەوی دوچاری نوشستێکی ترسناك هاتو تەنانەت شورەوی بەئەندازەی فەرەنساش زاتی دژایەتی چەکی کیمیایی بەعسی نەکرد(٢).

عێراق سوودی زۆری بینی لە جەنگی ساردوو سیاسەتەکانی یەکێتی سۆڤیەت، چونکە پێش کۆتایی هاتنی ئەم جەنگە، عێراق بەشێکی زۆری چەك و کەل و پەلی سەربازی لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران دەکڕی(٣)، کە عێراقی لەڕووی سەربازیەوە زۆر بەهێز کردبوو، تاوای لێهات نەشەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران، نەشەڕی بەردەوامی بزووتنەوەی کورد لەگەڵی، نەتوانن ئەم ڕژێمە بڕوخێنن، چونکە توانیبوی لەپەنای سیاسەتی بەرژەوند بازی جەنگی سارددا، لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە پێویستیەکانی دابین بکات(٤).

---

(١) ڕێباز: س.پ، ل١٤،١٣.

(٢) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٥٧.

(٣) مەحمود مەلا ڕەزا: بایەخی ستراتیژی کەنداوی فارس، سیاسەتی دەولی (گۆڤار)،ژمارە (٥)، نیسانی ١٩٩٣، ل٨٥.

(٤) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٥٧.

بۆیــە دەبیــنین دوای ئــەوەی ئــاڵوگۆڕە جیهانیــەکان ڕوویــدا، کەســەرەنجامەکەی بەشکــستی خۆرھــەلات کۆتــایی پێهــات، لەبــەر ژدوەنـدی ڕژێمـی عێـراق نـەبوو(١)، چـونکە بەدۆڕانـدنی سـۆڤیەت لـەم جەنگەدا، عێراق دەروازەی کڕینی کەل‌و پەلە یەدەگە سەربازییەکانی لە دەستدا(٢).

بۆیــە بــە هــۆی نــەمانی جــەنگی ســاردو ئــەو بارودۆخــە تازەیــەی هاتەکایەوە، ڕاستەوخۆ لەقازانجی بزوتنەوەی شۆڕشگێری گەلی کوردو گــەلی عێــراق‌و ناوچــەکە دابــوو، چــونکە عێــراق لــەڕووی ئــابووری‌و سەربازی‌یەوە بەرەو لاوازی‌و داڕمان دەچوو، لەهەمان کاتدا بارودۆخی بزووتنەوەی کورد ڕوولەباشی بوو بە هۆی گۆڕان لە ناوچەکەدا، چونکە ڕووخــانی بلــۆکی ڕۆژهــەلات‌و پاشــان داگیرکردنــی کوێــت لەلایــەن عێراقــەوە، وەك دوو فاکتــەری دەرەکــی ڕۆلــی پۆزەتیڤیــان بینــی لەهەســتانەوەی شۆڕشــی خــەلکی کوردســتان، کەســەرەنجام ڕاپەڕینــە جەماوەرییەکەی ئازاری ١٩٩١ز لێکەوتەوە(٣).

**سێیەم: هاندان‌و پشتگیری وولاتانی دونیا بۆ هەلایسانی ڕاپەڕین:**

یەکێك لـە هۆکارە سـەرەکیەکانی دیکە، کە سەرکردەکانی کوردی خسـتە جولـەو خـەلکی هانـدا بـۆ ڕاپـەڕین لەڕاسـتیدا ئـەو بانگـەوازەی سـەرۆك کۆمـاری ئـەمریکا (جـورج بـوش) بـوو لـە ڕۆژی ١٥شـوباتی ١٩٩١دا، کـە داوای لەخـەلکی عێـراق کـرد، لـە دژی (صـدام حـسێن)ی

---

(١) ف. ڕەش: س.پ، ل٤٦.

(٢) ڕێباز: س.پ، ل٢٠.

(٣) ف.ڕەش: س.پ، ل٤٥.

دیکتـــاتۆر ڕاپـــەڕین و بیروخێـــنن(١)، هـــەروەها ســـەرۆکی ئەمـــەریکا لـەووتارێکی دا باسـی تاوانەکانی ڕژێمی عێراقی کرد بەرامبـەر بەگەلی کـورد و گـووتی: "ناتوانـدرێت وێنـەی ئەوژنـە کـوردەی منداڵەکـەی لـەباوەش گرتبـوو بۆبـەرگریکردن لـێ ی، لـە کاریگـەری بـۆمبی کیمیـا لەبیربکرێت...." بۆیەداوای لە گەلی کورد کرد کە تۆڵەبکاتەوە(٢).

لەهـەمان کاتـدا ئاژانسەکانی دەنگ و باسـی جیهانی هەڕەشـەکانی سـەرۆکی ئەمـەریکایان دژی صـدام حـسێن بڵاودەکـردەوە، کـە ئەگـەر بێت و ملـی بکـەن بـە پـەتا نابێـت هـیچ قسەبکات. لـە ڕاسـتیدا ئەمانـە هەمووی پشتیوانێکی مەعنـەوی زۆر گـەورە بوون، چونکە خـەڵك وایـان دەزانی ئەمەریکا پشتیوانیان لێ دەکات لـەکاتی ڕاپـەڕین دا، ئەگـەر هـات وعێراق پەلاماری خەڵکی ڕاپەڕیو بداتەوە(٣).

لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبیـنین وولاتـانی دراوسـێی کوردسـتان ڕۆڵـی بەرچـاویان بینـی لەهانـدان و خرۆشـاندنی سـەرکردایەتی کـورد و ئۆپۆزسـیۆنی عێـراق بـۆ ڕاپـەڕین، چـونکە لەوسـەردەمەدا گروپـەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، گۆڕەپانی (سووریا)یان کردبووە بارەگـای خۆیـان بۆگفتوگۆکردن لـەپێناو دروسـتکردنی بەرەیـەکی عێراقی بـەرین بـۆڕوو بەڕوو بوونەوەی دیکتاتۆریەت لەبەغدا(٤).

لەلایـەکی تـرەوە (ئێـران)یـش ڕۆڵـی کـەمی نـەبینی لەهانـدان و پـشتیوانی کردنـی ئۆپۆزسـیۆنە عێراقیـەکان، بـۆ بـەرپاکردنی ڕاپـەڕین

---

(١) کریس کۆچێرا: س.پ، ل١٠٤.

(٢) جواد ملا: م.س،ص٩٥.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕسول علی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

(٤) صلاح الخرسان: م.س، ص٥٢٣.

دژی حکومەتی عێراق، چونکە زۆرێك لەسەرکردەی هێزەکاریگەرەکان لەئۆپۆزسیۆنی عێراقی‌دا، کۆبوونەوەیەکیان بەست لەشاری (کرماشان)ی ئێران ساڵی (١٩٩٠)بۆ لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی ئایندەی عێراق(١).

هەروەها وولاتانی تری ناوچەکە رۆڵی گرنگیان بینی لەنزیك کردنەوەی گروپەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، بۆیە دەبینین کۆمیتەیەکی رێکخستن بەپشتگیری (سعودیە- سوریا- ئێران)پێك هێنرا، کەلەشەش ئەندام پێك هاتبوو بەبەشداری دوو نوێنەری کورد تیایدا کەبریتی بوون لە (مام جەلال و سامی عبدالرحمن)، پاشان سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لەدیمەشق کۆبوونەوەو دواجار لە (١٩٩٠/١/٢٧)لە بەیروتی پایتەختی لوبنان بەبەشداری پتر لە(٢٠) پارت و بزووتنەوەی ئۆپۆزسیۆن بەیاننامەیەکیان راگەیاند، کەتیایدا ئۆپۆزسیۆن دژ بەداگیرکردنی کوێت وەستاو، پەیمانی خەباتی دا بۆڕوخاندنی رژێمی بەغداو دابین کردنی مافی کورد(٢).

بۆیە هەموو ئەمانەی کە باسکران دەتوانین بڵێن، هاندانی دەرەکی و پشتگیری دەوڵەتان بوو بۆ راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١.

**چوارەم: هەڵایسانی راپەڕین لەخوارو ناوەڕاستی عێراق:**

دوای ئەوەی هێزی هاوپەیمانان گورزێکی کوشندەیان لە صدام وەشاندو لەکوێت دەریانکرد، پاشان گەمارۆی ئابوریان بەسەر

---

(١) صلاح الخرسان: م.س، ص٥٢٩.

(٢) کۆمەڵێك نووسەری کوردو بیانی: س.پ، ل٤١٦.

داسەپاندو بەمەش بارودۆخی وولآت ئالۆز بوو، لـەم دۆخـەدا زەمینـەی ڕاپـەڕین بۆعەرەبـە شـیعەکان لەباشـووری عێـراق هاتـە کایـەوەو چـەند شارێکی گرنگیان ئازاد کرد(١).

ئـەم ڕاپەڕینـە بەشـێوەیەکی خۆڕسـك بـوو وەك دژە کردارێـك گـەلی عێـراق پـێ ی هەڵسا پـاش تێـك شـکانی صـدامو بـەردەوامی لەبەهەڵـە دابردنـی ڕای گـشتی، وەنیـشاندانی تێـك شـکانەکەی بەسـەرکەوتن بـۆ عێراق و نواندنی زوڵم و زۆری بێ ویژدانانەی بەرامبەر بەگەلەکەی(٢).

پـاش ئـەوەی ئـەم ڕاپەڕینـە بـەرەو سـەرکەوتن چـوو ئەمـەریکا هەڵوەسـتەی لەبەرامبـەرداکرد، چـونکە ئەمـە لەچوارچـێوەی پلانەکـەی ئەمەریکادانـەبوو، کەئـەی دەویـست شـیعە لەعێراقـدا حـوکم بگرێتـە دەست(٣).

بۆیە ڕێگە خۆشکرا بۆ عێراق بە بەکارهێنانی هێز،کە دووفەیلەقی لەمودەڕەعەو دەبابە گەڕاندەوە بۆسەرکوتکردنی ئەم ڕاپەڕینـە لـەڕۆژانی "١-١٩٩١/٣/٢"، بەدەش دەبیـنین زۆری نـەبرد ئـەم ڕاپەڕینـە کـپ کرایـەوە(٤)، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕاپـەڕینی عەرەبـە شـیعەکان لـە باشووری عێراق، بە یـەکێك لـە هۆکارە کاریگـەرو گرنگـەکانی ڕاپـەڕین دادەنرێت لە باشووری کوردستاندا. هەرچەندە هەندێك کـەس بـەدووری

(١) حەسەن کوێستانی: لەیادی دووەم ساڵڕۆژی سەرکەوتنی ڕاپەڕین، سەرهەڵدان (گۆڤار)، ژمارە (٢)، ئاداری ١٩٩٢، ل١٨.

(٢) ماجد الماجد: انتفاضة الشعب العراقي، دار الوفاق للصحافة الطباعة و النشر، بيروت، الطبعة الأولى- ١٩٩١، ص٢١.

(٣) جواد ملا: م.س، ص٩٦.

(٤) محمد حاجي محمود: س.پ، ل٢٧١.



دەبیــــنن هــیچ جــۆرە ئاگــایی و پەیوەندیــەك هــەبووبێت لەئاســتی سەرکردایەتی هەردوو ڕاپەڕینەکە(١).

---

(١) بۆ زیاتر بڕوانە: پاشکۆی دەقی چاوپێکەوتنەکانی ئەم کتێبە.

# بەشی دووەم

## بارودۆخی شاری هەولێر بەر لە ڕاپەڕین

**باسی یەکەم**

ڕاپەڕینی ئۆردوگای خەبات ( ١٩٩١/٣/٤ ).

**باسی دووەم**

خۆپیشاندانەکەی حیزبی شیوعی عێراق ( ١٩٩١/٣/٦ ).

**باسی سێیەم**

هەڵوێستی حیزبی بەعس بەرامبەر دانیشتوانی هەولێر.

## بەشی دووەم
## بارودۆخی شاری هەولێر بەرلە ڕاپەڕین

چەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕینی شارو شارۆچكەكانی كوردستان، بارودۆخی هەموو ناوچەكانی كوردستان بەشێوەیەكی گشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی ڕوو لە ئاڵۆزیو پشێوی دابوو، خەڵكەكەی لەبارێكی دەروونی خراپدا ژیانیان بەسەر دەبرد، تێكڕا لە چاوەڕوانی دۆخێكی سیاسیی دژواردابوون.

هەروەها پێش بەرپابوونی چەخماخەی ڕاپەڕین لە شاری هەولێر چەند ڕووداوێك هاتنە پێشەوە، هەریەكەو بەگوێرەی خۆی كاریگەری (پۆزەتیف-نێگەتیف)ی بەسەر دۆخی شارو خەڵكەكەوە هەبوو، كە گرنگترین ڕووداوەكانی ئەم شارە بەر لە ڕاپەڕین بریتی بوون لە:-

## باسی یەکەم
## ڕاپەڕینی ئۆردووگای خەبات لە ١٩٩١/٣/٤دا

ئەم ئۆردووگایە پێشتر بۆ دانیشتوانی گوندی دیبەگەو بەشێك لەدانیشتوانەکانی دیکەی دەشتی هەولێرو دەوروبەری مەخمور کرابۆوە، پاشان لە ساڵی ١٩٨٩ دانیشتوانی ناحیەی سەنگەسەرو بەشێك لە دانیشتوای شاری قەڵادزێی بۆ گوێزرابۆوە، ئەم ئۆردووگایە لەنزیك ناحیەی (خەبات) دروست کرابوو، لەڕووی جوگرافیەوە دەکەوتە سەر ڕێگای گشتی (هەولێر-موسڵ)و بەهۆی هەڵکەوتەیی جوگرافیای ناوچەکەوە، بەئاسانی لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە دەتوانرا کۆنترۆڵ بکرێت، بەڵام بێ لەبەرچاوگرتنی ئەم دۆخە، بەهاتنە پێشی نارەحەتی زیاتر بۆ هاوڵاتیانی ئۆردوگاکە لەلایەن هێزەکانی پۆلیسی عێراق، بارودۆخەکە گرژتربوو، بەجۆرێك شێوە ڕاپەڕینو هەڵچوونێکی (عەفەویانە)ی لێکەوتەوە، بۆکاتو سەردەمی خۆی، گرنگی تایبەتی هەبوو، بەتایبەتی لەسەر لایەنی وورەو هەستو دەروونی جەماوەری ئۆردوگاکەو لەهەمان کاتیشدا تاڕادەیەك دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو لەسەر نێوچەکانی دەوروبەری، بەتایبەتی شاری هەولێر.

ئـەم ڕووداوە مێژووییـە، بـوە بـەجێگای مـشتو مـڕی دانیـشتوانی نێوچـە ڕاپـەڕیوەکانی دیکـەی کوردسـتان، بەتایبـەت دانیـشتوانی شارۆچکەی ڕانیەو دەوروبەری، لەمەڕ تۆماری یەکەم دەسپێکی ڕۆژی ڕاپـەڕین، وەك شـانازییەکی گـەورە بـەنێوی شـارو شارۆچـکەکانی خۆیانـەوە، بـەڵام بـە بۆچـوونی ئێمـە دەکرێـت بڵـێین هەرچـەندە لـە باشـووری کوردسـتان بـەرواری (١٩٩١/٣/٥) بەیەکـەم ڕۆژی ڕاپـەڕین تۆمـارکراوە، بـەو مانایـەی لـەم ڕۆژەدا بـوو دانیـشتوانی ڕانیـەو دەوروبەری ڕاپەڕینو شارەکەیان ئازاد کرد، بەمەش بوون بە دەروازەی ڕاپـەڕین، بـەڵام دەکرێـت بـشڵێین بـەرواری (١٩٩١/٣/٤) لەمـەڕ ڕووداوەکەی ئۆردوگای خەبات ڕۆژی زەنگی ڕاپەڕین بوو، کە جەماوەر ڕاپـەڕینو پـەلاماری دامودەزگـا دزێوەکـانی ڕژێمـی بەعـسیان تێـدا دایەوە[1].

شێوازی بەرپابوونی تێك هەڵچونەکە، بەجۆرێك بووە، کە نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٤ چەند پۆلیسو چەکدارێکی دەستەی تایبەت (مفرزە خاصـە) لەگـەڕەکی سەنگەسـەریەکان داوای ناسنامە لەچـەند کەسێك دەکەنو یەکێکیان ناسنامەی پێ نابێتو ڕادەکات، دواتر چەکدارەکانی بـەعس دوای دەکـەونو بەمـەش دانیـشتوانی نـاو ئۆردووگاکـە دێنـە وەڵامو بەرپەرچـی چـەکدارەکانی ڕژێـم دەدەنـەوەو سـەرەنجام تەقـە دەست پێ دەکاتو شێوە ڕاپەڕینێکی عەفەویانە لە خۆدەگرێت[2]، کە دەبێتـە هـۆی برینـدارکردنی پۆلیسێك بەناوی (قـەیس)و کوژرانی دوو

---

(١) ئیبراهیم خـەبات: ڕاپـەڕینی ئۆردووگـای خـەبات، ڕێگـای کوردسـتان (ڕۆژنامە)، ژمارە (٤٤٣)، ڕۆژی ٣ی ئازاری ٢٠٠١، ل٢.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (م.خدر ئیبراهیم خدر)، قەڵادزێ، ٢٠٠٣/٢/٤، دانیشتووی ئۆردوگای خەبات بۆ ئەوکات.

چەکداری هەرکیو شەهیدبوونی دوو هاوولاتی کوردی دانیشتووی ئۆردوگاکە بەناوەکانی (بەختیار عومەر هورێوەیی و مەحەمەد فاروق گەلاڵی)[1]، بەلام هەرزوو ئەم راپەڕینە کۆنترۆڵ کراو کپ کرایەوە، چونکە نزیك بوو لە چەقی قورسایی و توانایی حکومەتی عێراق لە شاری کەرکوك و موسڵ و هەولێر[2].

مەلا عەبدوڵلای قەلادزەیی (ئەنجومەن)، دانیشتوی ئۆردوگاکەو بەشدار لە رووداوەکە، بەم جۆرە بۆمان باس دەکاتو دەڵێت: " وەك دەزانین ئەو کات رژێمی بەعس لەشەڕێکی مان و نەماندابوو لەبەرەکانی باشوور لەگەڵ هاوپەیمانانندا، رێژەی فیرار (راکردن لەخزمەتی سەربازی) لەناو کورددا زۆربوو، رۆژانە دەورییەکانی پۆلیسی رژێم بەدوای فیرارەکاندا دەگەڕان. ئەو رۆژە دەورییەکی پۆلیس دەچێتە ناو گەڕەکی سەنگەسەرییەکان لەو دەیەویانەوێت چەند گەنجێك بگرن، ئیتر دەبێتە کێشمەکێشم و شەڕ لەنێوانیان و پۆلیسەکان دەکەونە بەر هێرشی گەنجەکان، ئیتر ئەو شەڕ و هەرایە کۆلانە و کۆلان پەرەدەستێنێت و دەبێتە راپەڕین، لەدەوری کاتژمێر ١١ی سەرلەبەیانی ئەو کێشەیە دروست دەبێت و هەرسێ گەڕەکەکانی قەلادزێیەکان و سەنگەسەریی و دیبەگەییەکان ئازاد دەکرێن. گەڕەکی هەرکییەکان هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە لەبەر ئەوەی ئەوان جاشی رژێم بوون. بگرە لەدواییدا ئەوان دەبنە داردەستی حکومەت بۆ لێدانی خەڵکی قەلادزێ. کاتێك

---

(١)عەبدولرەزاق مەرزنگ: راپەڕین بەهاری ئازادی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٩١.

(٢) عبدالرزاق مەرزنگ: دوای (٧) ساڵ خوێندنەوەیەك بۆ راپەڕین و دەرنجام، رێگای کوردستان (رۆژنامە)، ژمارە(٢٩٢)، ساڵی (٥٣)، چوارشەم ١١/٣/١٩٩٨، ل٣.

بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی ناحیەی کەڵەك بەو کێشەیە دەزانێت سەرووی خۆی ئاگادار دەکاتەوە، لەو کاتەشدا لەناو قوتابیانی قەڵادزەییەکاندا کلاشنیکۆف دابەش کرابوو لەلایەن (ئیتحاد تەڵەبە)وە، ئیتر ئەو کلاشینکۆفانە کەوتە دەست گەنجەکان و راپەرینەکە تا ڕادەیەك هێز و توانای بەخۆییەوە بینی.بۆ ڕۆژی دواتر چوار دەوری ئۆردوگاکە بە جەیش و دەبابە گیرا و لەلایەن رژێمەوە داوای تەسلیم کردنەوەی چەکەکان دەکرا؛ لەو نێوانە کۆمەڵێك ریش سپی قەڵادزێیی هەستان بە دانوستان لەگەڵ رژێمدا، ریش سپییەکان ئەمانە بوون: مەلای نورەدینی، حەمەسووری مینە عارەب، مەلا سەید سلێمان، حەمە عارەب، حاجی حمد خدر، حاجی سلێمانی نورەدینی، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا. لەکاتی دانووستانەکاندا رژێم هەرکییەکانی هاندا تاوەکو لەگەڵ قەڵادزییەکاندا کێشە دروست بکەن و شەڕ بنێنەوە، کاتێك هەرکییەکان هێرشیان هێنایە سەر قەڵادزێیەکان (برایم ئاغا) هەستا بەدابەشکردنی چەك بەسەر خەڵکی داو شەڕی نێوان هەرکی و قەڵادزێییەکان گەورە بوو، هەرکییەکان نەیتوانی هیچ کارێك بۆ دوژمن بکەن، دانووستانەکان بەردەوام بوو لەنێوانی رژێم و ریش سپییانی قەڵادزێییدا. تا راپەرینی گەیشتە هەولێر لە ١٩٩١/٣/١١ دا"[١].

پێویستە بووترێت ئەم ڕاپەڕینە لەشێوەی هەڵچونێکی لە ناکاو هاتە کایەوەو بێ بەرنامەبوو، هەرچەندە لە کاتی ڕاپەڕینەکەش چەند کەسانێکی سەر بەڕێکخستنەکانی " شانە چەکدارەکانی بروسك[٢]"

(١)چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا عەبدوڵلای نەنجومەن)، هەولێر، ٢٠٠٨/٨/١٠.

(٢) ئەم شانانە ڕێکخستنی نهێنی (ی.ن.ك) بوو لە شارەکانی کوردستان دوای ئەنفالەکان، لە کۆتایی مانگی (١٠)ی ١٩٩٠ بیر لە دروست کردنیان کراوەتەوە، بەتایبەتی کاتێك سووپای ڕزگاری کوردستان دامەزرا خەڵکانی ناو ئەو سوپایە

بەشداریان تێدا کردبوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك سازدانی ئەم ڕاپەڕینەو خرۆشاندنی جەماوەر لە ژێر کۆنترۆڵی ڕێکخستنەکانی پارتە سیاسییەکانی کوردستاندا نەبوو.

هەرچەندە ئەم ڕووداوە ماوەیەکی زۆر کەمی خایاندو زوو کپ کرایەوە، بەڵام بەبۆچوونی ئێمە چەند دەرەنجامێکی گرنگی لێکەوتەوە، وەك:

١- قوربانیدانو تۆماری یەکەم شەهیدی ڕاپەڕینی کوردستان.

٢- هەڵچوونی جەماوەری ئۆردوگاکەو سەرقاڵکردنی هێزەکانی عێراق بۆ کۆنترۆڵکردنیان، ئەمەش دەرفەتی باشی بۆ ڕێکخستنە نهێنیەکانو شانە چەکدارەکانی (هـ.پ.ك) زیاتر ڕەخساند لە نێو شاری هەولێرو دەوروبەری.

٣- بوو بە ڕووداوێکی تۆقێنەر لەهەستو دەروونی سەربازانی عێراقی، بەتایبەتی کە ڕۆژی دواتر (واتە ١٩٩١/٣/٥) سەرکەوتنی ڕاپەڕینی شارۆچکەی ڕانیە ڕگەیەندرا.

٤- دوای ڕاپەڕینی ڕانیە، تاقیکاری سێیەمی لێ بەرجەستەکرا، کە ئەویش هەوڵە شکست خواردووەکەی حیزبی شیوعی بوو لەنێو شاری هەولێردا.

---

کران بەهەموێنی دروست کردنی ئەو شانە چەکدارانانە، سنوری ڕێکخستنەکانیشی زۆر فراوان بووەو سەرجەمی ناوچەکانی هەولێرو ڕانیەو دهۆكو کەرکوکی گرتۆتەوە، وەهەر شوێنێك لێپرسراوێکی خۆی هەبووە، کە هەولێرو دەورو بەری (مەلا قادر) لێپرسراوی بووە، (چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١).

## باسی دووەم
## خۆپیشاندانەکەی حیزبی شیوعی عێراق لە ١٩٩١/٣/٦دا

پاش ئەوەی لە ١٩٩١/٣/٥ شاری ڕانیەو دەورووبەری ئازادکرا[١]، ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراق لە شاری هەولێر کەوتنە خۆ بۆ سازدانی ڕاپەڕینێکی جەماوەری بەمەبەستی ئازادکردنی شارەکە لە دەست ڕژێمی بەعس، هەرچەندە لەلایەن ڕێکخستنەکانی بروسکەوە حیزبی شیوعی ئاگادارکرابۆوە کە کاتی ڕاپەڕینی هەولێر نەهاتووە، بەڵام حیزبی شیوعی یەکلایەنە بێ یارمەتی لایەنەکانی دیکەی "بەرەی کوردستانی[٢]" بڕیاری بەرپاکردنی ڕاپەڕینی لە هەولێردا[٣]. بۆ ئەوەی قورسایی و هێزی خۆی تێدا تاقی بکاتەوە، بەڵام لایەنە سیاسیەکانی

---

(١) بڕوانە: کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٦٤٧٥)، ڕۆژی ١٩٩٤/٣/٣٠.

(٢) بەرەی کوردستانی لە ١٩٨٧/٥/٧دا پێک هات و ئەندامانی جگە لە (ی.ن.ک)و(پ.د.ک)، بریتی بوون لە (سۆسیالیست)و (پاسۆک)و(پارتی گەل)و(حزبی شیوعی عێراق- لقی کوردستان)و پاشان لە ساڵی ١٩٩٠ دوو حزبی دیکەش هاتنە ناو ئەم بەرەیەوە، کە ئەوانیش (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان)و (جوڵانەوەی دیموکراتی ئاشووری) بوون.

(٣) عەبدولڕەزاق مەرزنگ: ڕاپەڕین بەهاری ئازادی، ل١٠٤.

دیکەی کوردستان لەگەڵ ئەم بۆ چوونو بەرنامەیەیدا نەبوون، چونکە پێیان وابوو هێشتا بۆ ڕاپەڕینی هەولێر چەند ڕۆژێکی دیکەی پێویستە تا سەرکەوتووبن تێیدا[1].

بەڵام حیزبی شیوعی سوور بوون لەسەر بڕیارەکەی خۆیانو بۆ ئەم مەبەستەش ڕێکخستنە نهێنییەکانی لە هەولێر دوو ڕۆژ پێشتر لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣دا کۆبوونەوەیەکیان کردبوو ئامانجی خۆپیشاندانەکەیان لەم خاڵانە دیاری کردبوو:

١- شکاندنی ئەوترسەی کە خەڵك هەیەتی بەرامبەر بە حکومەتی عێراق.

٢- جەماوەر تا چەند لەگەڵ خۆپیشاندانو ڕاپەڕین دایە.

٣- حکومەتی عێراق تا چەند توانای بەرپەرچدانەوەی هەیە.

بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عێراق، ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناوشاری هەولێر ئاگادارکرانەوە کە خۆسازدەن بۆ خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەورە، ئەوەبوو ڕێکخستنە نهێنییەکانی حیزبی شیوعی عێراق بۆئەم مەبەستە دووبارە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٤ لە گەڕەکی سەیداوەی شاری هەولێر لە ماڵی یەکێك لە کادیرە چالاكو دیارەکانی حیزبی شیوعی کە بە ماڵی (دایکە خەجیج) ناودێریان کردبوو، کۆبونەوەیەکی نهێنیان ئەنجام دا، بەشداربوانی ئەم

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئەحمەد ئیسماعیل/ ئەحمەد گەل)، کۆیە، ٢٠٠٧/٥/١٠.

کۆبوونەوەیە بریتی بوون لە:" سەلاّح مەزن، م.سروود، ئەحمەد گچکە، دڵشاد، بەکر حاجی"[1].

لەم کۆبوونەوەیەدا باس لەپلان و دروشم و ڕێڕەوی خۆپیشاندانەکە کرا. کە کاتژمێر (٩)ی بەیانی لەناوەندی بازاڕی شێخەڵلاّ دەست پێ بکات و بەرەو کۆتری ئاشتی بچێت و لەوێوەش بەرەو قەلاّ بچێ و بەچواردەوریدا بسوڕێتەوە، هەروەها چەند دروشمێکیش پێشنیارکران، لەوانە: بژی هێزی پێشمەرگە سەدام نزیکی مەرگە، ئازادی و دیموکراسی، سەدام لاچێ لە کورسی...هتد[2].

بەم شێوەیە ڕۆژی (٦)ی ئادار بەچەند دەقیقەیەك پێش کاتژمێر (١٠)ی بەیانی، پێداویستییەکان ئامادەکران و یەکێك لەکادیرەکانی حزبی شیوعی بەناوی هۆگر (فوئاد)، کە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی ناوشارو سەرپەرشتیاری خۆپیشاندانەکە بوو، یەکەم هەنگاوی ناو هوتافی دژی ڕژێمی بەعس بەرزکردەوەو خۆپیشاندەرانیش بەدوای کەوتن و بەم شێوەیە خۆپیشاندانە کە بەردەوام بوو تا گەیشتە گەڕەکی سێتاقان[3]، بەلاّم زۆری پێنەچوو خۆپیشاندەران ڕووبەڕوی شالاّوی بێ بەزەییانەی بەعس بوونەوەو تەقە دروست بوو، لەئەنجام دا چەند کەسێك بریندار بوون و ئەوانی دیکەش پەرتەوازە بوون و هەندێکیشیان دەستگیرکران، بەم شێوەیە خۆپیشاندانەکە کۆتایی پێ هات[4].

---

(١) بەکر حاجی: خۆپیشاندانەکەی (٦)ی ئادار پرۆڤەی ئازادکردنی هەولێر بوو، ڕزگاری (ڕۆژنامە)، ژمارە (٣٧)، ١٩٩٧/٢/٢٥، ل٢.

(٢) بەکر حاجی: س.پ، ل٢.

(٣) هـ.س، ل٢.

(٤) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

لەم نێوەندەدا ژنە تێکۆشەری نێو ڕێکخستنە نهێنیەکانی حیزبی شیوعی خاتوو (ئومێد) هوتافی دژ بە بەعس گوتۆتەوەو بە ووتەی ممتاز حەیدەری بێت ئەو یەکەم کەس بووە کە هوتافی بەرز کردۆتەوە لەم خۆپیشاندانەدا[1].

هەرچەندە خۆپیشاندانەکەی (٦)ی ئادار ١٩٩١ ماوەیەکی کەمی خایاندو زوو کپ کرایەوە، بەڵام ڕۆڵی کاریگەری بینی لەهاندانو جۆشدانی جەماوەر بۆ بەرپەرچ دانەوەی بەعس، چونکە خۆپیشاندانەکە بۆ مەبەستی ڕەواندنەوەی دێوەزمەی بەعس بوو، هەروەها ترسێکی گەورەشی خستە دڵی پیاوانی بەعسو لەلایەکی دیکەشەوە سوڕانەوەی کۆپتەرەکانی حکومەتی عێراق بەسەر هەولێردا، گرنگی خۆپیشاندانەکەی دەخستەڕوو[2].

بەمەش دەکرێت بڵێین خۆپیشاندانەکەی (٦)ی ئادار بەسەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراق، تاڕادەیەك ڕۆڵی کاریگەروو بەرچاوی گێڕا لەڕەواندنەوەی ترسی بەعس لەسەر دانیشتوانی هەولێر.

---

(١) لەگفتوگۆیەکی دۆستانەدا ئەم زانیاریانە لە م.ممتاز حەیدەری وەرگیراوە لە هەولێر. بۆ زیاتر بڕوانە: گۆڤاری k21، ژمارە (٤)، ساڵی ٢٠٠٩.

(٢) بەکر حاجی: س.پ، ل٢.

## باسی سێیەم
## هەڵوێستی ڕژێمی بەعس بەرامبەر دانیشتوانی هەولێر

چەند ڕۆژێک پێش دەست پێکردنی ڕاپەڕین بەعس هەستی بەبارودۆخە کە کردبوو، وەرەچاوی ئەگەری ڕوودانی تەقینەوەی گەلی کردبوو، بۆیە "لیوا ڕوکن عەلی شەلال[1]" فەرمانەدەی فەیلەقی (٥) کۆبوونەوەیەکی فراوانی لە بارەگای فەیلەق لە هەولێر لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکان و فەرماندەکانی فەوجەکانی بەرگری نیشتیمانی بەست، کە (٣٠٠) کەسیان ئامادەبوون، لیوا شەلال لەقسەکانی دا هەڕەشەی کرد بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژی هەرجووڵانەوەیەک لەناوچەی کوردستان، ئەمەی بۆ دروست کردنی ترس بوو لەگیانی پێشمەرگەو هاووڵاتیان وەك یەك، لەگەڵ ئەوەشدا هەڕەشەی کرد بە لە سێدارەدانی هەر پێشمەرگەیەك گەر خۆشی بە دەستەوە بدات، بە مەبەستی

---

(١) ناوبراو کەسێکی توند ڕەوبوو، خەڵکی دەوروبەری شاری موصڵ بوو، ماوەیەکی زۆر بوو لە هەولێر لێپرسراوی فەیلەقی پێنج بوو، پێش ڕاپەڕینەکەی هەولێر شەوی ١٠-١١/٣/١٩٩١ بە هەلیکۆپتەری تایبەتی سەربازی بەرەو ناوەڕاستی عێراق هەڵات (هـ.ع).

ئاگادارکردنەوەی هاووڵاتیان بوو بەسەرکوت کردنیان لەبیرکردنەوەی هەرجۆرە هاوکاریەك لەگەڵ هێزەکانی ناو بەرەی کوردستانی لەناوەو لەسەر سنوور[1].

لەگەڵ ئەوەی بەعس بۆسەرکوتکردنی دانیشتوانی هەولێر هەرەشەی بەکارهێنا، هاوکات هەوڵی زۆری دەدا بۆ ئەوەی بەهەر جۆرو ڕێگایەك بێت یەکێك لە لێپرسراوانی شانە چەکدارەکانی بروسك دەستگیربکاتو بەبەرچاوی جەماوەر لەسێدارەی بدات، بۆیە چەند ڕۆژێك بەر لە راپەڕینی هەولێر (پارێزگارو فەرماندەی فەیلەقی ٥ی هەولێر) لە ڕێگای کەسێکەوە کە پێشتر پەیوەندی بەڕێکخستنە نهێنییەکانی بروسکەوە هەبوو، پەیامێك ئاراستەی لێپرسراوی شانە چەکدارەکانی بروسك دەکەن بەوەی کە بارەگای پارێزگاو فەیلەقیان تەسلیم دەکەن بەمەرجێك راپەڕین بەرپانەکرێتو خوێن نەڕژێت، بەڵام لێپرسراوو کادیرەکانی شانە چەکدارەکانی بروسك لەفێڵەکەی بەعس گەیشتوونو ئەم پرۆژەیەیان ڕەت کردۆتەوەو بەمەش خۆیان لە گەورەترین تەڵەی ڕژێمی بەعس دەرباز کردووە، چونکە بەرازی بوونیان دەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بەرنامەی ئازاد کردنی هەولێرو دەستگیرکردنو لەسێدارەدانی ڕێکخستنەکانیش بە بەر چاوی جەماوەر[2].

لەگەڵ نزیك بوونەوەی بەرپابوونی راپەڕین لەهەولێر ترسو دڵە ڕاوکێ یەکی زۆر کەوتە دڵی پیاوانی بەعس، بۆیە لەشەوی (١٠ی

---

(١) صلاح الخرسان: م.س، ص٥٢٦.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

ئازاری ١٩٩١) دەسەڵاتدارانی بەعس هەموو جۆرە هاتوو چۆیەك قەدەغە دەكەن، پاشان هەرئەم شەوە پارێزگارو سەرۆكی دەزگای ئەمن و لێپرسراوانی حیزبی بەعس لەگەڵ (شێخ جەعفەر بەرزنجی): كە سەرۆكی ئەنجومەنی خودموختاری كوردستانی سەر بە بەعس بوو، بە هۆی پشێوی دۆخەكە لە هەولێر هەڵاتن[1].

پاش ئەوەی حكومەتی عێراق بۆی دەركەوت كە ناتوانێت كۆنترۆڵی ناوچە ئازاد كراوەكان بكاتەوە، وەك: ڕانیەو سلێمانی و...هتد، هەولێدا لەڕێگەی پلانێكەوە بتوانێت كۆنترۆڵی هەولێر لەدەست نەدات، بۆ ئەم مەبەستە لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٠ هێزێكی زۆری هێنا بۆ دەوروبەری هەولێر بەونیازەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/١١ دەست بكات بەڕەشبگیری دانیشتوانی شار وەك ئەو "ڕەشبگیریەی كە لە كەركوك[2]" ئەنجامی دا، بەشێوەیەك مەبەستی بوو هەموو گەنج و پیاوەكانی بگرێت و دوریان

---

(١) كریس كۆچێرا: س.پ،ل١٠٧. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: دەقی پاشكۆی بەڵگەنامەكانی ئەم كتێبە.

(٢) هێزێكی سەركوت كەری بێ ئەندازەی سوپای عێراق كە پێك هاتبوون لە (ئەمن، استخبارات، قوات خاسە، حرس جمهوری، ئەندامانی حیزبی بەعس، عەشایەری چەكداری تكریت)،و شارەكانی دەوروبەری بەسەركردایەتی (علی حسن مجید)و(حاجی عبد)ی پارێزگاری ئەوسای كەركوك، سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٠ كاتژمێر (٥)ی بەیانی ئەوڕۆژە لە ڕێی بانگەوازەكانیانەوە قەدەغەكردنی هاموشۆیان لەسەر گەڕەكەكانی شاری كەركوك ڕاگەیاندو پاشان دەستیان كرد بەڕەشبگیری و كوشتاری خەڵكی كورد، دوای ئەوەی ئەم كارە تا ٣/١٢ لەلایەن سەرانی بەعسەوە بەردەوام بوو، سەرەنجام (١٥٠٠) لاوی كوردیان دەستگیركردوو هەروەها كوشتن و بێسەرو شوێن كردنی دەیانی دیكەشی لێ كەوتەوە، بڕوانە: زاهیر ڕۆژبەیانی: كەركوك، ڕەشبگیریەكەی ١٠و١١ی ئازاری ١٩٩١، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٨٩٤)، هەینی ١٩٩٤/٣/١١، ل٥).

بخاتەوە لە هەولێر، بۆ ئەوەی ڕاپەڕین ڕوونەدات، بەڵام بەرلەوەی ڕژێم ڕۆژی ٣/١١ پلانەکەی جێبەجێ بکات، ڕێکخستنە نهێنیەکانی پارتە سیاسییەکانی کوردستان بەتایبەتی شانە چەکدارەکانی بروسکی سەر بە (ی.ن.ک)و جەماوەر بە پشتیوانی پێشمەرگە سەرجەم نەخشەکانی بەعسیان پوچەڵکردەوەو هەنگاوی پێویستیان گرتەبەر بۆ ڕاپەڕینی هەولێر[١].

---

(١) هاوڕێ قادر ڕەسوڵ: لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان، چ١، لە بڵاوکراوەکانی (بنکەی کوردۆلۆژی) لە هەندەران، هۆڵندا، ١٩٩٤، ل٩٧-٩٨. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: دەقی پاشکۆی بەڵگەنامەکانی ئەم کتێبە.

# بەشی سێیەم

## ڕاپەڕینی شاری هەولێر لە (١٩٩١/٣/١١)دا

**باسی یەکەم**

هەنگاونان بۆ زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕینی.

**باسی دووەم**

بەرنامەی ئازاد کردنی.

**باسی سێیەم**

ڕۆژانی ئازاد کردنی.

# باسی یەکەم
# هەنگاونان بۆ زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕینی

چەند مانگێك بەر لە ڕاپەڕین، ئەوکاتەی عێراق کوێتی داگیرکرد لە ٢ی ئابی ١٩٩٠، ئەگەری لێدانی عێراق لەلایەن هاوپەیمانانەوە هاتەکایەوە، لەگەڵ ئەمەشدا ئۆپۆزسیۆنی عێراق چاوەڕوانیان دەکرد بەم لێدانەی حکومەتی عێراق بڕوخێت، بەمەش بۆشایی لە دەسەلاتی سیاسی عێراقدا پەیدا دەبێت، بۆیە هێزە کوردییەکان هەوڵیاندا لە کاتی ڕوودانی هەر گۆڕانێك لەناوچەکە، شارە کوردییەکان ئازاد بکەن[1].

بۆ ئەم مەبەستەش چەند هەنگاوێکیان نا، وەك: لەسەر نەخشەی بنەڕەتی و نەخشەی سەربازی هەولێر هێزەکانی خۆیان بەسەر چەند بەشێك (میحوەرێك) دابەشکرد. جگە لەوەش بەمەبەستی دانانی

---

(١) هاوڕێ قادر ڕەسوڵ: لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان،ل٣٤، ٣٥. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: دەقی پاشکۆی بەڵگەنامەکانی ئەم کتێبە.

بەرنامەیەك بۆ ئازاد کردنی هەولێر، ئاگاداری ڕێکخستنەکانی ناوشاریان کرد، هەر زانیاریەکیان هەیە بۆیان بنێرن، هەروەها دروست کردنی شانەی چەکدار، بۆنمونە: (ی.ن.ك) هەستا بەدروست کردنی شانەی چەکدار لەناو شارەکانی کوردستان، لەئەندامانی ڕێکخستن و ئەو پێشمەرگانە پێك هاتبوو کە خۆیان دابووەوە دەست حکومەتی عێراق، ئەمانەش دوو بنکەی سەرەکیان هەبوو لە کوردستان، لە سلێمانی (شالاو)، لە هەولێر (بروسك) بوون[1].

هەروەها (پ.د.ك) چەند شانەیەکی چەکداریان هەبوو، یەك لەوانە شانە چەکدارەکانی (٤٤٤) بوو، کە ئەم شانەیە لەجەماوەری ناوچەی بیتوێن پێك هاتبوو، کۆمەڵێك شانە بوون ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی حەفتا شانە، هیچ شانەیەکی لە حەوت ئەندام کەمتر نەبوو، سنوری ئەم شانە چەکدارانە جگە لە حەوزی بیتوێن ناوچەکانی (هەولێر، بازیان یەك، کەورگۆسك، خەبات، جدیدە) ی دەگرتەوە، کە هیوا ئەحمەد مستەفا ناسراو بە (سوارە) لێپرسراوی هەموو شانەکان بوو[2].

جگە لەمانەش چەندین گروپ و ڕێکخراوو دەستەی نهێنی دیکە لە هەولێرو دەوروبەری ڕۆڵیان بینی لە زەمینە خۆشکردنی راپەڕین، وەك: ڕەوتی کۆمۆنیست، کە ڕێکخراوێکی مارکسی عێراقی بوو، ڕێکخراوی تێکۆشان، درێژکراوەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو، ڕێکخراوی کۆمۆنیستی کرێکاری، کە بزاوتێکی چەپی توند بوو، ڕێکخراوی

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٨.

(٢) هیوا ئەحمەد مستەفا: ڕۆڵی شانە چەکدارەکانی ٤٤٤ – لە ڕاپەڕینەکەی ئازاری ١٩٩١دا، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٨٨٩)، شەممە ١٩٩٤/٣/٥، ل٣. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: دەقی پاشکۆی بەڵگەنامەکانی ئەم کتێبە.

دەستەی راپەڕین، کە جووڵانەوەیەکی چەپی کوردستانی بوو، ڕێکخستنەکانی جگە لە شارەکانی دیکەی کوردستان لە هەولێرو ئۆردووگاکانی دەوروبەری هەبوون و کاریان بۆ سەرهەڵدانی راپەڕین دەکرد[1]. هەموو ئەمانە بەهۆی ئەوەی لەباری نهێنی دابوون، نەیان دەتوانی وەك ڕێکخراوو حیزب و بەرە خۆیان بە جەماوەر بناسێنن.

لە ڕێگەی ئەم شانە نهێنی یانەوە نامەی نهێنی پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان بەردەوام بوو لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکان و سەرکردەی فەرماندەکانی بەرگری نیشتمانی[2].

جگە لە مانەش دروستکردنی دەستە (مەفرەزە) پارتیزانەکان و ناردنەوەی پێشمەرگە پۆل پۆل بۆ ناوچە داگیر کراوەکانی ژێر دەستی حکومەتی عێراق، بە مەبەستی پەیوەندی کردن بە شانە چەکدارەکانەوە؛ کە بۆ مەبەستی راپەڕین ساز کرابون. بۆیە هەرناوچەیەك دەستەیەکی لێ بوو وەك کۆمیتەیەك لە سنوری پارێزگای هەولێر، بەم شێوەیە:سنووری هەولێر: بورهان سەعید سۆفی، جەلال ئیلنجاغی، مەلا سلێمان، سنووری ڕەواندز: جەلال حاجی، هەڵۆ حەسەن، سنووری شەقلاوە: تەحسین کاوانی، جەلال سۆرکانی، سنووری کۆیە – تەق تەق: م. باپیر، ئاشتی سابیر میرە، مەلا جەمال، م.

---

(١) عەبدولڕەزاق مەرزنگ: راپەڕین بەهاری ئازادی، ل٦٦-٦٧.

(٢) صلاح الخرسان: س.پ، ص٥٢٦.

زیرەك. ئەم كۆمیتانە پێك هاتبوون لە چەندین كادیری سەربازیو سیاسیو سەرجەمیان نزیكەی (٧٠) پێشمەرگە بوون[١].

بەم شێوەیە چەند "دەستەیەكی پارتیزانی یەكێتی" لە ١٩٩١/٢/١٠ لە نێوچەی سنووری (زەڵێ) كەوتنە ڕێ بۆ ناوچەكانی سۆرانو شەقڵاوەو كۆیەو هەولێر، پۆل پۆل بەبناری قەندیل بەهەموو ڕێگا سەختو بەفراویەكان كەزۆربەی نێوچەكان لە دانیشتوان چۆڵكرابوون، جگە لە مۆڵگە (ڕەبایە)و سەربازگەی ڕژێم هیچ ئاوەدانی یەكی دیكەی لێ نەدەبینران[٢].

بەم جۆرە پاش چەند ڕۆژێك هەریەكە لەو دەستە پارتیزانانە گەیشتنە شوێنی مەبەستی خۆیان، كە دەستەكانی سنوری پارێزگای هەولێر بەم شێوەیە بوون: دەستەی ئۆردوگاكانی كانی قرژاڵەو تۆبزاوەو بەرانەتی، مەلا سلێمان سەرپەرشتی دەكردن. دەستەی ئۆردوگاكانی شاوەیسو پیرزین، بورهان سەعید سۆفی سەرپەرشتی دەكردن. هەروەها دەستەی قوشتەپەو ئۆردوگاكانی كەسنەزانو دارەتووو بنەسلاوە، جەلال ئیلنجاغی سەرپەرشتی دەكردن[٣].

---

(١) ئارام ساڵحو ئیبراهیم پاڵانی: لەبەردەم دەیەمین ساڵیادی داستانی راپەڕینی كۆیەو هەولێردا، (چاوپێكەوتن لەگەڵ م.زیرەك)،كوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، بەشی یەكەم، ژمارە (٢٣٩٧)، ساڵی دەهەم، شەممە ٢٠٠١/٣/١٠، ل٥.

(٢) جەلال ئیلنجاغی: لەیادی دەیەمین ساڵەی ئازاد كردنی شاری هەولێر، كوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٢٣٩٩)، ٢٠٠١/٣/١٢، ل٤.

(٣) چاوپێكەوتن لەگەڵ (م. تاهیر بەكر)، سلێمانی ٢٠٠٣/٢/٢٥. ئەم مەفرەزەیە پێك هاتبوون لە (م. تاهیر بەكر، م. كاوە ئەنوەر نادر، ئەحمەد محمد، جەلال ئیلنجاغی).

جگـە لـە دەسـتەکانی یـەکێتی گـرنگترین ئـەو پـارتو ڕێکخـراوە سیاسییە کوردستانیانەی دەستەی تایبەتیان هەبوو بۆ ڕاپەڕین، ئەمانە بـوون: حیزبـی سۆسیالیـستی کوردسـتان (ڕەسـوڵ مامەنـد)، پـارتی دیموکراتی کوردستان (مەسعود بارزانی)، حیزبی شیوعی عێراق-لقی کوردستان (عەزیز مەحمەد)، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان (سامی عەبـدولڕەحمان)، حیزبـی زەحمەتکێـشانی کوردسـتان (قـادر عـەزیز)، ئـالآی شـۆڕش (مـەلا بـەختیار)، بزاڤـی ئاشـووری (یونـادم یوسـف)، بزووتنەوەی ئیسلامی (مەلا عەبدولعەزیز)، هـەروەها هاوکاری (حیزبی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران)،کـە لـە ڕاپـەڕینی شـارەکانی (ڕانیـە، حاجیاوە،کۆیە)و شوێنەکانی دیکەدا ڕۆڵیان بینی[1].

---

(١)، بڕوانە: (عەبدولڕەزاق مەرزنگ: ڕاپەڕین بەهاری ئازادی، ل٦٩-٧١).

# باسی دووەم
# بەرنامەی ئازاد کردنی

دوای داگیرکردنی کوێت سەرجەم پارتو ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان کەوتنە خۆ بۆ سازدانی بەرنامەیەك بۆ بەرەنگار بوونەوەی بارو دۆخەکە، ئەوە بوو لە تەمموزی ١٩٩٠دا زنجیرەیەك کۆبوونەوە بەسترا لەلایەن سەرکردایەتی پارتەکان بۆ ڕێکخستنەوەی کارەکانو بەرنامە دانان لەم قۆناغە ناسکەدا، سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد لەوکاتەدا مەبەستی بوو شارە کوردییەکان ڕزگار بکاتو بیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، بۆ ئەم مەبەستەش بۆ هەموو پارێزگایەك لیژنەیەك دانرا بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ڕزگارکردنی بکات، بە هەموو ناحیەو ئۆردوگاو شارەکانەوە، کە بۆ هەولێر (کۆسرەت ڕەسول عەلی) دەست نیشانکرا[1].

---

(١) بۆ پارێزگاکانی دیکەش بەم جۆرە بوو: بۆ سلێمانی (فەرەیدون عبدالقادر)، بۆ کەرکوك (ملازم عومەر)، بۆ دهۆك (م. نازم)، بڕوانە: حسن کوێستانی: لەیادی دووەم ساڵ ڕۆژی سەرکەوتنی ڕاپەڕین، سەرهەڵدان (گۆڤار)، ژمارە (٢)، ئاداری ١٩٩٣، ل٩.

بەرنامەی ئازاد کردنی هەولێر ناتواندرێ لەبەرنامەی گشتی راپەڕینی شارەکانی دیکەی کوردستان جیابکرێتەوە، چونکە بەپێی ئەو بەرنامەیەی کە دانرابوو دەبوو سەرەتا شارە بچوکەکان و ئۆردوگاکان بەهاوکاری شانە چەکدارەکان و دەستە پارتیزانەکان و جەماوەر ئازاد بکرێت و پاشان شارە گەورەکانی وەك هەولێرو سلێمانی و دهۆك و کەرکوك ئازاد بکرێت، بەم شێوەیە دوای ئازادکردنی رانیەو سلێمانی و...هتد و کۆکردنەوەی هێزەکان، لەلایەن سەرپەرشتیاری هەولێر پلانێك دانرا بۆ گرتنی هەولێر، ئەویش بڕیاردرا بەدابەش کردنی هێزەکان بۆ سەر دوو قۆڵ: قۆڵی کۆیە: پێك هاتبوو لە (م. چەتۆ، رێباز، م. بەکرمستەفا)، کە (م.چەتۆ) سەر پەرشتی دەکرد، وقۆڵی شەقڵاوە: پێك هاتبوو لە (کۆسرەت رەسوڵ، عبدالرزاق، حەسەن کوێستانی، سەفین مەلا قەرە، عبداللە بۆر، رەحمان سەیدە)، بە سەرپەرشتی کۆسرەت رەسوڵ"[1].

شەقڵاوە پێگەیەکی گرنگی هەبوو، چونکە هێزەکانی فەیلەقی (٥) لە دەورووبەری رێگای هاملتۆن بەم شێوەیە بوو: تیپەکانی سوپای عێراق یەکیان لە بەرسلین و ئەویتریان لە سیدەکان و سێ یەمیشیان لە سپیلك بوو، کە دابڕینی ئەم سێ تیپە لە فەیلەقی (٥)ی هەولێر گرنگ بوو، چونکە دەبووە هۆی ئاسان کاری بۆ ئازاد کردن و بەرپا کردنی راپەڕینی هەولێر، بەم شێوەیە بەهۆی شارەزایی هەندێ لە پێشمەرگەکانی ناوچەکە و رێکخستنە نهێنیەکانی ناوگوندی کاوانیان، توانرا شاری شەقڵاوە لە ١٩٩١/٣/٨دا بەشەڕ ئازاد بکرێت، کە لە دوای

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، رانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

ئازادکردنی شەقلاوە هەواڵ نێردرا بۆ ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشاری هەولێر، بێن بۆ شەقلاوە بەمەبەستی ئەوەی لەگەڵ سەرکردەکانی هێزی پێشمەرگە بەرنامەی ئازادکردنی شاری هەولێر دابڕێژن، چونکە کاتێك شەقلاوەو دەوروبەری ئازادکران دەرگا کراوە بۆ هێزی پێشمەرگە بەرەو هەولێر هەنگاو بنێن[1].

بەم جۆرە مەلا قادر[2]، بە هاوەڵی لەگەڵ جەبار شێخەو زاهیر (نەدار)[3]، لە ١٩٩١/٣/٨ گەیشتنە شەقلاوەو لەدێی (بانە نۆك) لەگەڵ سەرپەرشتیاری ڕاپەڕینی هەولێر کوبوونەوەو سەرجەمیان ڕێك دەکەون بۆ ئەوەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/١١ بۆ ڕۆژی ڕاپەڕینی هەولێر دەستنیشان بکرێت، هەرچەندە ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار پەلەیان بوو، مەبەستیشیان بوو زووتر لە (٣/١١) ڕاپەڕین بەرپا بکەن، بەڵام سەرپەرشتیاری ڕاپەڕینی هەولێر سوربووە لەسەر ئەم مێژووە، ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان: ڕێککەوتن نامەی (١١/ئازاری/١٩٧٠) کە لەو ساڵەدا ڕژێمی بەعسی بەغدا بەپێی ڕێکەوتنێکی ڕەسمی دانی نا بەمافی گەلی کورد. ودووەمیان: پێی وابووە نابێت پەلە بکرێت لە ڕاپەڕینی هەولێر، چونکە ئەم شارە پێگەیەکی گرنگی هەیەو پەلە کردن دەبێتە هۆی ئەوەی بەباشی خۆی بۆ ئامادە نەکرێت و پاشان ئەگەری شکستی دەبێت[4].

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.
(٢) لێپرسراوی شانە چەکدارەکانی بروسك لە هەولێر بۆ ئەوکات.
(٣) کە دوو کادیری چالاکی شانە نهێنییەکانی بروسك بوون لە هەولێر بۆ ئەو کات.
(٤) چاوپێکەوتن لەگەڵ (شاخەوان عەباس)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٦.

دوای ئـەوەی بڕیـاردرا لەسـەر (١٩٩١/٣/١١) بـۆ ڕاپـەڕینی هـەولێر، دەسـت کـرا بـەدانانی نەخـشەیەکی وورد بـۆ ئـازاد کردنـی ئـەم شـارە، هەسـتان بەدابەشـکردنی شـانە چـەکدارەکانو دابەشـکردنی بەشـەکان. بـەپێ دانـی چـەندین پارچـە چـەکی بچوك لـە جـۆری (کـلا نـشیکۆف)و ناردنـەوەیان بـۆ هـەولێر لـە ڕێگـەی ڕێکخـستنەکانی بروسـك. لـە هـەمان کاتدا هێمایەکی نهێنی بـۆ شـانە چـەکدارەکانو ڕێکخستنە نهێنیـەکانی بروسك لـە نـاو هـەولێر دانـرا، کـە بـڵاو کردنـەوەی ئـەم هێمایـە لەڕێگـەی ڕادیـۆوە، مانای ئەوە دەگـەیـەنێت هێـزی پێشمەرگە گـەیشتۆتە هـەولێرو دەست بکرێت بەڕاپەڕین[١].

لەگـەڵ ئـەوەش چـەندین نامـەی تایبـەت لـە لایـەن سەرپەرشـتیاری ڕاپەڕینی هـەولێر نێـردرا بـۆ کەسایەتیو سـەرۆك عەشیرەتو سـەرۆکی هێزەکـانی بـەرگری نیـشتمانی لەناوچـەکانی دەوروبـەرو نـاوەوەی هەولێر، لەنامەکاندا هاتبوو (هێزی پێشمەرگە گەیشتۆتە ناوچەکانتانو پێویستە هاوکاریان بکەن)، بەشێك لەو کەسایەتیو سەرۆکی هێزەکانی بـەرگری نیـشتمانی، بریتـی بـوون لـە: حـسێن ئاغـای سورچـی، عومـەر ئاغای سورچی، محمد قادر ئاغای هەرکی، ئەحمەد لاوکۆ، کەریم خـانی برادۆسـت، قـادر بـەگی برادۆسـتو عەشـیرەتەکانی دیکـەی ئـەو ناوچەیە[٢]، کە پاشان بەشێکی زۆریان ڕۆڵی باشیان گێڕا لە ڕاپەڕین[٣].

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

(٣) بـۆ زانیـاری زیـاتر بروانـە: دیڤیـد ماکـداوڵ: مێـژووی هاوچـەرخی کـورد، و/ ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ئایاری ٢٠٠٢، ل٧٦٧-٧٦٨.

شانە چەکدارەکانی بروسك بەپێی بەرنامەیەکی ووردی خۆیان، لە ڕووی ڕێکخستنەوە هەولێریان بەسەر (٥) بەش دابەشکردبوو، بەم جۆرە: بەشی یەکەم لە خەتی کۆیەوە بۆ خەتی مەخمور، دێدەوان سەید محەمەد لێپرسراوی بوو. بەشی دووەم لە خەتی کۆیەوە بۆ خەتی شەقلاوە، زاهیر (نەدار) لێپرسراوی بوو. بەشی سێیەم لە خەتی مەخمورەوە تا ناو سەربازگەی هەولێر، سالارە شەل لێپرسراوی بوو، بەشی چوارەم لە خەتی شەقلاوەوە بۆ سەربازگەی هەولێر، مام خدر لێپرسراوی بوو، هەروەها بەشی پێنجەم، کە بەناوی بەشی ناوخۆ بووەو تایبەت بووە بەناو شار، ئەحمەد ئیسماعیل (ئەحمەد گەل) لێپرسراوی بوو[١].

بەم جۆرە دوای ڕێکخستنی پلانەکان، هەنگاونرا بۆ ڕۆژی ئازادکردنی هەولێر.

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئەحمەد ئیسماعیل/ ئەحمەد گەل)، کۆیە، ٢٠٠٧/٥/١٠. بۆ زیاتر بڕوانە: دەقی پاشکۆی بەڵگە نامەکانی ئەم کتێبە.

# باسی سێیەم
# ڕۆژانی ئازادکردنی

دوای ئـــەوەی جـــەماوەری کوردســـتان شـــان بەشـــانی هێـــزی پێشمەرگەی کوردستان، شارەکانی شەقلاوەو سۆران و ڕەواندزو کۆیـەو دوکان یان ڕزگارکرد، بەرەو هەولێر کەوتنە ڕێگا، هێزەکان بەگشتی لـە شارو شاخ بۆ ئازادکردنی هەولێر چاوەڕێ و لە ئامادە باشی دابوون[1]. ئەوە بوو هێزی پێشمەرگە بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین لـە دوو قۆڵـەوە هەڵمـەتیان هێنا:

١/ قـۆڵی ڕێگـای شـەقلاوە: دوای ڕزگـارکردنی هاوینـە هـەواری صەلاحەددین و سپیلك و سەرجەم ناوچەکانی دیکە، هێزەکان گەیشتنە ئۆردوگـای بەسـتۆڕە، بەڵام کـاتێ پێـشمەرگە گەیـشتە ئـەم ئۆردوگایـە، لەلایەن سووپای عێراقەوە لـەناو "سـەربازگەی خـانزاد[2]" ڕوو بەڕووی بۆردوومانێکی سەخت بوونەوە، بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی ئـەم هێزەی عێراق بکەن و بۆردوومانەکە کۆتایی پێ بێت، پلانێك دانرا کە (بورهان سەعید

(١) حسن کوێستانی: س.پ، ل١٩.

(٢) کەوتبووە باکووری شاری هەولێر، لە نێوان پێچەکانی مصیف صەلاحەددین و بەستۆڕە.

سۆفی)و چەند پێشمەرگەیەك وەك فێڵێك بەناوی چەكدارەكانی (بارامی شێمەی هاڕون) خۆیان بگەیننە ناو ئەم سەربازگەیە، ئەوەبوو (بورهان سەعید سۆفی) توانی پلانەكە وەك خۆی جێبەجێ بكاتو دەست بگرێت بەسەر سەربازگەكەو سەرجەمی سەربازەكان بەدیل بگرێتو چەكیان بكات[1].

دوای ئەوەی هێزەكانی پێشمەرگە كۆنترۆڵی ئۆردوگای بەستۆڕەو دەوروبەریان كرد، لە هەولێر زیاتر نزیك كەوتنەوە، بۆیە لەم كاتەدا لەڕووی سەربازیەوە پلانێك دانرا بۆ ئازاد كردنی هەولێر، كە بەرەبەیانی ١٩٩١/٣/١١ ڕێگای موسڵ-هەولێر كۆنترۆڵ بكرێت، هەروەها هێزێك بنێردرێت بۆ هاندانی جەماوەری ئۆردووگای بەڕانەتیو پاك كردنەوەی ناوچەكە، وهێزێك بنێردرێت بۆ ڕۆژهەڵاتی هەولێر بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو هێزەی لە كۆیەوە دێت تێكەڵ بن[2].

بۆجێ بەجێ كردنی ئەم پلانەی دانرابوو بۆ هەولێر، هێزەكانی پێشمەرگە دابەش كران بۆ دوو بەش: بەشێكیان بەسەر پەرشتی (بورهان سەعید سۆفی)و ژمارەیەك پێشمەرگە بەڕێ كەوتن بۆ ناوچەكانی (بەڕانەتی، زرارەتی، ئۆردوگای كەڵەكی یاسین ئاغا، تۆپ زاواو كەورگۆسك)، بۆ ئەوەی سەرجەمی ئەم ناوچانە ڕزگار بكەنو هەوڵ بدەن ڕێگای نێوان (موسڵ-هەولێر) بپچڕێنن. بەشی دووەمیان بەسەر پەرشتی (كۆسرەت ڕەسوڵ عەلی) لە ئۆردووگای بەستۆڕەوە

(١) چاوپێكەوتن لەگەڵ (كۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

(٢) چاوپێكەوتنی جەمال مۆرتكە: ڕاپەڕینی هەولێر، ئا.بەشی هەواڵو ڕیپۆرتاژ، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٨٩٤)، هەینی ١٩٩٤/٣/١١، ل٣.

بەڕێ کەوتن بۆ ئۆردووگای شاوەیس، بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر لە هەولێر نزیك بکەونەوە[1].

٢/ قـۆڵی ڕێگـای کۆیـە: دوای ئـەوەی سـەرجەمی سـەنگەرەکانی سوپای عێراق لە سەر کێوەکانی هەیبەت سوڵتان لە (٩ مارسی ١٩٩١) بەهێرشـی پێشمەرگەکانی سۆسیالیستو یەکێتی ڕزگـارکرا، پانتـایی ڕاپـەڕین بـە بەشـداری جـەماوەرو پێـشمەرگە دوای ئـازادکردنی کۆیـە بەرەو ڕۆژئـاوا بـڵاو دەبـۆوە. بەمـەش تیپێکـی پێـشمەرگە کـە ژمارەیـان نزیکـەی (٢٠٠) پێـشمەرگە دەبـوون لـە کۆیـەوە بـەرەو هـەولێر بـەڕێ کـەوتن، بـەڵام پێـشڕەوی ئـەم پێـشمەرگانە لـە دەربەنـدی گۆمـە سـپان بـەهۆی بـەرگری (٥) تـانکی سـووپای عێراقـەوە دواخـرا، بـۆ ئـەم مەبەستـەش یـەکێك لـە فەرمانـدەکانی ئـەم پێـشمەرگانە ووتـی: "شـەوی بەسـەرداهات، باران دایکـرد، پێشمەرگەکان مانـدوو بـوو بـوون... ئێمـە بڕیارمانــدا بــۆ کۆیــە بگەڕێینــەوەو ڕۆژی دوایــی لــە گەڕانەوەمانــدا هێرشیان بۆ بکەین، پاشان لەگەڵ هاتنی ئێمە بۆ هـەولێر هـەموو شـتێك تـەواو بـوو بـوو، تـەنها کاربەدەسـتانی ئـەمن تائـەو کاتـە بـەرگریان دەکـرد"[2]. بۆیـە دەکرێـت بڵـێین تـەنها بەشـی سـەرەکی بـۆ ڕزگـارکردنی هەولێر لە قۆڵی ڕێگای شەقڵاوەوە بوو.

سـەبارەت بەڕێکخـستنە نهێنیـەکانو شانەچـەکدارەکانی بروسـك لـەناو شـار، هـەموو ئاگادارکرابوونـەوە ئەگـەر شـەوی ١٠-١٩٩١/٣/١١

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

(٢) وەرگـیراوە لـە: (کـریس کۆچـێرا: س.پ، ل١٠٧،١٠٦). سـەبارەت بـە چۆنیەتی ڕاپەڕینی کۆیەو ئازادکردنی، بڕوانە دەقی پاشکۆی چاوپێکەوتنی م.باپیر بەکر باپیر، لە پاشکۆی چاوپێکەوتنەکانی ئەم کتێبە.

ئێوارەکەی گوێیان لەو بروسکەیە بوو، کە بەشێوەی هێما بۆیان دانرابوو، ئەوا هەموو دەبێت لە کاتژمێر (١٢)ی شەوەوە بچن بۆ ئەو شوێنانەی بۆیان دیاری کراوەو بەیانی کاتژمێر (٦) دەست بەکاردەبن و راپەڕین بەرپادەکەن، بۆیە دوای ئازاد کردنی ئۆردوگای (بەستۆڕە) لەڕۆژی ١٩٩١/٣/١٠، هێزەکانی قۆڵی ڕێگای شەقڵاوە چاوەڕوانی هێزەکانی قۆڵی کۆیە بوون تاوەکو ئەوانیش بگەنە گۆمەسپان و پاشانیش کەسنەزان، لەگەڵ ئەوەی هێزەکانی قۆڵی کۆیە دواکەوتن، شەوی ١٠-١٩٩١/٣/١١ ڕێنمایی درا بەهەموو شانە چەکدارەکان و ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشار بەیانی (٣/١١) دەست بەکاربن بۆ راپەڕین، کە لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە ئێوارەی (١٠-٣/١١) لەکاتژمێر (٨)ی شەو، چەندین جار بروسکەی: (لە باوکی ڕێناسەوە بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بروسك، دەست بەکاربن) خوێندرایەوە، بەمەش چەخماخەی راپەڕینی هەولێر کاتژمێر (٦)ی بەرە بەیانی ٣/١١ دەستی پێکرد[1].

دوای ئەوەی راپەڕینی هەولێر لەلایەن شانە چەکدارەکان و جەماوەری هەولێر بەسەرجەم چین و توێژە جیاوازەکانی وەك: (ژنان، خوێندکاران، لاوان، مامۆستایان، فەرمانبەران و کرێکاران و...هتد) بەرپاکرا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە قۆڵی شەقڵاوە شاڵاوی هێنا بۆ ڕزگارکردنی هەولێرو کاتژمێر (٨)ی بەیانی ٣/١١ گەیشتنە بازگەی شاوەیسی نزیك هەولێر، دوای ڕوو بە ڕوو بونەوەو شەڕێکی نیو

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

کاتژمێری توانرا تانکەکانی سووپای عێراق لەوێ تێك بشکێنن‌و هەڵ بکوتنە ناوشارو تێکەڵ بە جەماوەری ڕاپەڕیوو بن[1].

بە گەیشتنی پێشمەرگە بۆ ناو هەولێر، هێزەکان کران بەدوو ڕەتڵەوە، ڕەتڵی یەکەم: هێزێك بەسەرپەرشتی کۆسرەت ڕەسوڵ بۆ سەر بارەگای فەیلەقی (٥)، ورەتڵی دووەم: هێزێك بەسەرپەرشتی عەبدولڕەزاق بۆ سەر دەزگای ئەنجومەنی یاسادانان‌و جێ بەجێ کردن‌و ڕێکخراوی هەواڵگری باکوور[2]، لەبەرئەوەی ئەم شوێنانە بۆ ڕۆژی ڕزگارکردنی هەولێر لەڕووی ستراتیجیەوە گرنگی تایبەتی خۆیان هەبوو، چونکە قورسایی هێزی حکومەت زیاتر لەم شوێنانەدا بوون، کە شان بەشانی پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك)، دەستەیەکی پێشمەرگەکانی (پ.د.ك) بەسەر پەرشتی جەمال مۆرتکە بەشداربوون لە ئازاد کردنی شاری هەولێر[3].

بەپێی ئەو بەرنامەیەی دانرابوو بۆ ئازادکردنی هەولێر، پێیان وابووە هەمان ڕۆژ پاك دەکرێتەوە، جگە لەفەیلەقی (٥)و سەربازگەی "ڕەشکێن[4]" نەبێت دەمێننەوە بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵام کاتێك ڕاپەڕین بەرپابوو زۆربەی شوێنەکان ئازادکران، کە دیارترین‌و گەورەترین شەڕ بۆ ئازادکردنی هەولێر، شەڕی ڕێکخراوی هەواڵگری باکوور (منظومە الاستخبارات الشمالیە) بوو، کە تیایدا زیاتر لە (٤٠) کەس لە پیاوانی

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

(٣) چاوپێکەوتنی جەمال مۆرتکە: س.پ، ل٣.

(٤) لە ڕووی جوگرافیەوە دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری هەولێر، لە نێوان هەولێرو کەڵەك.

ئـەمن‌و بەعـسی‌و دەسـت‌و پێوەنـدەکانیان کـوژران‌و چـەندین کەسـی دیکەشیان بریندارببوون‌و بۆ ماوەیەك خۆیـان لـە ماڵـەکانی گـەڕەکی حی عـدل‌و ئـازادی حەشـاردا، بـەڵام پـاش بەرگریـەکی کـەم کاتـژمێر (٤)ی دوای نیـوەڕۆی هـەمان ڕۆژ ئـەوێش ئـازاد کـرا[١]. بەمـەش بارەگـای فەیلـەق‌و ئاسایـشی بـاکوورو سـەرکردایەتی لقـی هـەولێرو بارەگـای سـوپای گـەل (جـیش شـعبی)و پارێزگـاو بەڕێوەبەرایـەتی پـۆلیس‌و هەواڵگری، هـەر هـەموویان بەهەشـت کاتـژمێر پاکسازی کـران‌و کەوتنـە ژێر دەسـەڵاتی جـەماوەرو پێشمەرگە، ئەوەی کە بەعسیەکان چەندان ساڵ بوو بۆ تۆقاندنی خەڵك بنیاتیان نابوو، بە هەشت کاتـژمێر کۆتـایی پێهێنرا[٢].

هەربۆیە دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٩١/٣/١١ هەموو شتێك تەواو بوو، ونزیکـەی هـەزار زینـدانی کـە زۆربـەیان لەجـەنگ هـەڵاتبوون‌و لـە وزیندانانـەی کە پێشتر وێستگەی شەمەندەفەر بـوو (سـجنی محکـە)، لەلایـەن جـەماوەر ئـازاد کـرا، بـەئازادکردنی هـەولێر ڕێگاکـانی کـەرکوك کەوتنـە ژێـر چـاودێری پێـشمەرگەوە، کـە پاشـان ئـەو ڕێگایانـە ڕۆڵـی سەرەکیان لە ڕاپەڕینی ئازادکردنی کەرکوك دا بینی[٣].

پـاش ئـازادکردنی شـارو پـاك کردنـەوەی لـە دامودەزگاکـانی حکومـەتی عێـراق، بـۆ پاراسـتنی ئـەم ڕاپەڕینـەی هـەولێرو نەهێـشتنی مەترسی لەسـەر ئـەو شـارە، بڕیاردرا دەست بکرێ بە پاك کردنەوەی

---

(١) عەبدولڕەزاق مەرزنگ: راپەڕین بەهاری ئازادی، ل١٣٤.

(٢) ڕێبـاز: نرکـەی کوردسـتان (بەرلەڕاپـەڕین، لەگـەڵ ڕاپـەڕین، دوای ڕاپـەڕین)، هەولێر ١٩٩٢، ل٦١،٦٢.

(٣) کریس کۆچێرا: س.پ، ل١٠٧.

شـــارو شارۆچـــکەکانی دەوروبـــەری، وەك: شارۆچـــکەی مـــەخمور، ئۆردووگای خەبات‌و پردێ[1].

دەکرێت بڵێین لەڕۆژانی ئازادکردنی هەولێردا، جەماوەر بەسەرجەم چین‌و توێژە جیاوازەکانەوە لەوپەڕی خۆشـی شـادی دابوون، لە هـەمان کاتـدا کاردانـەوەی ڕاسـتەوخۆیان بـۆ سـەر دام‌و دەزگـا حکـومی‌و نـا حکومیـەکانی حیزبـی بـەعس خـستەڕوو. بـەوەی هـەم وەك نارەزاییـەکی بوێرانە بەرامبەر بە سیاسەتە چەوتەکانی بەعس لەچەند ساڵی ڕابردوو بەرامبەر کورد بەگشتی‌و خەڵکی هەولێر بەتایبەتی، هـەمیش بۆ بژێوی ژیان‌و لـەتاوی ئازارو برسـیەتی‌و تێرکردنـی خۆیـان، سـەرجەمی کەل‌و پەلەکانی ئەم دام‌و دەزگایانەیان بە تالآن بردوو بەسەریەکدا خاپووریان کرد، ئەمەش ئەوەی دەخستە ڕوو کە جەماوەر چەندە تینووی ئازادی‌و نان‌و خۆراك‌و بژێوی ژیانن، دوور لە ستەم‌و چەوساندنەوە.

(١)چاوپێکەوتنی جەمال مۆرتکە: س.پ، ل٣.

# بەشی چوارەم

## شاری هەولێرو شکستی ڕاپەڕین

### باسی یەکەم

### هێرشی سوپای عێراق و داگیرکردنەوەی هەولێر

### باسی دووەم

### هۆکارەکانی شکستی ڕا پەڕین بە گشتی:

ا/ هۆکارە دەرەکییەکان.

ب/ هۆکارە ناوخۆییەکان.

# باسی یەکەم
# هێرشی سوپای عێراق‌و داگیرکردنەوەی هەولێر

دوای (٢٠) ڕۆژ ئازادی، سووپای عێراق بەهەموو هێزو توانایەوە خۆی کۆکردەوەو هێرشی بەربلاوی چەند قۆڵی هێنایەوە سەر کوردستان، کە بەرە بەیانی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٢٧ هێرش‌و پەلاماری بۆ سەر کەرکوك‌و پردێ دەست پێکردو سەرەنجام داگیری کردنەوە[١].

لەگەڵ داگیرکردنەوەی شاری کەرکوك‌و پردێ‌و ناوچەکانی دەوروبەری، سووپای عێراق نزیك کەوتنەوە لە شاری هەولێر، بۆیە لەم شارە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٢٨ لەلایەن بەکرێگیراوانی بەعسەوە پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاو دەکرایەوە، کە بەعس هێرش دێنێتەوە سەر کوردستان‌و هەموو جۆرە چەکێکی قورس‌و کیمیایی بەکاردێنێت[٢]، بۆیە پاش تێك

---

(١) ڕێباز: س.پ، ل٧٢; بۆ زیاتر بڕوانە: هارقی موریس- جورج بلوخ: لا اصدقاء سوى الجبال التاريخ الماساوي للاكراد، ترجمة: راج ال محمد، تعليق وتقديم: هادي العلوي، سوريا- دمشق، بدون سنة الطبع، ص٢٥.

(٢) هاوڕێ باخەوان: (هاوڕێنامە) بۆ مێژووی کوردستان‌و کورد، زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ل٣٣٤.

چوونی بارودۆخی هەولێر بڕیاردرا بەرگری بکرێت لە هەولێرو ڕێگە نەدرێت ئەو شارە جارێکی دیکە بکەوێتەوە دەست ڕژێمی بەعس، لە بەرئەوە هێزەکانی ڕژێم لە سێ قۆڵەوە هێرشیان هێناو پێشمەرگەش لەسێ قۆڵەوە دامەزرابوو بۆ بەرگری کردن لە هەولێر، بۆ نمونە هێزەکانی (ی.ن.ک) بەم جۆرە دابەش بوو بوون: قۆڵی (هەولێر-کەرکوك)، کۆسرەوت ڕەسوڵ سەرپەرشتی دەکرد، قۆڵی (هەولێر-موسڵ)، سەفین مەلا قەرە سەرپەرشتی دەکرد، قۆڵی (هەولێر-کەندیناوە)، ڕێباز سەرپەرشتی دەکرد[1].

ئێوارەی ١٩٩١/٣/٢٩ هێزێکی گەورەی سووپای عێراق لەزێی کەڵەك دەپەڕێتەوەو دەگاتە ناوچەی کەندێناوە، هەرچەندە لە گوندی (بیرە بات) هێڵێکی بەرگری لەلایەن هێزی پێشمەرگە دانرا، بەڵام ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣٠ دوژمن هەموو ناوچەی کەندیناوەی گرتەوەو هێزی پێشمەرگە نەی توانی بەرگریەکی ئەوتۆ بکات[2]. پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگە لە هەرسێ قۆڵەوە شکست دێننو دوژمن هەمان ڕۆژ قوشتەپەی نزیك هەولێر داگیر دەکاتەوە، بەمەش سەرجەم هێزەکانی پێشمەرگە پاشەکشێ دەکەن بۆ ناوشار[3].

بەداگیرکردنەوەی قوشتەپە لەلایەن سووپای عێراقەوە، پشێویەکی زۆر دەکەوێتە ناو هەولێر، بۆیە لەلایەن هێزەکانی (ی.ن.كو.پ.د.ك) پلانێك دادەنرێت بۆ گرتنەوەی قوشتەپە بەم جۆرە: هێزەکانی

---

(١) ڕێباز: س.پ، ل٧٤.

(٢) هـ.س، ل٧٣.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

(یـەکێتی)، بەسەرپەرشـتی شـاخەوان عـەباس، وهێزەکـانی (پـارتی)، بەسەرپەرشـتی یـونس ڕۆژبـەیانی، کـە هەریەکـەو بـەجیا لـە دوقۆڵـەوە هەڵبکوتنە سەر قوشتەپەو ڕزگاری بکەنەوە، بۆ ئـەم مەبەسـتەش شـەوی ٣٠-١٩٩١/٣/٣١ کاتـژمێر (١)ی شـەو تەقـە بۆسـەر قوشـتەپە دەسـتی پێکرد، بەڵام سـەرەنجام هێزی پێشمەرگە شکستی هێنـاو بەرەو دواوە پاشەکشەی کرد[1].

شەوی ٣٠ ئازاری ١٩٩١ نزیکـەی (٨) تۆپخانـەو ژمارەیـەکی زۆر لـە تانکـەکانی سـووپای عێـراق بـەرەو ڕووی هـەولێر کەوتنـە کـار، لەهـەر کاتژمێرێکـدا گوللـە تۆپێـك دەکەوتـە ناوشـارەوە، ئەمـەش بەمەبەسـتی ترسـاندنی خەڵکەکـەبوو، لەوکارەشـی دا سـەرکەوتووبوو[2]، چـونکە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣١ چەند دەستەیەکی سـەر بـەڕژێمی عێراقی لەشاری هەولێر دەردەکەون بەمەبەسی تەقەکردن لەخەڵکی و تێکدانی ئارامی و ئاسایـشی شـار[3]، بۆیـە پـاش ئـەوەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣١ هێـزی پێشمەرگە بێ ئومێد دەبێت لە گرتنەوەی قوشتەپە، بیر لـەوە دەکەنـەوە لەناوشـار بـەرگری بکـەن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش هێزێـك بەسەرپەرشـتی (ڕەهبـەر سـەید بـرایم) دەچـێتە سـەر ڕێگـای (هـەولێر-کەسنەزان)و هێزێکـی دیکـەش کـەپێك هـاتبوون لـە (حەسـەن کوێـستانی، شـاخەوان عـەباس، سـەفین مـەلا قـەرە، فاقـە مـەخموری، مـەلا سـلێمان)، دەچـنە گـەڕەکی کوردستان (حی العسکری کۆن) لـە ڕۆژئـاوای شـارو بڕیـاری

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (شاخەوان عەباس)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٦.

(٢) کریس کۆچێرا: س.پ، ل١١١.

(٣) هاوڕێ باخەوان: (هاوڕێنامە) بۆ مێژووی کوردستان و کورد، ل٣٣٤.

بەرگری کردن دەدەن، بەڵام هەر ئەو ڕۆژە هێزەکانی ڕژێم لەخەتی قوشتەپەوە پەلاماری سەر هەولێر دەدەن و نزیکەی کاتژمێر (١١)ی نیوەڕۆ تانکەکانی دەگاتە ناو شار[١]. هەرچەندە پێشمەرگە ئەوەندەی بۆی کرا بەرگری کرد، بەڵام سەرەنجام ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣١ شاری هەولێر بەهێرش و پەلاماری سووپای عێراق داگیر دەکرێتەوە[٢].

بەم جۆرە جارێکی دیکە هەولێر پاش بیست ڕۆژ ئازادی دەکەوێتەوە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس، کە لەئاکامی بەرگری کردندا وێڕای شەهید بوون و بریندار بوونی ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان، لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆریش لە چین و توێژە جیاوازەکانی شاری هەولێرو دەوروبەری شەهیدو بریندارو ئەوانی دیکەش بەشی هەرە زۆریان دەربەدەربوون بۆ ناوچە سەر سنوورییەکان، کە دەکرێت بوترێت ئەم ئاکامانەش هەم بەهۆی نا هاوسەنگی هێزەکان و هەمیش بەهۆی لێکنەگەیشتنی نێوان پارتە سیاسییەکانی کوردستان و نەبوونی یەک دەنگی بوو بۆ بەرنامەی دوای ڕاپەڕین.

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (شاخەوان عەباس)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٦.

(٢) کریس کۆچێرا: س.پ، ل١١٢.

## باسی دووەم
## هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین بە گشتی

بەسەرنج دانێکی ووردی بارودۆخی بەهاری ۱۹۹۱، دەبینین کۆمەڵێك هۆکاری کاریگەر هەبوون کە وای کرد ئەم ڕاپەڕینە نەتوانێت مەبەستەکانی خۆی لە ئازادکردنی تەواوی ناوچەکانی کوردستان لەدەست ڕژێم بپێکێت، کە لەماوەیەکی کورتدا جەماوەری ڕاپەڕیوو بەهەمان لێشاوی پەلاماردانو بەرەو پێشەوە چوون بەرەو دواوە کشانەوەو تووشی شکست هاتن کاتێك کە ڕژێم گشت شارەکانی گرتەوە توانی زیانی گەورە لە جەماوەری ڕاپەڕیوی کوردستان بگەیەنێت لەسەرجەم بوارەکانی (ماددیو مەعنەویو مرۆییەوە).

لێرەدا هەوڵ دەدەین ئەمْ هۆکارانە بەدوولایەنی (دەرەکیو ناوەکی)، بخەینە ڕوو:

**یەکەم: هۆکارە دەرەکی یەکان:**

چەند هۆکارێکی دەرەکی ڕۆڵیان هەبووە بۆ شکستی ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ز کوردستان، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١-هەڵوێستی خراپی ڕۆژئاواو ئەمەریکا بەرامبەر بەڕاپەڕین، چونکە وولاتانی ڕۆژئاوا لە کەناڵەکانی ڕاگەیاند نیانەوە وایان بلاو دەکردەوە کە مەبەستی سەرەکی هاوپەیمانەکان ڕووخاندنی ڕژێمی عێراقە، بەتایبەتی ئەمەریکا کە (جورج بوش)ی سەرۆك کۆمار بەڕاشکاوانە داوای لەگەڵی عێراق دەکرد ڕاپەڕن و سەدام بڕوخێنن، بەلام هەموو ئەوانە لەکاتی بەرپاکردنی ڕاپەڕین پێچەوانە بۆوەو نەك پشتیوانی گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کورد یان بەتایبەتی نەکرد، بەڵکو هەرزوو شەڕەکەیان وەستاندوو پلانی لەناوبردن و کپ کردنەوەی ڕاپەڕینیان دارشت(١). ئەمەش لەکاتێك دا بوو کە ئەمەریکا بڕیاری گفتوگۆ کردنی لەگەڵ ڕژێم دا لە ١٩٩١/٢/٢٨ز، کەئەوکات ڕژێم لەوپەڕی لاوازی و شکستیدا بوو، بەلام ئەم ڕێکەوتنە کارێکی زیان بەخشی گەیاندە وورەی خەڵك و لە هەمان کاتیشدا ڕژێمی پێ بەهێز بۆوە(٢).

بۆیە دەبینین ڕاپەڕین دەستی بەبەر تەسك بوونەوە کرد پاش ئەوەی (جورج بوش) تیشکی سەوزی دا بەڕژێم و دەست کردن بەدژە هێرش لەسەر ڕاپەڕین، کە لەهەمان کاتدا گەمارۆی سەر یەکەکانی سوپای پاسەوانی کۆماریان هەڵگرت لەڕۆژئاوای فورات و، ماوەشی دا هەلیکۆپتەر بەکاربێنێ دژی گەلەکەی، کە ئەمانەش هەموو پێچەوانەی

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.
(٢) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٦٩.

بەندەکانی ڕێکەوتنەکەی نێوان ڕژێم و هاوپەیمانان بوو کە لەژێر چادری (سەفوان) مۆرکرابوو.(١)

پاش ئەوەی ڕژێم سەرجەم هێزەکانی کە لەکوێت و بەسرەو ناسریە گەمارۆ درابوون، بەڕێگە پێ دانی لەلایەن هاوپەیمانان سەرجەمیانی گەیاندەوە ناوەڕاستی عێراق، بۆ نمونە ڕژێم بەیەك ڕۆژ نزیکەی (٩٠٠) تانکی لە فوراتەوە پەڕاندەوە بۆ دەوروبەری شاری بەغدا(٢). بۆیە دەتوانین ئەم هەڵوێستەی هاوپەیمانان بەرامبەر بە ڕاپەڕین بەیەکێك لە هۆکارە دەرەکی یەکانی دابنێین بۆ شکستی ڕاپەڕین.

٢-شکستی ڕاپەڕین لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق:

دوای ئەوەی ڕاپەڕین لە باشوری عێراق دا سەری هەڵداو بەرەو شارەکانی ناوەڕاستی عێراق پەرەی سەند هێزی هاوپەیمانان لەسەروشیانەوە ئەمەریکا ترس کەوتە دڵیانەوە نەوەك حکومەتی عێراقی بڕوخێت و شیعە لەشوێنی حوکم بگرێتە دەست، چونکە دەبووە هۆی هاوپەیمانی لەگەڵ ئێران، کە پێشتریش لەماوەی (٨) ساڵ شەڕی نێوان عێراق- ئێران خەریك بوو تاشتێکی وا ڕوو نەدا، بۆیەش ئەمەریکا تیشکی سەوزی بە سەدام دا بۆ ئەوەی پەلاماری ئەو ڕاپەڕینە بدات و سەرکوتی بکات، بەمەش ڕژێم هەڵسا بەبەکارهێنانی تانك و تۆپ و بۆمبە دوکەلاویەکانی کە هاوشێوەی دوکەڵی بۆ مبی کیمیاوی بوون، توانی ڕاپەڕین لەناوەڕاست و باشوور کپ بکاتەوە(٣)، کە

---

(١) صلاح الخرسان: م.س، ص٢٥٨.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

(٣) جواد ملا: م.س، ص٩٦.

ئەمەش بەیەکێك لە هۆکارە کانی شکستی ڕاپەڕین دادەنرێت لە کوردستان، چونکە کاتێك ڕژێم ڕاپەڕینی شیعەکانی لە خواروو کپ کردەوە، توانی زیاتر بێتە سەر کوردستان بۆ کپ کردنەوەی ڕاپەڕین.(١)

٣-نەبوونی پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان ڕاپەڕینەکانی خوارووی عێراق و باشووری کوردستان:

پێش ڕاپەڕین لیژنەیەکی هاوکاری هەبوو لە نێوان بەرەی کوردستانی و مجلسی اعلی (دعوەو منچمەی عملی اسلامی)، کە بڕیار بوو پێکەوە ڕاپەڕین بەرپابکەن لەیەك کاتدا، بەڵام (مجلسی أعلی) ئەم بڕیارەی نەبردە سەرو بەبێ ئاگاداری بەرەی کوردستانی ڕاپەڕین یان لە باشووری عێراق بەرپاکرد، کەتوانی بوو یان زۆربەی شارەکانی خواروو ناوەڕاستی عێراق هەتا (حلە)ش ئازاد بکەن، کەدوای ئەوان بەرەی کورد ستانی بەهاوبەشی لەگەڵ جەماوەر ڕاپەڕین یان گەیاندە شاری کەرکوك، بۆ یە لێرەدا ئەگەر (مجلس أعلی) بڕیارەکەی جێ بەجێ بکردایە دۆخەکە بەشێوەیەکی تر دەبوو، چونکە دەتوانرا پێکەوەو بەهاو بەشی پەلاماری شارەکانی تری عێراق وەك (بغداو تکریت و موسڵ) بدرێت و ڕژێم بەتەواوی لەناو ببرێت(٢).

کاتێك ڕاپەڕین لە خواروی عێراق بەرپابوو، لە دوولاوە کاریگەری خراپی هەبوو بۆ ڕاپەڕینی کورد ستان، کە لە لایەك وای لە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی کرد کەخێراو بەپەلە بڕیاری ڕاپەڕین

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا بەختیار)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٦.
(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

بدەن لە شارەکانی کوردستان، کەئەم پەلەیەش دەرەنجامێکی خراپی لێکەوتەوە لە دوای ڕاپەڕین، لە لایەکی تریشەوە شکستی ئەم ڕاپەڕینە کاریگەری خراپی هەبوو لە سەر دەروونی خەڵکی کوردستان، بەهۆی ئەوەی کە ڕژێم ڕێگای زۆر درندانەی گرتەبەر بۆ کپ کردنەوەی ئەو ڕاپەڕینە(١)، هەروەها سەرکردایەتی ئۆپۆزسیۆن بەهاوبەشی بیریان لە پەیوەندیەکی ڕێکخراو نەکردبوەوە لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێو هەوڵ یان نەدابوو بۆ پیادەکردنی نەخشەکانیان لەکاتی ڕاپەڕین دژی ڕژێم.(٢) ئەمانەش بۆ خۆی خاڵێکی لاوازی ڕاپەڕینەکان بوون، وەدەتوانرێ بەخاڵێکی شکستی هەردوو ڕاپەڕینەکە دابنرێت.

٤-نا هاوسەنگی هێز لە نێوان پێشمەرگەو ڕژێم:

لەگەڵ ئەوەی کە ڕژێم لە ئەنجامی جەنگەکانیدا شکستی گەورەی خوارد بوو، بەڵام هێشتا لە ڕووی سەربازی یەوە پڕچەك بوو ئەوهێزەی پێشمەرگە بەرهەڵستی پێ نەدەکرا،(٣) هەرچەندە ئەمەریکاو هاوپەیمانان لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاویان دەکردەوە کەلە کۆی (٥٦) تیپ سەربازی (٤٤) تیپیان لە ناو بردووە، کە ئەمەش بەشێکی زۆری سوپای عێراقی دەکرد، کەلە ڕاستی دا سەرکردایەتی کورد پێی وابوو ئەم وڵاتانە درۆ ناکەن، بەڵام دواجار دەرکەوت کە ئەمانە دوورن لە ڕاستیەوە، چونکە بەشێکی زۆری سوپای عێراق لە باشوور بێ زیان مابۆوە، لە لایەکی تریشەوە هێزە بنەڕەتیەکەی ڕژێم

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

(٢) مەلا بەختیار: س.پ، ل٢٧٠.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ڕەهبەر سەید برایم)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٤.

بەتەواوی مابۆ وە کە بریتی بوو لە (پاسەوانی کۆماری)، بەمەش نابەرامبەریەکی زۆر هەبوو لە نێوان هێزی پێشمەرگەو سوپای عێراق،(١) بۆیە دەبینین ڕژێم هێشتا توانای جەنگێکی دیکەی لە کوردستاندا مابوو، وەلە هەلێکی ڕەخساو دەگەڕا بۆ ئەوەی درێژە بەتەمەنی کورتی خۆی بدات، کە دەبینین بەپێچەوانەی هێزی ڕژێم هێزی بەرەی کوردستانی لە هەموو ڕوویەکەوە لاواز بوو لە بەرامبەری(٢)، کە ئەمەش بۆ خۆی هۆکارێکی تری شکستی ڕاپەڕین بوو.

**دووەم: هۆکارە ناوخۆییەکان:**

چەند هۆکارێکی ناوخۆیی ڕۆڵی بەرچاویان بینی بۆ شکستی ڕاپەڕین لە شاری هەولێر بەتایبەتی و کوردستان بەگشتی، کە گرنگترینیان ئەمانەن:-

١-پێکهاتەی بەرەی کوردستانی لە بنەڕەتەوە لەسەر بنچینەیەکی (تێگەیشتن و ڕەزامەندیەکی دەروونی لەناخەوە) نەبوو لە نێوان لایەنە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانی دا، کەچەند ساڵ بوو لە (شەڕو ناخۆشی) دابوون لەگەڵ یەکتری داو درزو بەینێکی گەورە لە نێوانیاندا بوو کە بەئاسانی ساڕێژ نەدەکرا(٣). بۆیە دەبینین لەسەردەمی ڕاپەڕینەکەدا پێکهێنەری ڕاپەڕین کە بەرەی کوردستانی بوو،

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٨.

(٢) شیروان: چەواشە بوونی تێڕوانینی سیاسی سەرەتای خستنەوەی پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی چەواشەیە، یەککرتن (گۆڤار)، ژمارە (١٣)، ئایاری ١٩٩١، ل٢٠.

(٣) بۆ زیاتر بڕوانە: (پشکۆ حمە تاهیر: ڕاپەڕینی شاری کەرکوک لە ساڵی ١٩٩١، چ١، مەکتەبی ڕووناکبیری (ی.ن.ك)، ٢٠٠٣).

بەرنامەیەکی ڕوون و ئاشکراو شیاوی بۆ قۆناغی دوای ڕزگارکردن نەبوو، واتە پارتە سیاسیەکان پێکەوە بڕیارێکی یەکگرتوویان نەدا بۆ چارەسەر کردنی دۆخەکەو بەرگری کردن.(١) هەرچەندە (ی.ن.ك) هەر لەسەرەتای ڕاپەڕینەوە بەرنامەی هەبوو بۆ ڕاپەڕین، بەڵام ئەم بەرنامەیە لەلایەن پارتەکانی تری کوردستان پەیڕەو نەکرا لەبەر ناکۆکی نێوانیان، بۆیە ئەم بێ بەرنامەیەی بەرەی کوردستانی خاڵێکی لاوازی ڕاپەڕینەکەبوو، هەروەها خاڵێکی سەرەکیش بوو بۆ شکستی ڕاپەڕین لە باشووری کوردستان.

٢-لەڕووی سەربازیەوە، هەموو لایەنەکانی ناوبەرەی کوردستانی بیریان لەپێك هێنانی سوپایەکی یەکگرتوو نەکردبۆوە، لە هەمان کاتدا نەتوانرا لەکاتی ڕاپەڕین دا وەك پێویست هێزی پێشمەرگە ڕێك بخرێت، لە لایەکی ترەوە هەر حزب و گروپەی چەکداری خۆی هەبوو یەکگرتوو نەبوون، هەروەها هەموو خەڵك چەکداربوو بەڵام وەکو پێویست بەرگری نەدەکرد.(٢) ئەمەش لە ڕووی سەربازیەوە هۆکارێك بوو بۆ شکستی ڕاپەڕین.

٣-دوای ئەوەی شاری کەرکوك لە ١٩٩١/٣/٢١ز لە لایەن هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئازادکرا، بەڵام پاش چەند ڕۆژێك ڕژێمی عێراق توانی لە ١٩٩١/٣/٢٨ز دەستی بەسەر دابگرێتەوە، هەرچەندە بەرگری کرا لە شاری کەرکوك لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە، بەڵام ئەمانە بێ

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (شاخەوان عەباس)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٦.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (ڕەهبەر سەید برایم)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٤.

سوود بوون و دووبارە کەرکوک کەوتەوە ژێردەستی ڕژێم،(١) کەئەمەش ڕاستەوخۆ کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر شارەکانی تری کوردستان بەتایبەتی شاری هەولێر، کە ڕژێم دوای گرتنەوەی کەرکوک پەلاماری ئەم شارەشی دایەوە.

٤-نەگرتنی شاری موسڵ کەبڕیاربوو هێزەکانی (پ.د.ك) ئازادی بکەن لەکاتێکدا کە هێزەکانی (ی.ن.ك) کەرکوك ئازاد دەکات، بەڵام ئەم بڕیارە وەکو خۆی جێ بەجێ نەکراو هێزەکانی (پارتی) هیچ هێرشێکیان بۆ سەر موسڵ نەکرد، کە ئازادکردنی ئەم شارە ڕووخانی بەغدای دیاری دەکرد، چونکە زۆربەی ئەفسەرەکانی سوپای عێراق بەتایبەتی ئەوانەی دەسەڵاتیان هەبوو خەڵکی ئەم شارە بوون ڕازی نەدەبوون کەشارەکەیان وێران بکرێت و چارەیەکیان بۆ سەدام دەدۆزیەوە لە بەغدا، لایەکی ترەوە موسڵ وەزنێکی گەورەی هەیە لە ڕووی ئابووریەوە بۆ عێراق و تێکدانی ئابووری موسڵ و پێوەندی پچڕینی لەگەڵ بەغدا، کاری دەروونی خراپی دەکردە سەر بەغداو لە وێش ڕاپەڕین سەری هەڵدەدا(٢)، بەڵام نەگرتنی موسڵ لە بەرژەوەندی ڕژێمی عێراق دا بوو کەتوانی بەهۆیەوە تۆکمەیی بەغدا بپارێزێت و پاشان ڕاپەڕینەکەی کوردستان سەرکوت بکات.

٥-نەبوونی ڕێکخستن لەنێوان میللەت و پێشمەرگە بەشێوەیەکی تەواو، وەدەست پێکردنی پێشبڕکێی سیاسی لە یەکەم هەفتەی ڕاپەڕین لە نێوان گروپ و کۆمەڵەکاندا، هەروەها مانەوەی چەندین سیخوڕی

---

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

(٢) ڕێباز: س.پ، ل٧٨.

ڕژێم لە نێو شارەکاندا کە بەهۆی دەرکردنی لێبووردنی گشتییەوە بوونە (تابووری پێنجەم)ی ڕژێم.

لەلایەکی تریشەوە زۆربەی چەکدارو هەندێ لەبەرپرسانی باڵاش سەرگەرمی کاری تایبەتی خۆیان و گڵدانەوەی سامان و دزی و جەردەیی بوون، ئەمەش بووە هۆی دروست بوونی بارێکی ناهەموارو ناخۆش لە ناوشارەکاندا(١). بۆیە دەبینین ئەمانە هەمووی بوونە هۆکارێك بۆ تێك چوونی دۆخەکەو دواجار بەرگری نەکردن لە شارەکان و هەڵاتن ڕوویدا.

٦-ناشارەزایی بەشێکی زۆری پێشمەرگەو خەڵك لە شەڕو بەرگری شارەکان، هەرچەندە هەوڵ زۆردرا بۆ ئەوەی لە ناو شارەکاندا بنکەو بارەگای زۆر بکرێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی فێری شەڕی ناو شارەکان ببن، بەڵام ئەمانە هیچ سوودی نەبوو، بۆیە کاتێك حکومەت هێرشی گەورەی بەپشتیوانی چەکە قورسەکانی دەست پێکرد بۆسەر شارەکان، خەڵك هیچ بەرگرییەکی نەکردو هەموو ڕایانکردو دوای ئەمانیش پێشمەرگەش دەستی کرد بەڕاکردن بەدوای خەڵك.(٢)

٧-سوود وەرنەگرتن لە چەکە قورسەکانی ڕژێم، کە ژمارەیەکی زۆر لەم چەکانە دەستیان بەسەر داگیرابوو، نەدەتوانرا سوودیان لێ وەربگیرێت و بەکار بهێنرێن لەبەرامبەر دوژمن لەکاتی بەرگری کردندا. کە هێزی پێشمەرگە زیاتر چەکی سوکی بەکار دەهێنا،(٣) بۆیە نەتوانرا وەك پێویست بەرگری بکرێت بەرامبەر بە ڕژێم.

---

(١) ڕێباز: س.پ، ل٧٧.

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٨.

(٣) چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

# ئەنجام

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەوەی کە:

١- شاری هەولێر وەکو شارێکی دێرین لەمێژوودا، لەسەرجەم قۆناغە مێژووییەکانی کەچەندین میرنشین و حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان بەچەندین شێواز فەرمانڕەواییان تێدا کردووەو داگیرکەرانیش بەردەوام شالاویان بۆ سەر هەولێر بردووە، بۆیە بەدرێژایی مێژوو لەم شارەدا چەندین شۆڕش و ڕاپەرینی یەك لەدوای یەك ڕوویداوە.

٢- ڕاپەرینی شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستان و ڕاپەرینی ئۆردوگای خەبات و خۆپیشاندانەکەی حیزبی شیوعی عێراق لە شاری هەولێر، بوون بەهەوێنی چەخماخەی ڕاپەرینی هەولێر.

٣- پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان لەچوارچێوەی بەرەی کوردستانی ڕۆڵی سەرەکی و بەرچاویان بینیوە لە ڕاپەرینی هەولێر، بۆیە ڕاپەرینی شاری هەولێر وەك سەرجەم ڕاپەرینی شارەکانی دیکەی کوردستان لەچوارچێوەی بەرنامەیەکی داڕێژراودا بوو.

٤- ڕێکخستنی شانە چەکدارە نهێنییەکان و دەستە پارتیزانەکانی پارتە کوردیەکان، ڕۆڵی گرنگیان بینی لە ڕاپەرینی شاری هەولێر، کە لەسەرووشیانەوە شانە چەکدارەکانی بروسك بوو.

٥- راپــەرینی شــاری هــەولێر، وەك راپــەرینێكی سەرتاســەری جـــەماوەری لـــە باشـــووری كوردســـتان، ســـەرجەم سیاســـەتە چەواشەییەكانی حكومەتی بەعسی عێراقی خستە مەترسی ولەگۆڕنان، كە ڕەتكردنەوەی سیاسەتی (بەعەرەبكردن، بەبەعسی كردن، ڕاگواستن، ئەنفال، كیمیابارانكردن و...هتد) بوو.

٦- سـەرجەم چین و توێـژەكانی كۆمـەڵ، لـەپاڵ ئەمانیـشدا پیـاوانی سـەر بـەڕژێم بەتایبـەتی بەشـێك لـە سـەرۆكەكانی هێزەكـانی بـەرگری نیـشتمانی بەشـێوەیەكی گـشتی بەشـدار بـوون لـە ڕاپـەڕین و هاوكـاری كردنی پێشمەرگەو جەماوەر.

٧- ڕاپەرینی شاری هەولێر، یـەكێك بوو لـەو ڕاپەرینانـەی كـە بـووە دەروازەیــەك بــۆ ئـازادكردنی شـاری كـەركوك، وەك بەشـێكی گـەورەی كوردستان.

٨- بەهۆی لێكنەگەیشتنی نێوان پارتـە سیاسـیەكانی كوردسـتان و نەبوونی یـەك دەنگی بۆ بەرنامەی دوای ڕاپـەڕین، شـاری هـەولێر دوای بیست ڕۆژ ئازادی، جارێكی دیكە كەوتەوە ژێر دەستی ڕژێمی بەعس.

# لیستی سەرچاوەکان


**یەکەم: کتێبە کوردییەکان:**

١- ئەمین قادر مینە: ئەمنی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان: (تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی دووەم، ١٩٩٩.

٢- پشکۆ حمە تاهیر: ڕاپەڕینی شاری کەرکوك لە ساڵی ١٩٩١، چ١، مەکتەبی ڕووناکبیری (ی.ن.ك)، ٢٠٠٣.

٣- حیکمەت محمد کریم (مەلا بەختیار): شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکاریەکانی سەردەم (خەباتی شاخەکان یان ڕاپەڕینی شارەکان)، چاپی سێیەم، هەولێر- ١٩٩٤.

٤- دەزگای ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك): کەرکوك و سیاسەتی تەعریب، چاپخانەی شەهید ابراهیم عەزۆ، ئایاری-١٩٨٥.

٥- دیڤید ماکداوڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، و.ئەبوبەکر خۆشناو، ب٢، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ئایاری ٢٠٠٣.

٦- ڕێباز: قەندیل بەغدای هەژاند، بەشی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین، ١٩٩٣.

٧- ڕێباز: نرکەی کوردستان (بەرلەڕاپەڕین، لەگەڵ ڕاپەڕین، دوای ڕاپەڕین)، هەولێر ١٩٩٢.

٨- زیاد عبدالرحمن: تونی مەرگ (هێرشەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامەکانی ڕژێم دا)، تەورێز، ١٩٩٥.

٩- ستیفن برۆکفیلڈو پۆل ئە.لیڤن: بۆنەوەکانتانی بگێڕنەوە، (دەربارەی ئەو هۆلۆکۆستەیە کە لە ئەورووپای ١٩٣٣-١٩٤٥دا ڕوویداوە)، و.ئیبراهیم خ.ئەحمەد، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

١٠- شارەوانی هەولێر: هەولێر، لەیادی سەد ساڵەی دامەزراندی شارەوانی هەولێردا، شارەوانی هەولێر دەری کردوە، مطبعة علاء- الوزیریە، ١٩٨٥.
١١- شوان عوسمان مستەفا: کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد، (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە)، سەنتەری چاپ و پەخشی تەما، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١٢- عەبدولڕەزاق مەرزنگ: راپەڕین بەهاری ئازادی، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤.
١٣- عەبدوللا کەریم مەحمود: ڕەشەبای ژەهرو ئەنفال، بەرگی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی، بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠٠٢.
١٤- کۆمەڵێك نوسەری کورد و بیانی: گەلێکی پەژمووردەو نیشتمانی پەرت، و. محمد گۆمەیی، سوید، ١٩٩٨.
١٥- کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی و هیوای سەربەخۆیی، و.ئەکرەمی میهرداد، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
١٦- مەحمود مەلا عززەت: بازنەکانی ململانێ و ستراتیجی ئاسایشی نەتەوەی کورد، چاپخانەی ڕەنج، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩.
١٧- محمد امین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەشی یەکەم و دووەم، سلێمانی، چاپی نوێ (چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم)-٢٠٠٠.
١٨- محمد حاجی محمود: ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك، بەرگی سێیەم (١٩٨٧-١٩٩١)، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠١.
١٩- میدڵ ئیست وۆچ: جینۆساید لە عێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و.سیامەندی موفتی زادە، چاپخانەی خاك، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩.
٢٠- نەوشیروان مستەفا ئەمین: خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی ڕوداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٨٤-١٩٨٨، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩.

٢١- هاوڕێ باخەوان: (هاوڕێنامە) بۆ مێژووی کوردستان و کورد، زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی،١٩٩٩.

٢٢- هاوڕێ قادر ڕەسوڵ: لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ڕاپەڕینەکەی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان، چ١، لە بڵاوکراوەکانی (بنکەی کوردۆلۆژی) لە هەندەران، هۆڵندا، ١٩٩٤.

٢٣- یوسف ئەحمەد دەرگەڵەیی: مێژووی شاری هەولێر، لەکۆنەوە تاسالانی شەست، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

**دووەم: کتێبە عەرەبیەکان:**

٢٤- أربیل فی ضلال بیان ازار التاریخي، مطبعة الصباح، حله، ١٩٧٢.

٢٥- جمال رشید (الدکتور)و فوزی رشید: تأریخ الکرد القدیم، مطبعة جامعة صلاح الدین، أربیل، ١٩٩٠.

٢٦- جواد ملا: کردستان والکرد، وطن مقسم وامة بلا دولة، تقدیم: جمال نەبەز، دار الحکمة-لندن، ٢٠٠٢.

٢٧- خلیل اسماعیل(الدکتور): انماط الاستطیان الریفي في العراق، بغداد، مطبعة الحوادث، ١٩٨٢.

٢٨- دائرة معارف الاسلامیة: ت.ابراهیم زکی خورشید،ط٢، دارالشعب، القاهرة- ١٩٦٩/سترك: مادة أربل،ج٢.

٢٩- زبیر بلال إسماعیل: تأریخ اربیل، من مطبوعات مجلة (هەولێر)، ١٩٩٨.

٣٠- صلاح الخرسان: التیارات السیاسیة في الکردستان العراق، قراة في ملفات الحرکات والاحزاب الکردیة فی العراق ١٩٤٦-٢٠٠١، مؤسة البلاغ للطباعة والنشر والتوزیع، الطبعة الأولی، ٢٠٠١.

٣١- طة باقر و فوأد سفر: المرشد الاموطن الاثار والحضارة، وزارة الشقافة والارشاد، الرحلة الرابعة، بغداد، ١٩٦٥.

٣٢- طة باقر و فوأد سفر: المرشد الی مواطن الاثارو الحضارة، وزارة الشقافة والارشاد، الرحلة الخامسة، بغداد، ١٩٦٦.

٣٣- طه باقر: مقدمة فى التاريخ الحضارات القديمة، ج١، بغداد، ١٩٥٦.
٣٤- عباس بدرى: يوميات الانتفاضة، يوميات الانتفاضة، طبعت فى مطبعة جامعة صلاح الدين- أربيل، بدون سنة الطبع.
٣٥- عبد الله محمد على علياويى(الدكتور): الكرد في عهد المغولي، رسالة ماجستير، هەولێر، ١٩٨٩.
٣٦- عبدالرزاق الحسنى: العراق قديما وحديثا، مطبعة عدنان-صيدا، ١٩٥٦.
٣٧- عبدالرزاق الحسنى: موجز تاريخ البلدان العراقية، ط٢.
٣٨- كى لسترينج: بلدان الخلافة الشرقية، ت.نشير فر انيس وكور كيس عواد، مطبعة الرابطة، بغداد- ١٩٥٤.
٣٩- ماجد الماجد: انتفاضة الشعب العراقى، دار الوفاق للصحافة الطباعة و النشر، بيروت، الطبعة الأولى- ١٩٩١.
٤٠- محافظة أربيل: أربيل (هەولێر)، بين الماضي والحاضر، لجنة فستفال يوم محافضة أربيل، ١٩٨٨.
٤١- محسن محمد حسين(الدكتور): أربيل فى العهد الاتابكى، بحث فى أوضاع أربيل السياسيةو الاقتصاديةو العسكريةو الاداريةو الثقافية فى العهد الاتابكى، رسالة ماجستير، مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٧٦.
٤٢- مراقب كردى: اجتياح وضم الكويت، كانون الاول، ١٩٩٠.
٤٣- نيكولاس يوستغيت: حضارة العراق وأثارة، ت.سمير عبد الرحمن الجلبى، دار المأمون الترجمة والنشر، بغداد-١٩٩١.
٤٤- هادى رشيد چاوشلى: تراث أربيل التاريخي، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥.
٤٥- هارڤى موريس- جورج بلوخ: لا اصدقاء سوى الجبال التاريخ الماءساوى للاكراد، ترجمة: راج ال محمد، تعليق وتقديم: هادى العلوى، سوريا- دمشق، بدون سنة الطبع.
٤٦- هاشم خضير الجنابى(الدكتور): مدينة أربيل، دراسة فى جغرافية الحضر، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٧.

٤٧- یاقوت الحموی: معجم البلدان، ج١، دار الفکر للطباعة والنشر والتوزیع، الطبعة الثانی، بیروت- ١٩٩٥.

**سێیەم: گۆڤارەکان:**

**أ- بەزمانی کوردی:**

٤٨- ئازاد شێخانی (دکتۆر): ئەنفال لەناو چوارچێوەی قۆناغەکانی دروستکردنی ئۆردوگا زۆرە ملێ یەکاندا، سەنتەری برایەتی (گۆڤار)، ژمارە (٢٤)، هاوینی ٢٠٠٢.

٤٩- حەسەن کوێستانی: لەیادی دووەم ساڵرۆژی سەرکەوتنی راپەرین، سەرهەڵدان (گۆڤار)، ژمارە (٢)، ئاداری ١٩٩٢.

٥٠- شیروان: چەواشە بوونی تێروانینی سیاسی سەرەتای خستنەوەی پرۆسەیەکی کۆمەلایەتی چەواشەیە، یەکگرتن (گۆڤار)، ژمارە (١٣)، ئایاری ١٩٩١.

٥١- ف.رەش: خوێندنەوەی سیاسی لە نێوگرەوی ئەگەرەکاندا، هەڵوێستی نیشتمانی (گۆڤار)، ژمارە (٥)، ئایاری ٢٠٠٠.

٥٢- فەرهاد پیربال (دکتۆر): هەولێر ناوەکەی لەچی یەوە هاتووە، گۆڤاری (هەولێر)، ژمارە (٥)، زستانی ٢٠٠٠.

٥٣- لەتیف فاتیح فەرەج: کوردو کەرکوك، پەیڤین (گۆڤار)، ژمارە(٢)، ئۆکتۆبەری١٩٩٧.

٥٤- مەحمود مەلا رەزا: بایەخی ستراتیژی کەنداوی فارس، سیاسەتی دەولی (گۆڤار)،ژمارە (٥)، نیسانی ١٩٩٣.

٥٥- محمد عبدالله عومەر (مامۆستا): ئەنفالی پارێزگای هەولێر (هۆکارو دەرئەنجام)، سەنتەری برایەتی (گۆڤار)، ژمارە (٢٤)، هاوینی ٢٠٠٢.

ب- بەزمانی عەرەبی:

٥٦- سەرکەوت: دور اذاعة صوت شعب كردستان في الانتفاضة، سەرهەڵدان (مجلة)، العدد (٢)، ئایاری ١٩٩٣.

٥٧- سليمان عبدالله اسماعيل: تهجير المستوطنات الريفية في اقليم كوردستان العراق، گوڵان العربي (مجلة)، العدد(٣٩)، ئابی ١٩٩٩.

چوارەم: ڕۆژنامەکان:

٥٨- ئارام ساڵح و ئیبراهیم پاڵانی: لەبەردەم دەیەمین ساڵیادی داستانی ڕاپەڕینی کۆیەو هەولێردا، (چاوپێکەوتن لەگەڵ م.زیرەك)، کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، بەشی یەکەم، ژمارە (٢٣٩٧)، ساڵی دەهەم، شەممە ٢٠٠١/٣/١٠.

٥٩- ئیبراهیم خەبات: ڕاپەڕینی ئۆردووگای خەبات، ڕێگای کوردستان (ڕۆژنامە)، ژمارە (٤٤٣)، ڕۆژی ٣ی ئازاری ٢٠٠١.

٦٠- بەکر حاجی: خۆپیشاندانەکەی (٦)ی ئادار پرۆڤەی ئازادکردنی هەولێر بوو، پزگاری (ڕۆژنامە)، ژمارە (٣٧)، ١٩٩٧/٢/٢٥.

٦١- جەلال ئیلنجاغی: لەیادی دەیەمین ساڵەی ئازاد کردنی شاری هەولێر، کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٢٣٩٩)، ٢٠٠١/٣/١٢.

٦٢- خدر مەعسووم (دکتۆر): دامەزراندنی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٥٢)، چاپی دەرەوە، هەینی ٢٢ی ئایاری ١٩٩٨.

٦٣- زاهیر ڕۆژبەیانی: کەرکوك، ڕەشبگیریەکەی ١٠و١١ی ئازاری ١٩٩١، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٨٩٤)، هەینی ١٩٩٤/٣/١١.

٦٤- سەفین مەلا قەرە: (ی.ن.ك) داینەمۆو ڕێکخەرو دەستپێشخەری ڕاپەڕین بوو، کوردستانی نوێ(ڕۆژنامە)، ساڵی دەهەم ، ژمارە (٢٣٩٢)، پێنج شەممە ٢٠٠١/٣/١.

٦٥- چاوپێکەوتنی جەمال مۆرتکە: ڕاپەڕینی هەولێر، ئا.بەشی هەواڵ و ڕیپۆرتاژ، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٨٩٤)، هەینی ١٩٩٤/٣/١١.

٦٦- گوێندەی ئێزگەی دەنگی کوردستان بارزان مەلا خالید، برایەتی (ڕۆژنامە)، هەینی ١٩٩٤/٣/١١، ژمارە (١٨٩٤).

٦٧- عبدالرزاق مەرزنگ: دوای (٧) ساڵ خوێندنەوەیەك بۆ ڕاپەڕین و دەرنجام، ڕێگای کوردستان (ڕۆژنامە)، ژمارە(٢٩٢)، ساڵی (٥٣)، چوارشەم ١٩٩٨/٣/١١.

٦٨- کوردستانی نوێ (ڕۆژنامە)، ژمارە (٦٤٧٥)، ڕۆژی ١٩٩٤/٣/٣٠.

٦٩- هیوا ئەحمەد مستەفا: ڕۆڵی شانە چەکدارەکانی ٤٤٤ - لە ڕاپەڕینەکەی ئازاری ١٩٩١دا، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٨٨٩)، شەممە ١٩٩٤/٣/٥.

پێنجەم: چاوپێکەوتنەکان:

٧٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ (ڕەهبەر سەید برایم)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٤.

٧١- چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا بەختیار)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٦.

٧٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی)، سلێمانی ٢٠٠٢/١١/٢٩.

٧٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە ٢٠٠٢/١٢/٣.

٧٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا قادر)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١١.

٧٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ (شاخەوان عەباس)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٦.

٧٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی ٢٠٠٣/١/١٨.

٧٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ (م.خدر ئیبراهیم خدر)، قەڵادزێ، ٢٠٠٣/٢/٤.

٧٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ (م. تاهیر بەکر)، سلێمانی ٢٠٠٣/٢/٢٥.
٧٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ (م.باپیر بەکر باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٣/٣/٣.
٨٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئەحمەد ئیسماعیل/ ئەحمەد گەل)، کۆیە، ٢٠٠٧/٥/١٠.
٨١- چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا عەبدوڵلای ئەنجومەن)، هەولێر، ٢٠٠٨/٨/١٠.

شەشەم: بەڵگەنامەکان:
٨٢- بارودۆخی شاری هەولێر بەچەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕینی، بەپێی زانیارییەکانی شانە چەکدارەکانی بروسك لە ٢٣-١٩٩١/٢/٢٤.
٨٣- باری ڕێکخستن و چالاکیەکانیان و بەشداری چین و توێژە جیاوازەکان بەپێی بەڵگەیەکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان شانەی قەرەچوغ/ شانەی سەرەکی مەخمور.
٨٤- پەیام و دەربڕینە نهێنیەکان بۆ بڵاوکردنەوەی لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان.
٨٥- پەیوەندی لەگەڵ کەرکوك بەپێی نامەی کاکل بۆ بروسك لە ١٩٩١/٣/٧.
٨٦- ژمارەی بەشێك لە گەڕەکەکانی شاری هەولێر کە لەلایەن ڕێکخستنە نهێنیەکانەوە بۆیان دانراوە.
٨٧- شێوەی پەیوەندیەکانی گروپی (٠٠٣) لە پێشمەرگەکانی سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا.
٨٨- شێوەی پەیوەندیەکانی گروپی (٠٠٤) لە پێشمەرگەکانی سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا.

٨٩- شێوەی پێکەوە بەسترانی پێشمەرگەکانی تیپی باباگوڕگوڕ لە سوپای ڕزگاری کوردستان (سرك) لە ڕێکخراوی هەولێردا.

٩٠- شێوەی پێکەوە بەسترانی پێشمەرگەکانی تیپی سەفین لە سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا، بەم جۆرە بووە.

٩١- شێوەی پێکهاتنی پێشمەرگە لە سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا، بەم جۆرە بووە.

٩٢- شێوەیەك لە تیپەکانی ڕێکخستنە نهێنیەکان، وەك شانەی چەکداری بەرفراوان، بەناوی (سرك) واتە سوپای ڕزگاری کوردستان، لەناوی دا تیپی باباگوڕگوڕ، کە بەم جۆرە ژمارەو پۆلێنکراوە.

٩٣- نامەی جێگری هاوڕێ کۆسرەت بۆ "بروسك" بەرلە ڕاپەڕینی هەولێر لە ١٩٩١/٣/٨.

٩٤- نامەی ڕێکخستنە نهێنیەکانی نێوچەی حەریرو باتاس‌و باسرمە بۆ شانە چەکدارەکانی بروسك بەمەبەستی ڕێکخستنی جەماوەرو خۆڕێکخستن بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین لە ١٩٩١/٢/٢١.

٩٥- نامەیەك بۆ سەرکردایەتی (ی.ن.ك) لە شانە چەکدارەکانی بروسکەوە لە ٢٧-١٩٩١/٢/٢٨.

٩٦- نامەیەکی هیوا ئەحمەد مستەفا (ناوی نهێنی سوارە) بۆ نەوشیروان مستەفا ئەمین لە ١٩٩١/٣/١٢ سەبارەت بەبارودۆخی ئەو نێوچانەی کە ڕاپەڕینیان لێ بەرپابووە.

**حەوتەم: تێزی زانستی بڵاونەکراوە:**

٩٧- جەمال فتح الله تەیب: بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان (١٩٧٥-١٩٨٠) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، تێزی دکتۆرای بڵاونەکرایەوە، لە بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٩.

## پاشکۆی ژمارە (٢)

**بارودۆخی شاری هەولێر بەچەند ڕۆژێك بەر لە ڕاپەڕینی، بەپێی زانیارییەکانی شانە چەکدارەکانی بروسك لە ٢٣-١٩٩١/٢/٢٤:**



## پاشکۆی ژمارە (٤)

## پەیام و دەربڕینە نهێنیەکان بۆ بڵاوکردنەوەی لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان:



## پاشکۆی ژمارە (٥)

**ژمارەی بەشێك لە گەڕەكەكانی شاری هەولێر كە لەلایەن ڕێكخستنە نهێنیەكانەوە بۆیان دانراوە:**



## پاشکۆی ژمارە (٦)

## نامەی جێگری هاوڕێ کۆسرەت بۆ "بروسك" بەرلە ڕاپەڕینی هەولێر لە ١٩٩١/٣/٨:



## پاشکۆی ژمارە (٧)

# نامەی ڕێکخستنە نهێنییەکانی نێوچەی حەریرو باتاس‌و باسرمە بۆ شانە چەکدارەکانی بروسك بەمەبەستی ڕێکخستنی جەماوەرو خۆڕێکخستن بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین لە ١٩٩١/٢/٢١



## پاشكۆی ژمارە (١٠)

## شێوەی پێکهاتنی پێشمەرگە لە سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا، بەم جۆرە بووە:

شێوەی پێکهاتنی (پ.٣٠) سوپای ڕزگاری کوردستان
لە ڕێکخراوی هەولێردا بەم جۆرەیە

ڕێکخراوە = (تیمی سەفین + تیمی باباگوڕگوڕ + گروپی ٢٠٠ + گروپی ٤٠٠)
کە هەر یەکەیان ناوی ژمارەیی یان هەیە.

هەر (پ.م) ێکی (سەرکردە) ناوێکی ژمارەیی تایبەتی
هەیە، کە پێویستە لە بریا بێنێ و بە نووسین لای دابنێت..

| ناوی یەکەکان | ناوی ژمارەیی | ژمارەیان | سەرپەرشتکار |
| --- | --- | --- | --- |
| ڕێکخراوی هەولێر | (٠٠٠) | ١٠٢ | [illegible] |
| تیمی سەفین | (٠٠١) | ٤٧ | کاک نەوزاد |
| تیمی باباگوڕگوڕ | (٠٠٢) | ٢٧ | خولە |
| دوپی (٢) | (٠٠٢) | ١٤ | مامۆستا دلشاد |
| دوپی (٤) | (٠٠٤) | ٩ | دڵدەوان |

## پاشکۆی ژمارە (١٢)

**شێوەیەك لە تیپەكانی ڕێكخستنە نهێنیەكان، وەك شانەی چەكداری بەرفراوان، بەناوی (سرك) واتە سوپای ڕزگاری كوردستان، لەناوی دا تیپی باباگوڕگوڕ، كە بەم جۆرە ژمارەو پۆلێنكراوە:**



## پاشکۆی ژمارە (١٤)

## شێوەی پەیوەندیەکانی گروپی (٠٠٣) لە پێشمەرگەکانی سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا:



## پاشکۆی ژمارە (١٥)

## شێوەی پەیوەندیەکانی گروپی (٠٠٤) لە پێشمەرگەکانی سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا:



## پاشکۆی ژمارە (١٦)

## شێوەی پێکەوە بەسترانی پێشمەرگەکانی تیپی باباگوڕگوڕ لە سوپای ڕزگاری کوردستان لە ڕێکخراوی هەولێردا:

# پاشکۆی

# دەقی چاوپێکەوتنەکان

دەقی ئەوچاوپێکەوتنانەی کەوا بۆ ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە کاتی خۆی ئەنجاممان داوون، لێرە وەك خۆیان و بەپێی کاتەکان و مێژووی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکان بڵاویان دەکەینەوە، چونکە تایبەتە بەم بابەتەو لەهیچ شوێنێکی دیکەش بڵاومان نەکردوونەتەوە، تەنها لێرەنەبێت، کە بەپێویستمان زانی بۆ مێژوو بڵاویان بکەینەوە.

**یەکەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ (ڕەهبەر سەید برایم[1])، سلێمانی- ناو زانکۆی سلێمانی، کاتژمێر (11)ی پێش نیوەڕۆی ڕۆژی یەك شەممە، ڕێککەوتی 2002/11/24:**

**یەکەم: بارودۆخی کوردستان بەر لە ڕاپەڕین؟**

ئەوسەردەمە بارودۆخی کوردستان لەدوای گرتنی کوێت لەلایەن عێراقەوە بەر لەڕاپەڕین کرایەوە، بەگشتی بیروبۆچوونی حیزبەکان وابوو هەرگیز پێ یان وانەبوو ڕاپەڕین بەرپابکرێ، لە نێو (ی.ن.ك) لەئاستی مەکتەبی سیاسیی و سەرکردایەتی هەمان ڕاهەبوو کە ڕاپەڕین نەکرێ، چونکە هیچمان پێ ناکرێ، بەڵام بە ئیلحاحی بەڕێز مام جەلال و بەڕاسپاردن و نامەناردن، بەرنامەی ڕاپەڕین گەڵاڵەکرا، نەك هەولێر هەموو شارەکانی کوردستان لەدڵە ڕاوکێ و ناخۆشی دابوون، لەژێر پۆستاڵی بەعس دەیان ناڵاند، حیزبی بەعس زۆر بەسام و زاڵ بوو!

**دووەم: هۆکارەکانی ڕاپەڕین؟**

١- یەککگرتوویی حزبە کوردستانیەکان لە یەك بەرەدا، بەرەی کوردستانی.

---

(١) ساڵی ١٩٥٧ لە شاری کۆیە لە دایك بووە، لە ١٩٧٩ ئەندامی ناوچە بووە لە خۆشناوەتی، ١٩٨١ لێپرسراوی ناوچەی کۆیە بووە. ١٩٨٣ جێگری تیپی ٩٣ی کۆیەو ساڵی ١٩٨٤ بۆتە سەرتیپی ئەم تیپە. لە ١٩٨٧دا سەرتیپی خاڵخاڵان بووە. پارتیزان بووە لە چەمی ڕێزان و ناوچەی کەرکوك. پێش ڕاپەڕین بۆتە کارگێڕی فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان. بڕوانامەی بکالۆریۆسی هەیە لە بواری ڕاگەیاندن. ئێستا لە دەزگەی کاروباری پێشمەرگە دێرینەکان کاردەکات.

٢- لێبوردنی جاشەکان و نامە ناردن بۆ هەموو مشتەشارەکان و پەیوەندی کردن پێیانەوە.

٣- بەرنامە دانان بۆ ڕاپەڕین کە کۆبوونەوەی بەرەی کوردستانی کرا بە ناوی کۆبوونەوەی ئەگەرەکان.

٤- لێدانی هاوپەیمانەکان لە عێراق.

٥- یەك دەنگی کورد بۆ ڕاپەڕین.

٦- هێزی پێشمەرگە بە گژ سوپا و جاش دا نەچێ و بەگژ ئەمن و ئیستخبارات و دەزگا داپڵۆسێنەرەکاندا بچێت.

٧- بێزاری خەڵکی عێراق بە کورد و شیعەو عەرەب و کەمە نەتەوایەتیەکانەوە دژ بەبەعس.

٨- دڕندایەتی بەعس و زوڵم و زۆرکردنیان لە خەڵکی کورد و عێراق.

سێیەم: ئامادەباشی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەر لە ڕاپەڕین؟

هێزی پێشمەرگە لە هەموو دەشت و دەر و ناوچەکاندا هەبوون و هێزی پارتی زانی لە نزیك شار و ئۆردوگاکان بوون. هەروەها سەرکردایەتی لە سەر سنور بوو خەریکی ئامادە کردن و خۆ سازدان بوون.

چوارەم: بەرلەڕاپەڕین و لەکاتی ڕاپەڕین ڕۆڵی ڕێکخستنەکان و جەماوەرو .... تاد چۆن بوو؟

١-ڕێکخستن زۆر بە هێز بوو خەڵك زۆربەی لە گەڵ جەلانەوەی کورد و شۆڕش و پێشمەرگە بوون.

٢-حەماسەت و یەك دەنگی کورد و پێشمەرگە جەماوەری خرۆشاند. ڕژێم دڕندانە بوو زوڵمی زۆری دەکرد.

٣- ژن و منداڵیش وەك پیاو و پێشمەرگەی شاخ دەوری هەبوو.

پێنجەم: بەرنامەی ڕاپەڕین چۆن بوو؟

بەرنامە بۆ هەموو شارەکان هەبوو، هێزی پێشمەرگەی کوردستان دابەش کرابوون بەسەر دە میحوەرو هەر میحوەرەی ئەندامێکی فەرماندەیی و هەر پارێزگایەك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بۆ داندرابوو، هەولێر جەماوەر کردی پێشمەرگە هاتە سەر حازری و پشتیوانێکی بەهێز بوو بۆی، ڕزگار کردنی سلێمانی و ڕانیە و کۆیە پاڵنەر بوو. یەکێتی زووتر گەیشتە هەولێر حیزبەکان دوایی هاتن.

شەشەم: ڕۆڵی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە ڕاپەڕینی هەولێر؟

هێزی پێشمەرگەی کوردستان پەلاماری هەولێری نەدا، جەماوەری خەڵکی هەولێر کردی و ئەنجامی دا.

حەوتەم: ئایە ئیسلامیەکان بوونیان هەبوو؟ ڕۆڵی بزووتنەوەی ئیسلامی چی بوو؟

حیزبە ئیسلامیەکان دەوریان نەبوو بەس بزووتنەوە هەبوو، ئەویش هیچ ڕۆڵێکی نەبوو وە لەبەرنامەشدا نەبوو.

هەشتەم: پێت وایە هەولێر لەچاو شارەکانی دیکەی کوردستان درەنگ ئازاد کراوە؟

هەولێر درەنگ ڕزگار نەبووە پاش شەش ڕۆژ لە گەڵ یەکەم تروسکەی ڕاپەڕینی ڕانیە ئازاد کرا و جەماوەر ڕاپەڕی و جگە لەوەش هەموو ئیستخبارات و ئەمن لە هەولێر کۆبووبوونەوە!

نۆیەم: کورتەیەك دەربارەی ڕۆژی ئازادکرنی هەولێر؟

١- بەگژ منزەمە داچوون، خەڵك بەبەردو دارو وتاف کێشان.

٢- تا سەعات یانزە پێم وایە خاوێن کرابۆوە لە دەسەڵاتی ڕژێم.

٣- جەماوەر کردی و خەڵك لە هەولێر بەژن و منداڵەوە بەشدار بوون.

٤- بارەگای حیزبی دەست نیشان کران.

٥- خۆیان ڕانەگرت لە ئاست حەماسەتی جەماوەری ڕاپەڕیوی هەولێر.

٦- زیانەکان بە مسۆگەری نازانم ئەوەندە دەزانم شەهید خەجە باوە و باوکی پێشڕەوی لێ شەهید کران.

٧- قەت خەڵکی هەولێر خۆشی وای بە خۆیەوە نەبینی بوو شاگەشکە بوون باوەشیان بۆ پێشمەرگە دەکردەوە.

٨- گیران و کوژران و هەڵاتن و سوپا و جاش ئازاد و سەربەست بوون چ بکەن و بۆ کوێ بچن.

دەیەم: ڕۆژانی دوایی ڕاپەڕین چی ڕوویدا؟

من گەڕامەوە کۆیە، چونکە لەوێ مسئول بووم، حیزبەکان بارەگایان دانا خەریکی ڕێکخستن و کۆنترۆڵ کردنی خەڵك بوون زۆربەی چەکەکان هێندرا بوون بەڵام زۆربەشی لە کۆڕەوەکە تێچوو هەروەها بەڵگەنامەکانی ئەمن و ئیستخبارات دەستی بەسەردا گیرا و پارێزران.

یانزەیەم: لە ڕاپەرینی شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا زۆرترین بەرگری لە کوێ کرا؟

بەرگری زۆر لە ڕاپەڕین لە کەرکووك و کۆڕێ و سەری ئەزمەڕو هەیبەت سولتان کرا.

دوانزەیەم: پێت وایە ڕۆژانی ڕاپەڕین لە کوردستان کورت بوو؟ وە بۆچی؟

ڕاپەڕین کورت بوو ڕژێم دەستی بەسەر شارەکاندا گرتەوە و ئەمەریکا چرای سەوزی بۆ پێ کردبوو.

سیانزەیەم: ئایە چ حیزبێك ڕۆڵی سەرەکی بینی وە لە ڕاپەڕین دا؟

هیچ حیزبێك بەقەد یەکێتی ڕۆڵی سەرەکی نەبوو، ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان بە حەماسەتو بە پەرۆش و ڕاستەوخۆ بەرنامە و هەواڵەکانی پەخش دەکردوو سەرکەوتن و ڕووداوەکانی ڕادەگەیاند.

چواردەهەم: هۆیەکانی شکستی ڕاپەڕین بەگشتی چی بوون؟

١-پێکردنی چرای سەوز لە لایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانەوە بۆ عێراق. خوارووی عێرلقی کپ کردوو کەوتە گرتنەوەی شارەکان و کەرکوکی گرتەوە.

٢-هێزی پێشمەرگە ڕێك و پێك نەکرابوو پێك هاتنەی نەبوو هەر چەك دار بوو لە بۆتە و پەیکەرێك ڕێك نەخرابوو هەموو خەڵك چەکی پێ بوو، بەلآم بەرگری نەدەکرد.

٣-عێراق زۆر بەتواناو پڕ چەك و هەلی کۆپتەر و دەبابەی هەبوو بەرهەڵست نەدەکرا لە قەوارەی پێشمەرگەدا نەبوو.

٤-هەر حیزب و گروپەی هێزی چەك داری خۆی هەبوو یەکگرتوو نەبوو.

٥-بەرنامەی شەڕ و بەرگری دانەنرابوو، لێپرسراوێکی پێشمەرگە نەبوو هێزەکە ڕێك بخا و چەك دارەکان ئازاد بوون و خەریکی قوتار کردنیماڵو منداڵ و شتی تایبەتی بوون.

٦-سامو درندەیی ڕژێم ترسی لە حکومەتی بەعس خەڵك لە ئەنفالو کۆکوژی دەترسا!

پانزەهەم: سەرچاوەی چەك‌و تەقەمەنی پێشمەرگە چۆن چۆنی بوو؟ جۆری ئەوچەکانەی بەزۆری بەکاردەهاتن چی بوون؟

کۆنە چەکەکانی خۆمان بوو کورد چەکی لە هیچ دەوڵەت و ڕێکخراوێك وەرنەگرت بوو، چەکەکانی ڕژێم بوونە سەرچاوەو دەست کەوت. جۆرەکانیش بەزۆری کلاشینکۆف و ئاربیجی و بیکەیسی و بە کەمیش دۆشکە بوو.

شانزەهەم: هەڵوێستی مستەشارەکان گەر بەکورتی پێمان بڵێی چۆن بوو بەرامبەر بە ڕاپەڕین؟

مشتەشارەکان بە عەفووکردن دڵنیا بوون و خۆشیان لە ڕژێم بێزار بوون.

**دووەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ حیکمەت محەمەد کەریم (مەلا بەختیار)، سلێمانی- بارەگەی مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی (ی.ن.ك)، کاتژمێر (٥)ی ئێوارەی ڕۆژی سێشەممە، ڕێککەوتی ٢٠٠٢/١١/٢٦:**

پ١/ بارودۆخی کوردستان بەگشتی، بەر لە ڕاپەڕین چۆن بوو؟

و/ بارودۆخی کوردستان پێش ڕاپەڕین بارودۆخێکی زۆر نا لەبار بوو، تا لە باریەکە لەوەیا بوو کە جەنگی عێراق و ئێران وەستا، کە جەنگی عێراق-ئێران وەستا، سوپای عێراق بەهەموو توانای خۆی هاتە سەر کوردستان، وە توانی ئەنفالەکان بسەپێنێ بەسەر گەلەکەمان، وە سیاسەتی جینۆساید بگەێنێتە دوا سلوکی خۆی لە تەفروتوناکردنی خەڵکی کوردستان، وە دێهاتەکان کە ماونەوە بەتوندی بەچەکی کیمیاوی بە هەموو چەکە کۆکوژییەکانی کەوتە گیانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، وە وای کرد کە بەڕاستی هەڵ و مەرجێکی عەسکەری و سیاسیی ئەوتۆ بخولقێنێ، بەڕاستی دۆزەخێك بوو بۆ خۆی ئەو هەڵ و مەرجە، بزووتنەوەی چەکداری گەلەکەمان بەهەموو هێزەکانیەوە تووشی شکستیەکی گەورەهاتن، پاشە کشەیەکی گەورەیان کرد، بەڵام خۆش بەختانە بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا دوای گەورەترین کارەسات دیاربوو بزووتنەوەی کورد دەرسی لەهەموو شکستەکانی مێژوو وەرگرتبوو چۆکی بەتەواوی دانەداو بەشێوەی پارتیزانی درێژەی بە خەبات دا، هەتا توانی خەبات و درێژەی خەبات بگەیەنێتە ڕۆژگاری داگیرکردنی کوێت، وە لێرە بەدواوە دەرەتانی فراوانتر بۆوە، ئەوساتە بوژانەوە بۆ زەمینە خۆشکردنی ڕاپەڕین سازبوو.

پ٢/ هۆکارەکانی ڕاپەڕین، بەهەموو لایەنەکانیەوە، تۆ بەشێوەیەکی گشتی بۆچی دەگەڕێنیتەوە؟

و/ من بەش بەحاڵی خۆم هۆی سەرەکی ڕاپەڕین ئەگەڕێنمەوە بۆ، بۆ ئەوەی کە گەلی کورد وەکو گەلێکی ژێردەستە، ڕژێمی عێراقی قبوڵ نەبوو لە کوردستانا، ڕاستە گەلێك بووین ژێردەستە بووین، ڕاستە گەلێك بووین ڕژێمی عێراق حوکمێکی عەسکەری وە شۆڤێنی وە فاشیانە ڕەفتاری لەگەڵ دەکردین، بەڵام ناخی گەلەکەمان نەبەزی بوو، ویژدانی گەلەکەمان نەبەزی بوو، وورەی گەلەکەمان جۆشی دەخوار بۆ ئەم ڕژێمە، بۆ هەلێك دەگەڕا، ئەم ڕق و کینە پیرۆزەی کە لەهەناوی ئەم گەلەی ئێمە کە پەنگی خواردبوو بەرامبەر بە داگیرکەر بۆ دەرەتانێك بۆ هەڵ و مەرجێك دەگەڕا کە بتەقێتەوە، هەڵ و مەرجی داگیرکردنی کوێت ئەو دەرەتانەی ڕەخساند، گەلەکەمان ئەو ڕقە پیرۆزەی بە درێژایی ساڵانی ڕابردوو پەنگی خواردبوو تیایا کۆیکردبۆوە بۆ ئەوەی بیتەقێنێتەوە بەرامبەر بە ڕژێم، تەقاندیەوە، وە تەقاندنەوەی ڕق و قینەی خەڵك بەرامبەر بە ڕژێم لە هەڵ و مەرجی داگیرکردنی کوێت، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گەلێکی ژێردەستە دەسەڵاتی داگیرکەر قبوڵ ناکە، مافی سیاسیی خۆی ئەبێ وەربگرێ، چارەنووسی خۆی ئەبێ بەدەستی خۆی دیاری بکا، وە ئەوەش بەرەو ئازادی و بەرەو دیموکراتی بڕوا، هەموو ئەو ئاواتانە لەناو کورد بوون بەهۆی ئەوەی کە ڕابپەڕێ.

پ٣/ ڕۆڵی مستەشارەکان لە ڕووداوەکاندا، ئایە پاڵنەری نەتەوایەتی بوو؟ یان لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆگونجاندن و بەڕێکردنی دۆخەکەبوو؟

و/ لە حەقیقەتا بەشی زۆری ئەو مستەشارانە بەهۆی جەنگی عێراق‌و ئێرانەوە تێوەگلابوون، نەك وەكو خیانەت لە شۆڕشی كوردستان، چونكە بەشی زۆریان پێوەندیان بە شۆڕشەكەوە هەبوو، (مستەشارەكان ئەڵێم نەك قوەت خاصەكان‌و مەفاریزی خاصەو ئەوانە)، ئەو مستەشارانە من ئاگادارم بەشێكی بەرچاویان پێش ئەوەی چەك هەڵگرن هاتن ڕەزامەندی سەركردایەتی (ی.ن.ك)و جەنابی مام جەلال یان وەر ئەگرت، زروفێك لە جەنگی عێراق‌و ئێرانا پەیدابوو بوو كە بەڕاستی خەڵك لەبەردەم دوو ڕێیانێكا بوو، دوو ڕێیانی ئەوەی یان ڕژێم ئەیكوشت یان ئەبێ خۆی بگونجێنێ، شۆڕشیش نەی ئەتوانی، (ی.ن.ك) نەی ئەتوانی (١٠٠-٢٠٠) هەزار چەكدار دابین بكا، وە قیادەی (١٠٠-٢٠٠) هەزار چەكدار بكا، چونكە ئیمكیانەتی ئەوەمان نەبوو، لەبەر ئەوە ئەكرێ ئینسان سەبارەت بە مستەشارەكان، هەڵو مەرجی جەنگی عێراق‌و ئێران بێنێتە پێشەوە زیاتر.

پ٤/ بەڵێ كاك بەختیار مەبەستی من ئەوە بوو لەكاتی بەژداریكردن لە ڕووداوەكاندا، خۆ دەربازكردن بوو لەو دۆخە بەشێوەیەكی كاتی؟ یان هەستێكی نەتەوایەتی پاڵنەربوو بۆیان كە بەژداری تیادا بكەن؟

و/ من ئەڵێم كە جەماعەتێك بە ناچاری چوو بوونە پاڵ ڕژێم، بە بێگومان فرسەتێك بێتە پێشەوە، هەوڵ دەدەن بیسەلمێنن كە ئەوانە خائین نین سەبارەت بە گەلەكەیان، بگرە دیفاعیش لە گەلەكەیان ئەكەن.

پ٥/ كاك بەختیار سەبارەت بەوەی كە ئاماژەت پێدا، كە مستەشارەكان بەرلەوەی چەك هەڵگرن‌و ببن بە مستەشار، پرسیان بە سەركردایەتی (ی.ن.ك) كردووە یان هێزە سیاسیەكانی تری كوردستان، دەكرێ چەند نمونەیەكمان لەو مستەشارانە پێ بڵێی؟

و/ وەڵڵاهی بەشێکی زۆری مستەشارەکانی سلێمانی ئەو پرسەیان ئەکرد، ئەوەندەی من ئەزانم لە هەولێریش ئەهاتن پرسیان ئەکرد، لە گەرمیانیش ئەهاتن پرسیان ئەکرد.

پ٦/ مەبەستم ئەوەیە نمونەمان نیە تا بەناو ناویان بهێنی؟

و/ ئەتوانم بڵێم لە ٨٠٪ی ئەهاتن پرسیان ئەکرد.

پ٧/ حیزبە ئیسلامیەکانی ئەوکاتەی کوردستان، تا چەند ڕۆڵیان هەبوو لە ڕاپەڕین دا؟

و/ خۆی تۆزێك جموجۆڵی نهێنی هەندێك لە ڕەوتی ئیسلامی هەبوو، بەڵام وەکو هێز لەدوای کارەساتی هەڵەبجە "مەبەستی کیمیابارانکردنی ١٩٨٨/٣/١٦ ە" بزووتنەوەی ئیسلامی نیمچە هێزێکی بچوکی دروستکرد، وە مەقەراتی عەلەنی لە ئێرانا دروست کرد، ئەگینا لە کوردستانا مەقەراتیان نەبوو لە پێش کارەساتی هەڵەبجەو کیمیابارانو ئەنفالو ئەوانە، لەدوای ئەوە دووسێ مەقەرێکیان هەبوو لەسەر سنوور، ئەویش لەسنوور لەودیو، وە کەوتنە جموجۆڵ هەتا لە ڕاپەڕین دا ئەوان توانیان هەڵ بقۆزنەوە بۆ ئەوەی پەرە بەکارەکانی خۆیان بدەن.

پ٨/ واتە بەژداری بەرچاویان هەبوو لە ڕاپەڕین لەکاتی ڕاپەڕین دا؟

و/ زۆر کەم.

پ٩/ ڕۆڵی ڕاگەیاندنی حیزبە کوردیەکان، (پێش ڕاپەڕین، لەکاتی ڕاپەڕین )دا، وەکو (ڕادیۆو بڵاوکراوە) چۆن بوو؟

و/ زۆر زۆر کاریگەریان بینیوە، بەتایبەتی ئێزگەی ی.ن.ك سات بەسان لەگەڵ ڕاپەڕینو ڕێنوێنی ڕاپەڕینو ئاراستەی ڕاپەڕین بوو، وە ئەی توانی هەواڵەکان لەدەستو بردێکی باشا بگەیەنێ، جیهاز هەبوو لەناو

شارەکانی کوردستان، لە شاخەکان لەلای پێشمەرگەکان، جیهازی ڕاکاڵ هەبوو، هەموو چارەگ سەعاتێك هەواڵی ئەگەیاندە ئێزگە، وە ئێزگە ئەی توانی هەواڵەکە بە هەموو کوردستاندا پەخش کا، وە کاتێك کە خەڵکی هەولێر ئەی زانی کە سلێمانی ڕاپەڕیوە، کە سلێمانی ئەی زانی کە ڕانیە ڕاپەڕیوە، کە ڕانیە ئەی زانی فلان شار ڕاپەڕیوە، ئەمە ئیتر ئەبوو بەهێزێکی زۆر بەقوەت، کە بەوورەیەکی زیاتر درێژە بە ڕاپەڕین بدرێ، بەڵام ڕاپەڕین ئەگەر لە دەروازەی ڕاپەڕین بەرپابوایێ و شارەکانی تر بەتەنگیەوە نەچووبایێ و وە هەواڵیان نەزانیبایێ، وە بەیەکەوە کاریان لەیەك نەکردبایە، بێگومان ئاسان بوو بۆ ڕژێم لەشوێنێك بتوانێ ڕاپەڕینەکە دابمرکێنێتەوە.

پ١٠/ بەڵێ کاك بەختیار مەسەلەن پێش ڕاپەڕین ی.ن.ك لەڕێگەی الشرارەوە هەواڵەکانی بڵاودەکردەوە، ئایە لەکاتی ڕاپەڕین بڵاوکراوەی لەم جۆرە هەبووە؟

و/ لەکاتی ڕاپەڕین دا اعتمادی گەورە لەسەر ئێزگە دەکرا، ئێزگە ڕۆڵی هەموو بڵاوکراوەکانی ئەبینی، بەیاننامە دەرئەچوو ئێزگە دەیخوێندەوە، لەشارەکان بەیاننامە دەرئەچوو تەوجیهاتی نهێنی دەر ئەچوو، بە ڕەمز ئێزگەکە هەموو مەفرەزەکانی پێشمەرگەو هەموو مەفرەزەکانی مستەشارەکان کە سەر بە یەکێتی بوون، وە هەموو ڕێکخستنەکانی ناو شاری ئاگادار دەکرد، ئەوانیش بەپێی ئەو ڕەمزە هەڵەسان بەجێ بەجێ کردنی نەخشەکە.

پ١١/ هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین بەگشتی بۆچی دەگەڕێتەوە؟

و/ هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین، پێش هەموو شتێك ئەگەڕێتەوە بۆ شکستی ڕاپەڕین لە خوارووی عێراق، کە لە خوارووی عێراق کە

ڕاپەڕین شکا، حکومەتی عێراقی توانی پڕ تر بێتە سەر کوردستان، ئەمە یەك، وە شکستی ڕاپەڕین لە خوارووی عێراق وە پاشان لە کوردستانیش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەڕاستی ئەمەریکا لەدوای ئەوەی عێراقی لە کوێت دەرپەڕاند، شەڕی ڕاگرت، وە اتفاقی کرد لەگەڵ حکومەتی عێراقی، کە اتفاقی کرد لەگەڵ حکومەتی عێراقی ئەو اتفاقە ڕێگەی دا بە حکومەتی عێراق سوپا ئاڵوگۆڕ پێ بکات، وە هەلیکۆپتەریش بەکاربهێنێ، ئەمە یەکێك لە خەتەرناکتریتن قەرارەکان بوون کە حکومەتی عێراق فێڵی لە ئەمەریکا کرد لەدوای وەستانی شەڕی کوێت، ئەمانە هەموو، جگە لەوەش هەندێك لە دەوڵەتانی ئیقلیمی هێزی خۆیان وە دۆستەکانی خۆیان ناردەوە بۆ عێراق، غرب وە ئەمەریکا وە وولاتانی عەرەبی زۆر ئەترسان لەوەی بابلێین هێزی ئیسلامی تر بێتو حکومەتی عێراقی بگرێتە دەست، لەبەرامبەر ئەوە وەستا ئامادەنەبوو ئیتر ڕاپەڕین بگەیێنێتە سەرکەوتن.

پ١٢/ کاك بەختیار ئایە لەکاتی ڕاپەڕین هیچ پەیوەندیەك هەبوو لەگەڵ خوارووی عێراق؟

و/ پەیوەندی هەبوو لەبەینی مجلسی اعلاو حیزبی شیوعیو بەرەی کوردستانیو ئەگینا لەگەڵ ئەوەی کە خەڵك لەخۆیەوە ڕائەپەڕی، فەقەت تەوجیهاتی عامی ئێرگەو ئەوانە مرجع بوون.

پ١٣/ بەڵێ، ئەدی کاك بەختیار، وولاتانی زلهێز بەتایبەتی ئەمەریکا هیچ بەڵێنێکی بە کورد دابوو لەو سەردەمە؟

و/ نەخێر، بەڵێنی کۆنکریتی بە کورد نەدرابوو.

پ١٤/ لەسەردەمی ڕاپەڕین گرنگترین کارێك ئەنجامت دابێتو جێگەی شانازیت بێ؟

و/ من گرنگترین شت کردبێتم ئەوە بوو کە کورد لە شکستابوو زیاتر لە هێزێکی (٤٠٠) چوار سەد پێشمەرگەییمان برد بوو بۆ ئەوەی بتوانین دیفاع لە کەرکوك بکەین، بەداخێکی زۆرەوە نەمان توانی هیچ دیفاعێك بکەین، چونکە شکستەکە زۆر زۆر بە لێشاو بوو، ئەوە گرنگترین ئەرك بوو رام پەڕاند. دووەمین ئەرکم ئەوەبوو لە دووەمین ڕاپەڕانی ڕاپەڕینی خەڵکی شارەکانی کوردستان ئێمە دەوری زۆرمان هەبوو بەڕاستی، ئیشێکی زۆریشم کرد کە گەنجی کورد لەسەر سنوورەکانەوە بنێرینەوەو ڕاپەڕین بەردەوام بێت، وە لەکاتی کۆچیشا یارمەتی زۆری ئەو خەڵکەماندا کە تووشی کۆچ و نەهامەتی و برسێتی و سەرما بوو بوون.

ئینجا جگە لە هەموو ئەوانە من ئەوەڵین کەسم لەدوای ڕاپەڕین کۆڕی سیاسیم خستە ناو خەڵك، یەکەمین کۆڕم لە شەقڵاوە بەست لە ١٩٩١/٨/٢٠، وە دووەمین کۆڕی سیاسیم لە هەولێر بەست، سێیەمین کۆڕی سیاسیم لە سلێمانی بەست، کۆمەڵێك لە زاراوەو لێکدانەوەکانی ئەوکاتە لەسەر ڕاپەڕین، بۆ شکستی خوارد، بۆ هەڵسایەوە، جەنگی سارد چی یە، چارەنووسی کورد لە جەنگی سارد چی بوو، ئەمانە ئەو کۆڕانەن کە یەکەمین جار من هێنامە ناو خەڵك لە دوای ڕاپەڕین.

پ١٥/ لە کۆتاییدا با بپرسین ڕاپەڕین بەلای تۆ چی دەگەیەنێت، ئەگەر بکرێت پێناسەیەکمان بۆ بکەی؟

و/ڕاپەڕین، ڕێگایەکی شۆڕشگێڕانەی ناو شارو دێهاتی کوردستانە، نە خەباتی شاخە، نە خەباتی هێمنانەیە، خەباتی ناوەڕاستی، خەباتی ئاشتیانەو خەباتی شۆڕشگێڕانەی شاخە، هەم شۆڕشگێڕییەتی شاخی تیایە، هەم ڕاپەڕینی هەموو شاری تیایە، وە ئەتوانم بڵێم،

سەرکەوتووترین ڕێگای خەباتی چەوساوەکانو گەلانی ژێردەستەیە، لەپێناوی ئامانجی خۆیان، وە من باوەڕم وایە ئیتر سەردەمی خەباتی شاخو خەباتی چەکداری کۆتایی هات، وە سەردەم سەردەمی ڕاپەڕینی شارەکانی هەموو وولاتانی ژێردەستەو میللەتانی ژێردەستەو چەوساوەکانی ژێردەستەیە.

**سێیەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ (کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی[1])، سلێمانی- ماڵی تایبەتی خۆی، کاتژمێر (١٠)ی سەرلەبەیانی ڕۆژی هەینی، ڕێککەوتی ٢٠٠٢/١١/٢٩:**

**پ١/ سەرەتا بەکورتی بارودۆخی سیاسی کوردستان بەگشتی و بارودۆخی سیاسی هەولێر بەرلە ڕاپەڕینی ١٩٩١ بەتایبەتی چۆن بوو؟**

---

(١) کۆسرەت ڕەسول عەلی: لە ساڵی ١٩٥٣ لە گوندی (شیواشۆك) ی سەر بەکۆیە لە دایك بووە، هەر لە تەمەنی لاوێتیدا بەشداری کاری سیاسی بووەو لە ڕیزەکانی پ. د. ك خەباتی کردوەو بەشداری شۆڕشی ئەیلولی ١٩٧٤ بووە. لە کۆتای ١٩٧٥ دا ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی لینینی بووە، لە ١٩٧٦ دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان بووە، لە ١٩٧٧ ڕژێمی بەعس زیندانی کردوەو دووچاری ئەشکەنجەیەکی زۆر بۆوە، بەڵام ئەو پەڕی خۆڕاگری نواند، لە ١٩٨١ بەرپرسی ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردسان بوو لە شاری هەولێر، لە کۆنگرەی سێ یەمی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٨٣ بەئەندامی سەرکردایەتی ی. ن. ك هەڵبژێردرالە ساڵی ١٩٨٤ بوو بە بەرپرسی مەڵبەندی سێ تا ١٩٨٨. لە ڕاپەڕینی ١٩٩١ وەك ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی ڕزگارکردنی شاری هەولێرو دەوروبەری بوو، هەروەها بەرپرسی بەرەی کوردستانی بوو. لە ١٩٩٣ بوو بە سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان تا ١٩٩٦، دواتریش لە ئیدارەی سلێمانی ١٩٩٦ – ٢٠٠١ سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، لە ٢٠٠١ بوو بە بەرپرسی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی لە ٢١/ ٦/ ٢٠٠٦ بوو بە جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان ولەهەمان کاتدا جێگری سکرتێری گشتی ی. ن. ك، دەرچووی پەیمانگای کشت وکاڵیە وتابلێ ی پیاوێکی چالاك وبوێرو جەماوەری یە. وەرگیراوە لە: (جەمال فتح اللە تەیب: بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان (١٩٧٥-١٩٨٠) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە، تێزی دکتۆرای بڵاونەکرایەوە، لە بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی ، ٢٠٠٩).

و/ بارودۆخی کوردستان ئەوەبوو پاش ئەوەی کە ئەنفالە بەدناوەکان دەستی پێکرد لە ساڵی ١٩٨٨، کارەساتەکی گەورەبوو کە بەسەر میللەتی کورددا هات، یەکەمین جارە کە حکومەت هاولاتی خۆی ئەنفال بکات و بەچەکی کیمیاویی لێی بدات، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو گوندەکان تێکدراو سوتێندراو خەڵکەکەی ئەنفالکرا، هێزی پێشمەرگەش ئەوەی کە هێزە ئەساسیەکە بوو گەڕایەوە سەر سنوورەکان و بەشێکیشی بەشێوەی پارتیزانی مانەوە.

ئەویٚ ڕۆژیٚ ئەگەر مقارنەی بکەی بەشۆڕشی ئەیلول لەساڵی ١٩٧٥ کە شۆڕش تێکچوو، ساڵی ١٩٨٨ کارەساتەکە زۆر قورستربوو، چونکە هیچ دیٚهاتێکی کوردستان نەمابوو، حکومەتی عێراقی پشتیوانیەکی گەورەی هەبوو لەلایەن دەوڵەتەکانی جیهانەوە، لەلایەن دەوڵەتەکانی مەنطیقەوە، هێزێکی سەربازی زۆر گەورەو بەهێزی هەبوو، کە (٤٠) فرقە عەسکەر بوون، زیاتر لە (٣٧٠) فوجی خفیفە بوو، وە بەهەزاران دەبابەو تانک و تۆپخانەی هەبوو، بەڵام خەڵکی کوردستان ئیرادەیەکی بەقوەتی هەبوو لەنێوان لایەنە سیاسیەکان بەتایبەتیش (ی.ن.ك)، کە هەموو خەڵکی کوردستان دەزانێت کە هێزەکانی (ی.ن.ك) چەندە بەهێزو بەتوانا بوون، چ لەکاتی ئەنفالەکان و چ لەپێش ئەنفالەکاندا لەساڵی هەشتاکاندا، کە گەورەترین عملیات کرابی لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستان، ئەوەبوو لە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەقیادەی (ی.ن.ك) تۆمارکرایە. هیچ کاتێك ئەوەنەبوو کە مەسەلەن شارو شارۆچکەکان بگیرێت و عملیاتی گەورە بکرێت، ئێمە لەیەك عملیەی گەورەدا کە سەری ڕەشمان گرت قصری صیفی صدام بوو (مقری اقامەی صدام بوو کە هاوینان دەهاتەویٚ)، (٢٥٠٠) دوو

هەزارو پێنج سەد کلانشیکۆفمان گرت، ئەوەبوو کە ئەنفالـەکان کـران و هێزەکـان چـوونەوە سـەر سـنوور، بـەڵام بـەرەی کوردسـتانی هـەبوو، تەنسیق هەبوو لەبەینی هەموو لایەنە سیاسیەکان، بڕیاری مقاوەمـە درا بەهەموو شێوەیەك.

ئـەوەبوو ئێمـە بەشـێکی زۆری لەپێـشمەرگەکانی خۆمـان نـاردەوە خوارێ، کە هاتنەوە هەندێکیان چونەوە ناوشارەکان و تەسلیم بوونەوە، لەوانـە (هێـزی) شـانەی چـەکدارمان دروسـتکرد بـەناوی (بروسـك)و بـەناوی (هێـرش)و بـە ئـەنواعی نـاو. ئەوانـە معنویاتیـان بـەرزبوو پێشمەرگایەتیان کردبوو، وە تـنظیماتیشمان باش بوو لەهەموو شارو شارۆچکەکاندا، لە بەغدا هەمان بوو لە هەولێر لە سلێمانی لـە دهۆك لـە کەرکوك لەهەموو شارۆچکەکان و ئۆردوگاکان، خۆشمـان بـە بـەردەوامی جیهازمـان هـەبوو لـەخوارەوە پەیوەنـدیمان پێـوەدەکردن، هەنـدەك لـە کادیرەکـانی خۆشمـان نـاردە خـوارێ کـە بـچنەوە سەرپەرشـتی ڕێکخستنی ناوشارەکان بکەن بەشێوەیەکی نهێنی کادیری بەتوانامان نارد.

ئەوەبوو ئەو وەزعە بەردەوام بوو هـەتا صدام کوێتی داگیرکرد، کە صـــدام کـــوێتی داگیرکـــرد، دەرگایـــەکی گـــەورە لـــە بزووتنـــەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد کرایەوە، وە ڕژێمی عێراق کە ڕژێمێکـی مغرور بوو، صدام پیاوێکی دیکتاتۆری بێ ڕەحم بوو، ئەوە بوو هـەموو دونیا کەوتە دژی صدام، کە کەوتنە دژی صدام، ئەمە زانیمـان ئـەوجارە دەبـی شتەك بکەین و ئەو فرسەتە استغلال بکەین، ئەوەبوو ئەمـە پەیوەنـدیمان کـردەوە بەهـەموو ڕێکخستنەکانی خۆمـان، لـە هـەموو شـارەك لەهـەموو شارۆچـکەك لەهـەموو دێیـەك مفـاریزی بـچوك بـچوکمان دروسـتکرد،

گۆتمان بۆ کاتی پێویست کە لەکاتێکدا کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان لە عێراقیاندا، یان عێراقیان دەرکرد لە کوێت، یان ویستیان صدام بروخێنن، ئەمە خۆمان بتوانین شارەکانی خۆمان بە کەرکوکیشەوە ئازاد بکەین.

ئەوەبوو لەبۆ هەموو پارێزگایەك لیژنەیەك دانرا، بۆئەوەی سەرپەرشتی ئازادکردنی بکات بە هەموو ئۆردوگاو ناحیەو شتەکانی، لەبۆ سلێمانی کاك فەرەیدون عەبدولقادر دانرا، لەبۆ کەرکوك کاك ملازم عومەر دانرا، لەبۆ هەولێر ئەمن (کۆسرەت رەسول عەلی) دانرام، لەبۆ دهۆکیش مامۆستا نازم دانرا. ئەوەبوو هاتینە خوارێ، کە لەعێراق درا وەزع لەشیرازەی خۆی تێکچوو، کەتێکچوو ئەمە پێشمەرگەکانی خۆمان لەهەموو ئۆردوگاو شارەکاندا ووریا بوونەوەو گورج و گۆڵ کردەوە، خۆشمان ئەوەبوو کە مفاریزەکانی کەهەمان بوو لە پێشمەرگە دێرینەکان لەمنطقەی دۆری شاوریێ و لە ڕانیە لە (٥)ی مانگی (٣)ی ١٩٩١ لەوێندەرێ مشکیلەیەکی بچوك لەناوبازار ڕوویدابوو، ئەوەبوو قۆستیانەوەو پەلاماری دامو دەزگاکانی حکومەتیاندا لەشاری ڕانیە، بەقیادەی شەهید عەلی نەبی و عەلی مام ڕەسوڵ و وەچەندین کۆنە فەرماندەی تری پێشمەرگەو تنظیماتەکانمان، ئەمە خۆشمان جیهازەکمان هەبوو لەوێندەرێ، ناردمانە خوارێ تا استفادەی لێ بکەن، هەواڵی داینێ کە مەسەلەکە تەقیەوە، کە تەقیەوە، ئەوەبوو ڕۆژی دووەم ئەمە بەڕێکەوتین لە بەینی خۆمان کە مقرمان لە زەڵێ بوو، لەبەینی خۆمان و قەڵادزێ معسکری لێ بوو، لەمنطقەی سوێنێ و قەبری عوسمان و لەخوار چیای مامەندەوە پەلاماری دراو ناوچەکە ئازادکرا، وە برادەرانی خۆمان سیارەیان لەبۆناردین لە ڕانیەوە، ئەوانەی کە

پەیوەندیمان پێیانەوە هەبوو، ئەمە هاتینە ڕانیە، کە هاتینە ڕانیە خەڵکەکە زۆر زۆر خۆشحاڵ بوون، پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین بەچەپڵەو چەپڵە ڕێزان و هەل هەلەوە.

کە هاتینە ڕانیە کۆبونەوەیەکمان کرد، شەوێك لەوێندەر بووین، سبەینێکە چووین هێزەکانی خۆمان کرد بەدوو بەشەوە، کردمانە دوو بەش، بەشەکی لەبۆئەوەی کۆیە ئازاد بکەو بەشەکەی تریش شەقڵاوە، لەبەرئەوەی شەقڵاوە موقعەکی مهمی هەبوو مقری لیوا بوو، (٣) فرقەی قواتی فیلقی (٥) لەسەرەوەبوو، یەکیان لە (برسلین) بوو، یەکیان لە (سیدەکان) بوو، یەکیان لە (سپیلك) بوو، گوتمان ئەو سێ فرقەیە لە فەیلەق دابپڕێنین کە فەیلەق لە هەولێرە، ئەوەبوو هاتین، ئەمە خۆمان پێشمەرگەکانی خۆمان بە هاوکاری هەندەك شارەزاو پێشمەرگەکانی کە تنظیماتی کە هەمان بوون لە گوندی کاوانیان، شەقڵاوەمان بەشەڕ ئازاد کرد، یعنی شەقڵاوە کە ڕۆژی (٨)ی مانگ (مەبەست لێی ١٩٩١/٣/٨ە) ئازادمان کرد، هیچ ڕاپەڕین و شت نەبوو لە وێندەرێ کە شەقڵاوەمان ئازادکرد، جوابمان نارد لەبۆ برادەرانی خۆمان پێشمەرگە کۆنەکان لە تنظیماتی ناوشار، ئەو سەردەمە مسئولی ڕێکخستنی ناو هەولێر (مەلا قادر) بوو برای شەهید (عەبدولرەزاق)، ئێستا ئەندامی مەکتەبی پەیوەندیەکانی دەرەوەیە(مەبەستی کاتی ئەنجامدانی ئەو چاوپێکەوتنەیە)، مەلا قادر لەناوهەولێر مسئولی ڕێکخستنی هەبوو (ی.ن.ك).

ئێمە لەدوو مەلا قادر مان نارد، هات لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تر، یەك لەوانە لەبیرم بێ (بەختیار کاوانی کە بەخەمان پێ دەگوت)، قسەم لەگەڵ کردن، گوتم ئەنگۆ بڕۆنەوە، هەندەك چەکیشمان گرتبوو،

ئەو چەکانەم داپێیان لە شەقڵاوە گۆتم باچەکتان زیاتر ببی، بڕۆنەوە کە برقیەم لۆکردن (لە باوکی ڕێناسەوە لە بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بروسك تکایە دەست بەکاربن)، ئەنگۆ دەست بەکاربن. ڕۆژی ٩ی مانگ (١٩٩١/٣/٩) مصیف گیراو هێزەکەشم لە شەقڵاوە کردە دوو بەشەوە، بەشێکیانم بەشێکیانم لە بۆ شپیلك‌و لای حەریرو سەرەوە....

پ٢/ ببورە کە قسەکانت دەبڕم، ئایە تۆ پێت وتبوون کە لە چ کاتێکدا ئەو بروسکەیەی کەدات نابوو بۆیان پێیان ڕادەگەیەنی، واتە کاتەکەت بۆیان دیاری کردبوو؟

و/ مەبەستم بوو کە ئەمە زۆر لە هەولێر نزیك بکەوینەوە، ئەوکاتە ئەوان یعنی دەست بەکاربن، چونکە لە (٢و٤)ی مانگ ئەوان ویستیان دەست بەکاربن، بەڵام هەندەك مەفرەزە خاصەو پیاوی خراپی سەر بە ڕژێم لێ یان دان‌و چەند کەسێکیان شەهید کرد، بۆیە پێیان نەکرا.

پ٣/ واتە دوای ئازادکردنی شەقڵاوەو دەوروبەری بەرنامەیەکی تایبەت هەبوو بۆ گرتنی هەولێر؟

و/ بەڵێ، بەرنامە هەبوو، بەرنامەکە ئەوەبوو کە باسم کرد، کاتێك کە برادەرانی خۆمان، مەلا قادرو بەخە (مەبەست لێی بەختیار کاوانی ە)و چەند برادەرێکی تر هاتن بۆ شەقڵاوەو چەکم دانێ، ئەو چەکە زیادانەی کەهەمان بوو دامنێ‌و وتم بیبەن بۆ ناو هەولێر، وە ئەمە ڕۆژی (١٠)ی مانگ دێین هەولێر دەگرین، بەڵام ئەمن خۆم حەزم کرد بیخەمە (١١)ی مانگ (واتە ١٩٩١/٣/١١)، لەبەرئەوەی (١١)ی مانگ ڕۆژی بەیانی ١١ی ئازار بوو، چونکە بەیانێکی مێژوویی بوو کە حکومەتی عێراقی اعترافی بە حوکمی زاتی کرد بۆ کوردستان، لەبەرئەوەش خستمە (١١)ی مانگ،

دەنـا دەمـان تـوانی (١٠)ی مـانگیش هـەولێر بگـرین، بـەڵام ووتم لـەو ڕۆژەدا هەولێر دەگرین کە ئەو ڕۆژەی ئەو بەیانەی تێدا دەرچووە.

هێزەکـانیش هێـزی اساسـی (ی.ن.ك) بـوو، هەرچـەندە هەنـدێك مفـاریزی بـچوك بـچوکی لایەنـە سیاسـیەکانی دیکـەی کوردستانیـشی بەگەر کەوتبوو، ئەگینا ئەوی تر اعتمادمان لەسەر خەڵك بوو.

ئەوەبوو کە هێزەکانمان لە شەقڵاوە کردە دوو بەش، بەشێکی لە بۆ حـەریرو سـپیلكو ئـەو نـاوە، ئـەو شـەوە لـە شـەقڵاوە تقریبـەن (١٠٠) کاغەزم زیـاتر نووسـی، لـە بۆ هـەموو سـەرۆك عەشـیرەتەکان، پێـشتریش نامـەمان لـە بـۆ نـاردبوون لەسـەرەوە لـە زەڵـێ وە لـە بـۆ هـەموو سـەرۆك عەشیرەتەکان، کە بۆمان نوسیبوون ئێمە هاتووینەتە منطیقەکەو تعاون بکەن، لەوانـەش، لـۆ: ( حسێن ئاغـای سەرچیاو عومـەر ئاغاو محەمـەد قـادر ئاغـای هـەرکیو ئەحمـەد لاوکـۆو کـەریم خـانی برادۆسـتو قـادر بـەگی برادۆسـت، هـەروەها عەشـیرەتەکانی تـری ئـەو ناوچـەیە، لـە بـۆ هەموویان نامەم نووسی.

ئەوەبوو ئەمە هاتین ڕۆژی (١٠)ی مانگ لـە مـصیف بووین، مـصیف گیراو کۆڕێ گیراو لەسـەرەوە سـپیلك گیراو بێخمـە گیراو پاشـان ووردە ووردە هەمووی ئازاد بوو، ئەمەش ئۆردوگای بەستۆرە لەوێندەرێکە کە هاتینە وێندەرێ قەصفێکی زۆرمان لەسەر بوو، قەصفەکە لەخانزادەوە قەصـفیان دەکردین‌ونـەیان دەهێـشت هێزەکانمـان بـەرەو هـەولێر بـێ، ڕۆژی ١٠ی مـانگ ١٠-١١ی مـانگ ئێوارەکـەی ئـەمن هاتمـە خـوارێ قەصفیان زۆر کردین، ئەمن کاك (بورهانی سەعید صۆفی)م نـارد، گۆتم بڕۆ لەلای پشتەوە بەناوی چەکدارەکانی (شێمەی هاڕون) کە ئێستا لای (مەلا ئۆمەرن)، بڕۆ بڵێ ئێمە جماعەتی وانین، تازە تاریك داهاتبوو، ئەو

تۆپو عەسکەرانەی کە ڕێگایان گرتیە، دەرگای ڕێگاکە نەکرێتەوە ئێمە ناتوانین بڕۆین بە سیارەو بەپێش نابی، لەبەرئەوە بڕۆ بیان هینەو بەناوی ئەوانەوە "واتە چەکدارەکانی شێمەی هاڕون" بڕۆلایان، ئەویش چوو، ووتبووی من جماعەتی (بەهرامی شێمەی هاڕونم)، ئەوانیش گوتبوویان فەرموو، چوو بوو کە گەیشتبووە ناویان، ووتبووی چەکەکانتان دانێن. کاتێکمان زانی بورهان "واتە بورهانی سەعید صۆفی" ئەو تۆپو جێبو سەربازانەی کە لەوێ بوون هەموویانی هێناو کە هینانی، لەوێندەر هێزەکانمان کرد بە دوو بەش:

بورهانمان نارد لە بۆ بەڕانەتیو ئەوەی باقیەکەی تریش لە بۆ ئۆردووگای کەڵەکی یاسین ئاغاو ئۆردوگای بەرحوشترو جەژنیکانو بحرکەو گۆتمان بەڕانەتی بگرەو ڕێی موصڵ بگرن، هێزەکانی تریش کە بورهان سەعید صۆفی تۆپو جبەخانەکەی هینا ئێوارەکەی، من بروسکەکەم لێدا، "لەباوکی ڕێناسەوە بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بروسك، تکایە دەست بەکاربن"، ئەوەبوو ئەمە خۆمان گەیشتینە ناو هەولێر، وە هەموو شانە چەکدارەکان لە کاتژمێر (٦)ی سبەینێ دەست بەکاربوون، ئەمەش کاتژمێر (٦،٣٠) یان (٧) گەیشتینە (دواجن)و کە نزیکەی (٥-٦) دەبابەی لێبوو، ئەو دەبابانە تێك شکێندران، وە ئێمە داخلی ناو هەولێر بووین، کە داخلی ناو هەولێر بووین، بووین بە دوو ڕەتڵ، ئەمن خۆم چوومە لای سەر (فەیلەق)، فەیلەقی (٥)و مجلسی تشریعیو تنفیزیو منظمەی استخباراتی شمالی (شەهید عەبدولڕەزاق)مان ناردە سەریانو گۆتمان ئەنگۆ بڕۆن ئەو جێگایانە بگرن، ئەوەبوو لۆ کاتژمێر (٣،٣٠) خەڵکی هەولێر زۆر قارەمانانە بە ژنو بە پیاوو بە هەموو چینو توێژە جیاوازەکان، سیاسیو غیر

سیاسیی بەشداریان کرد لە ڕزگارکردنی هەولێر، وە هەوێنی ڕزگارکردنی هەولێر پێشمەرگەکانی (ی.ن.ک) بوو، شانە چەکدارەکانی (بروسك) بوو.

پ٤/ ئایە ڕۆڵی مستەشارەکان لە ڕاپەڕیندا، بەهۆی پاڵنەری نەتەوایەتی بوو، یان لۆ خۆگونجاندن بوو بە تێپەڕبوون لەگەڵ ڕووداوەکاندا؟

و/ خۆی یەکەمیان بارودۆخە موضوعیەکە بوو، یەعنی ئەوان پێیان وابوو کە صدام نامینیّ و تەواو بووە، وە زەختی جەماوەریش ئەوەندە زۆر بوو نەیان توانی خۆیان لەبەر ئەو شەپۆلە بگرن، ناچار بوون بەلای شۆڕش و بەلای جەماوەر داهاتن.

پ٥/ حیزبە ئیسلامیەکانی ئەوکاتەی کوردستان کە بوونیان هەبوو، تا چەند ڕۆڵیان هەبوو لە ڕاپەڕین؟

و/ وەڵلاهی دەتوانم بڵێم داینەمۆو محرکی ڕاپەڕین، شانە چەکدارەکان و ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك) بوو، چونکە ئەو سەردەمە مفاریزی پارتیزانی بەس یەکێتی مابوو لەخوارەوە، هیچ حیزبێکی سیاسیی یان حیزبێکی غیر ئیسلامی یان ئیسلامی یان عەلمانی و هیچ کەسێکی ترو لایەنە سیاسیەکانیش، هیچ یەکێکیان مفاریزی پارتیزانیان نەبوو، ئەمە مەلا سلێمان و ئەوان لەخوارەوە بوون، پێشتر شەهید هاشم وان شەهید بوون، دواتر کاك ڕێباز عەبدوللا لەوێندەریّ لەو ناوەبوو، دوایە پارتیزانەکانمان (حەسەن نێرۆیی) شەهید حەسەن لە ناوچەی بادینان بوو، دوایی لەخوارەوە لەولاوە عوسمانی حاجی مەحمود بوو، شەهید حەمە ڕەش بوو، مەحمود سەنگاوی بوو، ئەوانە هەموو لە پارتیزانەکانی گەرمیان بوون، شەهید (غەریب هەڵەدنی) مان

لە شارباژێر بوو، ئەوە جگە لەوەی لەو (٣) ساڵەی (پێش راپەڕین) کە ئەنفالیش دەستی پێکردوو کە گەڕاینەوە سەر سنوورەکانیش پێشمەرگەمان هەر لەخوارەوە هەبوو، ڕێکخستنەکانیشمان بە بەردەوامی بەریدیان لە بۆ دەناردین و ئیش و کارەکان ڕێك و پێك بوو.

بۆیە لایەنە سیاسیەکان (ئیسلامی) ئەگەر هەش بووبی بەتاك و تەرابووە، واتە ئەوە نەبووە بەمێژێکی گەورەوە بەشداریان کردبی (لە راپەڕیندا).

پ٦/ ڕۆژی ١١ی ئازار، ڕۆژی راپەڕینی هەولێر، هیچ شوێنێکی ناو شار بەتایبەت دەست نیشانکرابوو کە یەکەمجار هەڵمەتی بکرێتە سەرو ئازاد بکرێت؟

ئێمە دیاریمان کردبوو کە لەیەك کات و ساتدا لەهەموو شوێنەکان دەست پێ بکەن، لە هەموو مخفرەکان و لە هەموو بارەگاکانی حیزبی بەعس بدەن و لە هەموو شوێنەکانیاندا، بەتایبەتی کە دەستی پێکرد زۆرتر (مخفری ئیسکان و مخفری لای بەنزینخانەی کۆن و ئەو ناوە زووتر ئازاد بوون لەگەڵ فرقەی فاروق).

چونکە خۆت دەزانی چەندین مقراتی حیزبی بەعس هەبوو، لە هەولێر (شوعبەیان هەبوو، فرقەیان هەبوو، فرعیان هەبوو). هەولێر مەرکەزێکی گەورەی بەعس بوو، بەحوکمی ئەوەی کە مرکزی حوکمی زاتی کارتۆنی بوو، مرکزی فەیلەقی (٥) بوو، مرکزی استخباراتی شمالی بوو، مرکزی زۆربەی کادیرە خراپەکانی بەعسی خەڵکی شارەکانی دیکەی عێراق لە هەولێر خریان کردبوونەوە.

پ٧/ هەستی جەماوەری شۆڕشگێر لە کاتی راپەڕین دەتوانی چۆن هەڵی سەنگێنی؟

و/ ئەوەی دەڵێن جەماوەر، بەژیانی خۆم نەم بینیوە کە خەڵك بە ژن‌و پیاویەوە ئازاو مزەحی‌و فیداکاربی لە بۆ ئەوەی کە ئەو شارە ڕزگاربی. بەبێ قەیدو شەرت ژن‌و پیاوو منداڵ‌و هەمووی کە ئێمەیان بینی هاتنە دەرێ، کە شەڕ بوو، هەلیکۆپتەر ناو شاری قصف دەکرد، قەلاتی قصف دەکرد، بەتۆپ لێیان دەداین، بەهەموو شتەك، بەلام خەڵك وورەی زۆر بەرز بوو.

پ٨/ئاستی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن چۆن بوو؟

و/ ئاخر، ئاستی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن لە فەیلەقی (٥) هەندەك مقاوەمەیان کرد هەتا کاتژمێر (٣)، چونکە قاعد فەیلەق هەلات لەوێندەرێ کە لەگەڵ پارێزگاری هەولێرو ئەوانە لەوێندەرێ کۆ ببوونەوە، منظومەی استخباراتی شمالیش مقاوەمەیان کرد هەتا کاتژمێر (٤)، ئەوانەش لەبەرئەوەبوو خەڵکانی پلە بەرزی مخابرات بوون‌و دەوریان گیرابوو، دەیانزانی هەر دەکوژرێن لۆیە مقاوەمەیان کرد، ئەگەر نا هێزی جەماوەرو قوەتی خەڵك‌و پێشمەرگەو ڕێکخستنەکان وەها تێکەلاو بوو بوو ئەوێ ڕۆژێ وەك ڕۆژی حەشر بوو.

پ٩/ ئەی گەر بزانی زیانەکانی هەردوولا، بەتایبەتی لە هێزی پێشمەرگەو حکومەتی عێراقی‌و ئەو شەهیدانەش کامانەبوون کە شەهید بوون؟

و/ وەڵلا ئەمن پێم وایە زیانی حکومەت خەڵکێکی زۆریان لێ کوژرا لە استخبارات‌و لە ئەمن، چونکە خەڵکەکە زۆر ڕقی لەوانە دەبۆوە، ئەوانی تر بەشێکیان وەك قاعد فەیلەق‌و پارێزگار ڕایان کرد، وە بەشی زۆری لە استخبارات خەڵکیان لێ کوژرا، ناوەکانیانم لەبیرنیە، بەلام

خەڵکی مەدەنیش، هاولاتیش بەهۆی قصفی تەیارەو هەلیکۆپتەرو تۆپخانەی ڕژێم، شەهید بوون، بەلام ئەمە ئەوەی لەگەڵمان بوون لە پێشمەرگەکان بەشەکی زۆریان سەلامەت بوون، کەمیان لێ شەهید بوون.

پ١٠/ چ کەسێکتان کە زۆر دیار بووبێت لە ڕزگارکردنی هەولێر شەهید بووبێت؟

و/ شەهیدی ئەوها دیارمان نەبوو لە ڕزگارکردنی هەولێر، چونکە مسئولەکان کەسیان لێ شەهید نەبوو.

پ١١/ چارەنووسی پیاوانی ڕژێم، هەموو ئەوانەی کە دەگیران هەر کوشتن بوو؟

و/ نەخێر، ئەمە لەپێش ئەوەی کەبێینە خوارێ کۆبوونەوەکمان کرد لەگەڵ بەرەی کوردستانی، بڕیارماندا کە ئەوجارە کوردو کورد یەکتری نەکوژی، داوامان کرد بڕیاری لێ بدەین، ناویشی نەنێین لێبووردن، بەڵکو بڕیارماندا بە ئاشت بوونەوەی گشتی، واتە بڕیاری ئاشت بوونەوەی گشتیمان دا لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە کوردن لەگەڵ ڕژێم هاوکاریان کردووە، پاش ئەوە بەس بێت‌و بگەڕێنەوە ڕیزی گەل‌و ڕیزی شۆڕش‌و کەسیشیان نەکوژرێن. پیس ترین زەلامیان کە (تەحسین شاوەیس) بوو مابۆوە، کە بکوژی (شەهید مامە ڕیشە)و (شەهید سیروان تاڵەبانی)و ئەوانە بوو. وە ئەو ڕۆژە خەڵك بیری لە تۆڵە سەندنەوە نەدەکردەوە، بیری لەوە دەکردەوە کە میللەتەکەی ڕزگاربێ، ئەمەش وا خەڵکەکەمان گۆش کردبوو، وە هەتا خلافات لەبەینی هیچ لایەن‌و پارتێکی سیاسیی کوردستان نەبێ.

ئەمن نمونەکت لۆ باس بکەم، مەفرەزەکی (پارتی) لەگەڵ مەبوو، (جەمال مۆرتکە) پارتی بوو، پێشتریش کە ئەمن دەم ناسی کە لەسنووری ناوچەی مەڵبەندی مەبوو(مەڵبەندی ٣ی هەولێر)، ئەمە کە پەلاماری مخفری تەیراوەماندا، فیشەکێکی زۆر ڕوو بەڕوومان دەهات، ئەو (واتە جەمال مۆرتکە) غاری داو هاتە تەنیشتم، گۆتی ڕاوەستە دێمە پێشت با فیشەکەکان بەمن بکەوی بەتوو نەکەوی، ئەو دەمە ئەوها بوو، واتە ڕوحیەتی هاوکاری لەبەینی بەرەی کوردستانی و لەبەینی پێشمەرگەکان هەبوو. واتە ئەو جیاوازیەی نەبوو(مەبەستی لە جەمال مۆرتکەیە) لەگەڵ شەهید (فاروق) وان کە لەگەڵ من بوون، ئەویش خۆی هەروا حساب دەکرد، پشتی منی ڕادەکێشا دەیگۆت (مەبەستی لە جەمال مۆرتکەیە) فیشەکت با بەر نەکەوی، کە فیشەکمان ڕوو بەڕوو دەهات.

پ١٢/ ئەی ڕۆڵی ڕاگەیاندنی حیزبە کوردییەکان، پێش ڕاپەڕین و لەکاتی ڕاپەڕین، بەتایبەتی ڕادیۆکانیان چۆن بوو؟

و/ دەتوانم بڵێم (ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان) ڕۆڵێکی زۆر زۆر گەورەی هەبوو، لە جۆشدان و خرۆشاندنی جەماوەر، لە جۆشدانی پێشمەرگە بۆ بەرزکردنەوەی ڕوحیەتی خەڵك و پێشمەرگە، کە ڕادیۆکانی تریش ڕۆڵیان هەبوو، بەڵام هەر ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان خەڵك گوێی لێ دەگرت. ئەو سەردەمە تەلەفزیۆن نەبوو"مەبەستی تەلەفزیۆنی حیزبییە لە شاخ"، ڕۆژنامەش نەدەگەیشت، بەڵام ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان بەڕاستی ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە جۆشدان و خرۆشاندنی جەماوەرو وە سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگە.

پ١٢/ ئەی گرنگترین کارێك لەو سەردەمە کە ئەنجامت دابێتو جێگای شانازیت بێت، چی بووە؟

و/ ئەو سەردەمە کە هەولێرمان ئازادکرد ئەوە من مسئولی بووم، دوایی کە وەك باسم کردو گۆتم کاك ملازم عومەر دانرابوو کە کەرکوك ئازادبکە، بەڵام ئیشەکەیان نەکرا، چونکە هێزێکی زۆری لێ کۆکرابۆوە، ئێمە بڕیارماندا لەسێ لاوە پەلاماری کەرکوك بدەین، کاك ملازم عومەرو ئەوان لە (قەرە هەنجیر)، کاك فەرەیدون لە (توز خورماتو)، ئێمەش لە (پردێو دوبسەوە) پەلاماری بدەین.

ئەوکاتە کاك نەوشیروان جێگری سکرتێری گشتی ی.ن.ك بوو، ئەو سەرپەرشتی هەموو یەکێتی دەکرد، ئەو لەگەڵ من بوو لە قۆڵی هەولێر، چووین کۆبونەوەمان کرد لەگەڵ ملازم عومەرو ئەوان لە قەرەهەنجیر حازربن کە پەلاماری شاری کەرکوك بدەن، گۆتیان باشە.

ئەو ڕۆژەی کە دیاریمان کردبوو پێ یان نەکرا، وە کاك فەرەیدونو ئەوانیش نەیان توانی، چونکە (مجاهدین) "مەبەستی موجاهدینی خەلقی ئێرانە" شەڕیان کردبوو، ئەمە چووین کە (٥٠٠) کەسمان خستە ناو کەرکوکەوە، وەشەڕ دەستی پێکرد بەبێ بەرپابونی ڕاپەڕین، چونکە خەڵك نەی دەتوانی بێتەدەرەوە، وە خەڵکی ناو کەرکوك کوردەکان هەموویان زیندانی کرابون پێشتر، ئەوەبوو کە ئەمە ئەو (٥٠٠) کەسەمان کە (ڕحیماوا) مان ئازادکرد هەر چوار دەوریشیان گیرابوو، ناچار ئێمە شەوێ هێرشمان کرد لۆ سەر ئەو ڕەبیانەی (سەر پەلی سێکانیان)و ئەو شوێنەمان هەموو گرت، وە هێزەکانمان لەگەڵ هێزی ناوەند تێکەڵ کردەوە، وە ئەو ڕەتڵەی مە کە شەریکەو بارەگای عەلی حەسەن مەجید (عەلی کیمیاوی)و هەموو شوێنەکانمان گرت...

ئەو ڕۆژەی کە چوومە ناو کەرکوك بەخۆشترین ڕۆژو بە گەورەترین شانازی دەزانم لە بۆ خۆم و لە بۆ بنەماڵەکەم و لە بۆ ی.ن.ك، کە هەموومان ڕۆڵی کاریگەرمان هەبوو لە ڕزگارکردنی کەرکوك.

ئەو سەردەمە کاك نەوشیروان کە لەگەڵ سێکانیان لەسەر بەرزاییەك جیهازمان نەبوو پەیوەندی پێوە بکەین، شەهید فاروق مان دەنارد ئەو هەردەیگۆت ئەتوو شەهید نەبی مشکیلە نیە، ئەوەبوو کاتژمێر (٨)ی شەوێ ناردم لە بارەگای عەلی حەسەن مەجید بووین کاك نەوشیروان هات، ووتارێکی داو گۆتی: ئێوە دەبی کورد هەموو شانازیتان پێوەبکات بۆ یەکەمین جارە کەرکوك ڕزگاردەکرێ، وە ئێوەش ڕۆڵی کاریگەرتان هەبوو لە ڕزگارکردنی کەرکوك. ئەوجا ئەو ڕۆژە ئینسان بەناچاری فرمێسکی دەهاتە خوارێ، کە ببینین کەرکوك کە ئێمە خەونمان پێوە دەبینی، ئەوەبوو بە کوردستانەوە ڕزگارمان کرد.

پ١٤/ جۆری ئەو چەکانەی کە بەکارتان دێنا چی بوون؟

و/ ئەمە کە یەکەمین جاری هاتین هەر چەکەکانی خۆمان پێ بوو، ئاربیجی و هاوەن و شتی وا، بەڵام کە شارەکانمان گرت چەند چەکی گەورە کەوتە دەستمان وەکو تۆپی گەورەو دۆشکەو دەبابەو ...تاد، هەموو ئەو جۆرە چەکانەی چی حکومەتی عێراقی هەبوو، بەجوانی کەوتە دەستمان.

پ١٥/ مەبەستیشم ئەوەبوو ئایە ووڵاتانی دراوسێ یارمەتی کوردی دا لەم ڕووەوە؟

و/ نانا، هیچ یارمەتیەکیان نەداین.

پ١٦/ چالاکیەکانی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکان پێش ڕاپەڕین چی بوون لە هەولێر؟

و/ خۆی ئەمن کاتی خۆی مەسئولی ڕێکخستنی یەکێتی بووم لە هەولێر هەتا ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤، کە لەسەر داوای یەکێتی چوومە دەرێ لە کۆنفرانسی (٣)ی کۆمەڵە بوومە ئەندامی سەرکردایەتی و داوایان لێکردم کە ببمە مەسئولی مەڵبەندی (٣)ی هەولێر. بە حوکمی ئەوەی کە ئەمن لەناو هەولێر تەقریبەن لە ١٩٧٥ەوە تەنزیمی بووم شارەزاییەکی زۆرم هەبوو وە خەڵکی زۆرم دەناسی، وە هەموو شارەزاییەکم هەبوو، بۆیە کاتێك بوومە مەسئولی مەڵبەند، مەفاریزی بچوك بچوکمان دانا لەناو شار، مەفرەزەی سێ کەسی و چوار کەسی، مەسەلەن مەفرەزەی شەهید سەردار سەعید صۆفی و ئەیوب و یوسف و بەختیار کاوانی ئەوانە مەفرەزەیەك بوون، مەسەلەن شەهید ئیبراهیم و شەهید ڕەشۆ و ئەوانە مەفرەزەیەك بوون. ئەنواعی مەفرەزەمان ناردە ناو هەولێر چالاکیان دەکرد بە بەردەوامی، لێدانی پارێزگاری هەولێر و لێدانی مەفرەزەی استخبارات و کوشتنی چەندین لێپرسراوی بەرز بەرزی حیزبی بەعس و چەندین ئەفسەری استخبارات، ئەوانە هەمووی ڕۆڵیان هەبوو لە چالاکیەکانی مەفرەزە سەرەتاییەکان بوون. ئەمن خۆم ئەم بەرنامەیەم دانابوو، ئەمن خۆم لە خوارێ چار ساڵ مسئولی مەڵبەند بووم، چار ساڵان دە ڕۆژ لە بارەگای مەڵبەند نەبووم، هەموو ڕۆژێك لەگەڵ تیپەکان بووم. مەسەلەن تیپی ٨٦، ٨٧، ٨٥، ٩١ هەموو تیپەکان جاری وابوو بەیەکەوە شەڕم پێدەکردن، جاری واهەبوو بە دوو تیپ، جاری واش هەبوو هەموو مەڵبەندەکە، لۆیە ئەمە چالاکیمان زۆر بوو، مەسەلەن تەق تەق مان گرت، دێگەڵەمان گرت، هیرانمان گرت، هێرشێکی گەورەیان لە بۆ کردینە سماقولی نزیکەی (١١) ڕۆژ (١٢) شەو شەڕمان کرد، ئەمە فەیلەقی (٥)و ٢٠٠-٣٠٠ فەوجی جاشمان شکاند،

سەری ڕەشمان گرت کە ٢٥٠٠ کلانشیکۆف لەیەك شەو گرتمان، لەمێژووی بزووتنەوەی کوردی ٢٥٠٠ کلانشیکۆف نەگیرایە لەچالاکیەکدا.

دوو سێ چالاکی گەورەمان کرد لە هەولێر، سەیتەرەی مەغمور، گەڕەکی حقوقین و ڕوناکی لەوێندەر لەچەند مەفرەزەیەکی ئەمن ماندا، وە لە گەڕەکی باداوان و ئەو ناوچانەش بە هەمان شێوە. لێدانی پارێزگار شەهید سەردار سەعید صۆفی و بەختیار کاوانی و ئەیوب بوون لێیاندا، ئەمن ئەو سێ کەسەم نارد لۆ لێدانی پارێزگار، کە ئەوکات سێ منداڵی گچکە بوون.

پ١٧/ زۆر باشە، ئەی ئەو دەستکەوتانەی لە کەل و پەل هاتنە دەست، ئەنجامیان چی بوو بۆ ئێوە؟

و/ خۆی ئەمە بیرمان لەوە نەدەکردەوە کە صدام نەڕوخێ، پێمان وابوو هدفی ئەمەریکا و هاوپەیمانان ڕوخانی (صدام)ە، لەبەرئەوە قبوڵی ئەوەمان کرد هەرچی دەکرێ با بکرێ، پاش ئەوەی کە صدام ڕوخا ئێمە خۆمان وولاتەکەی خۆمان ڕێك دەخەینەوە، لەبەرئەوە بەشێکی زۆری چەك و شت و مەکەکان کەوتە دەست خەڵك، خەڵکیش نەی توانی بەکاری بهێنێ و چەکە قورسەکان هەندێکی هات و هەندێکی بەجێما و کاتێك کە کۆچ ڕەوەکە دەستی پێکرد تەسلیم بە عێراقیان کردەوە.

پ١٨/ ڕاپەڕینی خوارووی عێراق لە ١٩٩١، وەك هۆکارێك بۆ ڕاپەڕین و پەیوەندی بەلایەنە سیاسیە کوردیەکان چۆن بوو؟

و/ ئەمە خۆی کاتی خۆی لیژنەکمان هەبوو، لیژنەکی سێ قۆڵی لەگەڵ ئێمە (مەبەستی ی.ن.ك) و پ.د.ك و ئەنجومەنی باڵا(مجلسی

اعلا)، کە دەعوەو منظمەی عملی اسلامی بوون، بڕیارماندا پێکەوە ڕاپەڕین دەست پێبکەین وە لەیەك کاتدا دەست پێبکەین، بەلاّم بەداخەوە ئەوان دەستیان کرد بە ڕاپەڕین بەمەیان نەگوت، پێمان وابوو عێراق دەگرن‌و هەمووی ئازاد دەکەن، هەتا شکان لە جنوب، ئەوجا هاتن تەنسیقیان لەگەلّ کردین، وەکی شکان لەوێندەرێ هیچیان نەمابوو کە تەنسیقیان لەگەلّ بکەین، دەنا ئەو تەنسیقەی کە هەمان بوو ئەوان بیانکردایە بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك، ئەوان هەتا حلە شیان گرت، لە حلەوە بهاتانایە بەرەو بەغدا ئەمەش کەرکوکمان گرت بەرەو تکریت‌و بەغدا بڕۆیشتانایە صدام دەڕووخا، بەلاّم کە تەنسیقەکەمان هەبوو لەدەرەوە وەختی تەنفیزکردنی ئەوان باش بوو، بەلاّم لەکاتی تەنفیزکردنی کۆتایی گوتیان ئەمە بۆخۆمان عێراق دەگرین‌و خۆمان حوکمی دەکەین، پێشیان نەکراو ئەوەبوو تێك شکان.

پ١٩/ ئەی ڕۆڵی وولاّتانی دراوسێ‌و وولاّتە زلهێزەکان، بەتایبەتی ئەمەریکا؟ ئایە هیچ هاوکاریەکی کورد یان هیچ بەڵێنێکیان بە کورد دابوو؟

و/ نانا، ئەصڵەن پەیوەندی کوردی لە سەردەمی ڕاپەڕین لەگەڵ ئەمەریکا پەیوەندیەکی زۆر بچکۆلاّنەبوو، لەئاستێکی زۆر نزم بوو وەکو ئێستا نەبوو "مەبەستی کاتی ئەنجامدانی ئەو چاوپێکەوتنەیە"، بەلاّم ئەو کەسانەی یارمەتی کوردیان دا لە کۆچ ڕەوەکەو لەو کارەساتەی کە دوای ڕاپەڕین بەدی هات، تورکیا خەڵکێکی زۆری گرتە خۆی‌و ئۆردوگای بۆ دانان، وە ئێران خەڵکێکی زۆری گرتە خۆیی‌و ئۆردوگای بۆ دانان کە یارمەتی مرۆییان داین، دەنا هیچ یارمەتیەکی عەسکەری‌و سیاسیان نەداین.

پ٢٠/ بەڵێ، لەکۆتایی دا هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین بەگشتی و پاشەکشەی هێزی پێشمەرگە لە شاری هەولێر بۆچی دەگەڕێنیتەوە؟

و/ هۆکارەکانی ئەوەیە کە وەکو باسم کرد، ئەمەریکا هۆکاربوو، چونکە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش "مەبەست لێی جۆرج بۆشی باوکە" داوای لەگەڵ عێراقی کرد کە ڕاپەڕین بکەن و حکومەتەکەی دیکتاتۆر بڕوخێنن، بۆیە خەڵك کردی، بەڵام ئەوان بەرگریان لێ نەکرد، بەڵکو ئەوان شەڕەکەیان ڕاگرت، کە وەنەبی شەڕەکەیان ڕاگرت قواتی حەرەسی جمهوری بەسەلامەتی تێ پەڕبوون کە ئەوان پێشتر حەسر بوو بوون لە کوێت، کەچی دەرفەتی دەرباز بوونیاندان، وە هەروەها بڕیارێکیاندا کە هەلی کۆپتەری عێراقی قەدەغەبوو تەیاراتی عێراقی لە ئاسمانی عێراقدا بسوڕێتەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەمەریکا هەلی کۆپتەرەکانیان ئازادکرد، بەو بەهانەیەی کە گوتیان هەلی کۆپتەرەکانیان جەنگی (حربی) نیە، هەلی کۆپتەرەکان ڕۆڵێکی خراپیان بینی لەشکانی ڕاپەڕین، هەروەها کە شەڕیش ڕاوەستا وورەی خەڵکەکە کەم بۆوە، لەبەرئەوە ئەوانە بوونە هۆکاری ئەوەی کە صدام نەڕووخێت و خەڵکەکەش بێ ئومێدبێت و وە قواتی حەرەسی جمهوریش قواتێکی زۆر بوو، ئێمەش خۆمان ڕێك نەکردبوو ماوەکەی کەم بوو تا بەباشی ئەو چەکانەی گرتبوومان و هێزی پێشمەرگەو جەماوەر ڕێك خەین و خەتی بەرگری باش دانێین، کە ئەمانەش بووە هۆی ئەوەی ڕاپەڕین مۆفەق نەبێت، وە کۆچ ڕەوەکە دروست بوو، شارەکان جارێکی تر کەوتنەوە ژێر دەسەڵاتی ڕژێم، وە پاشان ناوچەی خەتی ئامینە دروستکراو جیهان لەسەر کورد بەجواب هات، ئەگەر ئەتوو



بیرەوەرییەکانی (جیمس بیکەر)ت خوێندبێتەوە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا (ئەوکات لە ١٩٩١) بەتەواوەتی تێیدایەتی کە هاتە تورکیا و لە تورکیاوە لەناوفڕۆکە ئەو کارەساتەی گەلی کورد دەبینی لە کۆڕەوەکەو ڕاستەوخۆ بەتەلەفۆن قسە لەگەڵ کۆشکی سپی دەکات لەگەڵ ڕاوێژکاری ئەمنی قەومی و تا قسە لەگەڵ سەرۆک بکات و فریای میللەتی کورد بکەوێ دەنا میللەتەکە لەناو دەچی، لۆیە ناوچەی ئامینە لەسەر ئەو بنەمایە دەرچوو و دانرا، وە سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا (جۆن مێجەر) کە داوای کردوو لە بەریتانیاوە لە ئەنجومەنی ئاسایشەوە کە ناوچەی ئامینە دروست بکرێت لە بۆ کورد دەنا کورد هەمووی تووشی کارەسات دەبی، ئەوەبوو بەهۆکاری ئەوەی جارێکی کەش بارودۆخەکە هەستایەوە.

پ٢١/ مەسەلەی بەرزبوونەوەی توانای هێزی عێراقی و پاشەکشەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئایە بۆچی حیزبە کوردیەکان نەیان توانی بەشێوەیەکی باش کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکەن؟

و/ لۆم باس کردی ماوەکە کورت بوو، وە هێزەکانی عێراق دەستی کرایەوە، هەروەها لەنێوان کەرکوک و تکریت مەعەسکەر خالید هەبوو، کە کاتی خۆشی نیوەی گیراو نیوەی نەگیرا، ئەوەبووە جێگایەکی ناوچەی پەلاماردەری باش و حکومەت لەوێ وە پەلاماری کەرکوکی دایەوە.

پ٢٢/ بەڕێز کاک کۆسرەت من هیچ پرسیارم نەماوە، ئەگەر تۆ شتێکت هەبێ و ئێمە نەمان پرسیبێت یان بە پێویستی دەزانی باسی بکەیت چی یە؟

و/ من زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام ئەوەی کە دەمەوێ لە کتێبەکەت "مەبەستی لێکۆڵینەوەکەیە" بی نووسی باسی (شەهید عەبدولڕەزاق)ە، چونکە کە کەرکوکمان ڕزگارکرد چووینە ناو کەرکوک برایەکی شەهید بوو ناوی (خولە) "مەحمود محەمەد ئەمین"بوو، خۆشی لە بەرگری کردن لە کەرکوک شەهید بوو، کە کاک عەبدولڕەزاق یەکێك بوو لە قارەمانەکانی یەکێتی و میللەتەکەمان و لەناو شەریکەی بارجیوان لە شەریکەی نەوتی کەرکوک شەهید بوو، وە داواشمان لێکرد کە لەوێ نەبێ، بەڵام ئەو لەبەرئەوەی هەر خەڵکی کەرکوك بوو حەزی دەکرد کە لە بەرگری کردن لە کەرکوک لەوێ بێ. من سوپاست دەکەم هیوادارم هەر سەرکەوتوبی.

زۆر سوپاس کاك کۆسرەت

**چوارەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەفین مەلا قەرە)، ڕانیە- ماڵی تایبەتی خۆی، ڕۆژی ؟؟؟ ڕێککەوتی ٣/١٢/٢٠٠٢:**

پ١/ سەرەتا باسێکی کوردستانمان بۆ بکەی بەر لە ڕاپەڕین؟

و/ هەر لەدوای گیرانی کوێت لەلایەن عێراقەوە، وەزعێکی تازە هاتە ئاراوە، هەموو خەڵك چاوەڕوانی ڕووداوێکی گرنگ بوون لەوکاتەوەی کە هاوپەیمانانو دەوڵەتانی دونیا و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لێ ناگەڕێن کە عێراق کوێت قودبدا، دیارە لە کوردستانیش وەکو ئەوەی کە ١٠٠٪ وەزعەکان پەیوەندی داربوو بە ڕژێمی عێراق، بەوەزعی عامی عێراقەوە، لەهەمان کاتدا کاری کردە سەر هەم حیزبە سیاسیەکانی کوردستان وە هەم کۆمەڵگەی کوردەواری بەگشتیو شارەکانو گوندەکانو تێکڕای کوردستانی گرتەوە، هەر لەو دەمەوە تەقریبەن خەڵك ترسو سامیان لە حکومەت کەمتربۆوە، زانیان هەم لێدانی نزیك بووە وە بارودۆخێکی تازە هاتە ئاراوە کە خەڵك چاوەڕوانو ئومێدێکی گەورەی پەیداکرد جیا لەوەی کە پێش گرتنی کوێت لەلایەن عێراقەوە، کە پێش گرتنی کوێت بەڕاستی ئەنفالەکانو شکستی شۆڕشی نویّو وە بەدەرنانمان لە سنووری کوردستانو وە دابڕانمان لە خەڵكو جەماوەری ناو شارەکانی کوردستان، وە سەرانسەری کوردستان ڕژێمی بەعس بەمەودای عەسکەریو بەدەزگە چەوسێنەرەکانی خۆی تەنی بووی، وە خەڵك بێ سیقە بوو بوو، وە نەدەوێرا هیچ شتێك هیچ جۆرە معارەضە یەك هیچ جۆرە بەرهەڵستیەك نیشان بدات بەرامبەر بە حکومەتی عێراق، هەتا حەدەکی زۆر خەڵك تەسلیم بۆوە، ئیتر لەگەڵ لێدانی عێراق دوای گرتنی کوێت بەچەند مانگێك، وەزعەکە ووروژاو حیزبە سیاسیەکان

کەوتبوونە خۆ، تەبعەن لە گرتنی کوێتەوە ئێمە خۆمان ئامادەکرد، (دوایی دێمە سەری کە ئامادەکارییەکان چۆن بوون)، بەڵام بەگشتی بارودۆخێکی لەبار هاتە ئاراوە بۆ ئیشکردنی لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراق.

پ۲/ بەڵێ، باشە کاك سەفین بەحوکمی ئەوەی کە لە سنووری مەڵبەندی سێ وەك کادیرێك ئیشتان کردووە، مەسەلەن لەو ماوەیەدا چەند چالاکی هێزی پێشمەرگە هەبووە لەناو شاری هەولێر؟

و/ پێش ئەنفالەکان من کە سەرتیپی (۸۷)ی قەرەچوغ بووم، وە هەر لەدوای مفاوەزاتی ساڵی ۱۹۸٤ەوە ئێمە ڕاسپێردراین کە فعلەن تەتویعی جەولە بکەین، وە هەوڵ بدەین لە هەولێر چالاکی پێشمەرگەو وە دەسەڵاتی بەعسی تێدا کەم بکەینەوە، وە بەرنامەکەمان وابوو کە لە هەر چوار دەورەی هەولێر تەقریبەن هەر واش بوو بەس ناو شار بەدەست حکومەت بوو، دەنا سەرانسەری ناوچەکان پێشمەرگە دەسەڵاتی تێدا هەبووەو لە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە دابوو، وە بەڕۆژیش لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوو، تەنها شەقامە گشتیەکان‌و شارەکان‌و شارۆچکەکان لەدەست حکومەت دابوو، یان ئەو شوێنانەی کە حکومەت ئیشی پێیان بوو لە ئەو شوێنانەشدا دەسەڵاتی هەبوو.

ئێمە بەرنامەکەمان وابوو کە هەوڵ بدەین دەرەوەی شەستی (مەبەستی شەقامی شەست مەتریە) لە هەولێر کۆنتڕۆڵ بکەین‌و وەبکەین ئەوێندەرێکەش لەدەستمان دابێت، فعلەن لە ساڵی ۱۹۸۵ جوهدێکی زۆرمان کردە سەر گەڕەکەکانی دەرەوەی شەستی، شەقامی شەقلاوە، وە لە شەقامی کۆیەوە لە شەقامی مەغمور- گوێرەشەوە چەند جارێك هەڵمان کوتایە سەر ئەو شوێنانەی کە لە دەرەوەی

شەقامی شەست مەتری بوون، وە لەچەند چالاکیەکی بەناوبانگ لێمان دان و دەنگدانەوەی باشی هەبوو بۆ مان، وە توانیمان فعلەن ئەوان بەترس و لەرزەوە بێن بۆ دەرەوەی شاری. شەوان تەقریبەن لە دەرەوەی شەستی شاری هەولێر لەژێر دەستمان دابوو.

پ٣/ بەڕێزت وەك کادیرێکی کۆنی ناو ڕیزەکانی ی.ن.ك، ئێستاش وەکو ئەندامی سەرکردایەتی، هۆکارەکانی ڕاپەڕین بۆچی دەگەڕێنیتەوە؟

و/ هۆکاری ڕاپەڕینی ١٩٩١ وەکو وتم لەو بارودۆخە شتێکی هەرەگرنگ بوو یان فاکتەرەکی دەرەکی بوو. فاکتەرە دەرەکیەکان زۆر گرنگ بوون بەڕاستی، دیارە ئەگەر بگەڕێینەوە سەر بنچینەی شتەکان فاکتەرە ناوخۆییەکانن کە لەسەرەتاوە گرنگ بووینە، چونکە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکانەوە لەلایەن ڕژێمی داگیرکەرەوە دەچەوسێندرایەوە، ئەوە بوو کە کورد بێ بەش کراوە لەمافەکانی خۆی بەدرێژایی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی کەهاتوونەتە سەر کار لە عێراقدا، هەر لە زەمانی مەلەکیەتەوە و دوای مەلەکیەتیش کە هاتونەتە سەرکار، بەڕاستی ئەوە لەوانە بوو کە کورد پەنگی خوارد بۆوە لەهەناویدا، کە دایمەن بە ئاگرو ئاسن وەڵامی دراوەتەوە، وە تەنانەت داخوازیەکی گەورە یان بچوکیان بەئاگرو ئاسن و بە بێ ئەوەی کە مەنتیقی حوار بێ دیالۆگ و مەنتیقی چارەسەری ئاشتیانە هیچ لە ئارادابێت یان ئەو دەرگایە داخرابوو کە قسەبکەین، بۆیە پەنگی خواردبۆوە، دواتر بێگومان لە بارودۆخێکی وادا نەدەکرا کە هێزی ئەو ڕۆژە ڕووداوەکانی ئەوڕۆ ئیسپاتیان کرد کە فعلەن زۆر جاری واهەیە کە هۆکارەکانی ناوخۆ بەتەنها بەس نیە،

هۆکارەکانی دەرەکی حکومەتی عێراق کە حکومەتێکی دەوڵەمەندە، کە حکومەتێك بوو لە دامو دەزگە قەمعیەکانی (مەبەستی دامو دەزگەی داپڵۆسێنەرە) خۆی بەهێزکردبوو، وە هەموو سەروەتو سامانی عێراقی دەدا بە دەزگەی سەرکوتکەرو لە هێزە سەربازییەکانی خەرج کردبوو، وە هێزێکی زۆر مۆدێرنو کاریگەرو دەزگەی تۆقێنەری کاریگەری دروستکردبوو بۆ ئەوز شتە، بۆیە بەهیچ جۆرێك نە لە کوردستانو نە لە شوێنەکانی تری عێراق هیچ لایەنێکی ئۆپۆزسیۆن نەی دەتوانی کارێکی ئەوتۆی تێدا بکاتن، بەڵام بەگرتنی کوێتو وە هاتنە ئارای فاکتەرێکی دەرەکی کە هاوپەیمانەکان پشتیوانیان لە کوێتو لە یاسای نێودەوڵەتی کرد، کە دەوڵەتی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکان ناکرێ لەلایەن هێزێکی دیکەی دراوسێیەوە یان لە لایەن عێراقەوە قوت بدرێ، وە ئەو هاوپەیمانانە وایانکرد کە بارودۆخێکی تازە بێتە گۆڕێ، ئەوە هۆی سەرەکی گرنگ، جگە لەوەی کە بەدرێژایی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان خەڵك دەیزانی کە فعلەن ئێمە میللەتێکین مەزلومین، وەکو میللەتێکی بەش خوراو، وە ماف پێنەدراو، وە هەموو دەرگایەکمان لەسەر داخراوە، تەنها دەرگای توندوتیژیو سەپاندنی مافەکانی خۆیان.

پ٤/ بەڵێ، ئەی بارودۆخی ئەو ناوچەیەی کە (١٠) دە ڕۆژ بەر لە ڕاپەڕین تێیدابوویت چۆن بوو؟ وە ئایا هیچ پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان ئێوەو جەماوەردا هەبوو؟ گەر هەبوو، تا چ ڕادەیەك بوو ئەو پەیوەندیە؟

و/ من ئەوکاتە ئەندامی فەرماندەیی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بووم، کە فەرماندەیەك بوو لە دوو کەس لەگەڵ بەڕێز کاك

نەوشـیروان ئـەو دەمـە لێپرسـراوی ی.ن.ك بـوو لـە ناوچـەی زەڵـێ، "پێویستە ئەوە بزانین نەوشیروان مستەفا ئەوکات جێگری سکرتێری گـشتی یـەکێتی بـووە نـەك لێپرسـراو هـ.ع"، وە ئێمـە بارەگـای فەرماندەییەکەشمان لەوێ بوو، پتر لە چەند مانگێك بوو خەریکی ئەوە بـووین کـە ڕۆژانـە کۆبوونـەوەو ئـیش و کـاری ئـەوەمان دەکـرد بـۆ ڕێکخـستنی میحوەرەکـان، وە خـۆ ئامـادەکردن بـۆ دابەشـکردنی هێزەکان و کادیرەکان بەسەر ئەو میحوەرانەی کە دروستکرابوون، وە بەپێی نەخشەو بەپێی ئەو پیلانەی کە دارێـژرابوو، ئێمـە هەریەکـەو لێپرسـراوی میحوەرێـك بـووین، ئێمـە ئـەو دوو ئەندامـەی فەرمانـدەیی گـشتی، وە هـەروەها بـەردەوام پەیوەنـدیمان لەگـەڵ نـاو شـارو لەگـەڵ دەرەوەی شارو ئۆردوگایـەکان و بەپێی پیلانەکە دەبوایـە ئێمـە جـارەك زوتـر شـارە بچوکەکان ئازاد بکەین، دواتـر بچینە شـارە گـەورەکان، وە ئێمـە لـە پەیوەنـدی دابین لـە بـۆ پەیوەنـدی کـردن بـەو پێـشمەرگانەی خۆمان کە تەسلیم بوو بوونەوە، هەندێکیان لەوانە لـەلای سەرکردایەتی یـەکێتی یـەوە کـە ئێمـە ئاگـادار نـەبووین، ناوەنـدی کۆمەڵـەی ئەوسا و مەکتەبی سیاسیی ی.ن.ك و سەرکردایەتی ئاگاداربوون، بە جۆرێك کە بە تەوجیە ڕەوان کرابوونەوە کە بچنەوە، دایم لە پەیوەنـدی دابووین بۆ دروسـتکردنی شـانەی چـەکدار لێیـان وە پەیوەنـدی کـردن پێیانـەوە خۆیـان لەبەینی یـەکتر تەنسیق بکەن و لـەدوای تەنـسیق کـردن شـانەی چەکدارەکان پەیوەنـد بـن بـە یـەکتری و تەوجیـە نـاردن بۆیـان لـەڕێگای ئێزگـەوە، هـەروەها پەیوەندیـشمان دەکـرد بەوانـەی کـە چـەکداری ڕژێـم بـوون، ئـەو کوردانـەی کـە چـەکیان بـۆ ڕژێـم هـەڵگرتبوو، هەریەکـەو لەشوێنێك لە میحوەرێك کە دەمانزانی ئیشمان پێیە کە یارمەتیمان بدا،

ئیشمان بەکێ یە کە بێ لایەن بێ، ئیشمان بەکێ یە کەوا پەیوەندیمان پێوەبکات.

پ٥/ بەڵێ، ئەی هەڵوێستی ڕژێم چۆن بوو بەرامبەر ئەم چالاکیانەی کە پێشمەرگە لەناو شارەکان ئەنجامیان دەدا؟

و/ دوای ئەوەی هاوپەیمانەکان چەند چالاکیەکیان کرد بەناوی گەردەلولی بیابان، هەرچەندە ناڵێم عێراق تەواو لە پەل و پۆ کەوت، بەلام پیر بوو، نەی دەتوانی وەکو پێشتر کۆنترۆڵی دام و دەزگاکانی خۆی بکات، وەکو پێشان کاریگەر نەبوو لەناو دەزگا سیاسیەکان و دەنا ئەوەندەی بەخۆی لە دەستی بڕۆیشتبایە زۆر بەتوندی بەرەو ڕووی ئەو شتانە دەبۆوە، وە ئەو دەمە کادیرەکانی دام و دەزگاکانی حکومەتی عێراقی و بە بەعسیش وەکو جاران بە پیریانەوە نەدەهاتن و وەکو جاران بڕیارەکانیان جێ بەجێ نەدەکرد، بۆیە هەتا حەدێکی زۆر گرنگ حکومەت بێ ئاگا بوو لەوشتانەی کە ئێمە دەمانکرد.

پ٦/ جۆری چەکەکانتان و سەرچاوەی چەکەکان، چ بوون و لەکوێ وە دەهاتن؟

و/ هەر درێژە کێشانی شۆڕشی نوێ ی کە لە (١٩٧٦)ەوە دەستی پێکردبوو، چەکەکان هەر چەکەکانی ئەو دەمەبوو، بێگومان لە قۆناغی جیاجیادا جۆرەها چەك لە دوژمن گیرابوو. بێگومان چەکی سوك لەجۆری کلانشیکۆف و بی کەی سی و ئاربیجی و هەندێك هاوەنی ١٢٠ و ٨٢ و کاتیوشاو ئەو جۆرە چەکانە بوون کە زۆر بەکار هاتبوون، وە لەدوای ساڵی ١٩٨٦یش لەگەڵ ئێران ئێمە پێکەوە چالاکی کەرکوکمان کرد، لەو دەمەش کۆمەڵێك چەکمان بەدەست کەوت، ئەو جۆرە چەکانە بوو کە بۆم باسکردی.

پ٧/ ئەی ڕۆڵی ژنانی کورد لە ڕووداوەکان چۆن بوو؟

و/ ژنان وەکو هەموو توێژەکانی تری گەل، ئەوانەی کە کەس‌و کاری پێشمەرگە بوون، خێزان‌و خوشك‌و دایکی پێشمەرگە بوون لەگەڵ ئێمە بوون، ئەو کاتانەی کە لە ئێران بووین خۆشیان هاوکاربوون لەگەڵ پێشمەرگە، بەڵام وەکو ڕێکخراوەك من ئاگاداریان نەبووم.

پ٨/ڕۆڵی مستەشارەکان چۆن بوو لەکاتی ڕاپەڕین؟

و/ بێگومان هەموو یەکێك ئەوەی کوردبێ ڕۆژێك لە ڕۆژان کورد بووبی هەتا ئەگەر نزیکترین کەسی صدام یش بووبێت خەون بە ڕۆژێکەوە دەبینێت کە کورد ئازاد بێت، هەتا ئەوانەی کە مستەشاریش بوون، هەندەکیان بەنا عیلاجی، هەندێکیان بە ئاگاداری شۆڕش، هەندێکیان لە ئەنجامی شەڕەکانی ناوخۆی خۆمان لەنێوان هێزە سیاسیەکان پاڵنرابوون کەبچن ببنە چەکداری حکومەت، وە جیاوازی هەیە لەنێوان مستەشارەکانی کوردستان، بەڵام بە بۆچوونی من هەردوو لایان بوون، زۆر کەسیان هەبوو هەستی نەتەوایەتیان هەبوو کە بەناچاری بوو بوونە مستەشارو چەکداری ڕژێم‌و ناچار کرابوون، زۆریشیان پێشمەرگەی کۆنی شۆڕشەکانی زویی کورد بوون، زۆریشیان هەر لە پێناوی پارەو پلەو پایە بوو، هەندێکیان لەبەرئەوەی زانیان کە ڕۆڵی حکومەتی عێراق کۆتایی هات وە حکومەتی بەعس ڕووخا، بەڵام هەندێکیان وە زۆربەیان دەتوانین بڵێین کە زۆربەیان قەنعەکەیان ئەوەبوو هەستی نەتەوایەتیەکەیان ئەوەبوو کە زانیان ترس‌و سامی حیزبی بەعس نەما حەزیانکرد لەگەڵ بەرەی گەل دابن‌و بەرەی میللەتی خۆیان دابن نەك لەگەڵ بەرەی دوژمن دابن.

پ٩/ ئایـە ١٩٩١/٣/١١ ڕۆژی ئـازادکردنی شـاری هــەولێر بـەپێی بەرنامەیەکی پتەوبوو؟ وە چەند حیزبی کوردی تیایدا بەشداربوون؟

و/ ٣/١١ نـاتوانرێ لـە بەرنامــەی گـشتی ڕاپەڕینـەکانی تـر جیـا بکرێتەوە، چونکە بەپێی ئەو بەرنامەیەی کە دامان نابوو دەبوو ئێمە بـچین شـارەکان ئازادبکـەین، لەگـەڵ مـەفرەزە پارتیزانـەکان و شـانە چـەکدارەکان و هێـزی گـەل ئۆردوگاکـان ئـازاد بکـەین، وایـە بێینـە سـەر شـارە گـەورەکانی وەکـو سـلێمانی و هـەولێرو کـەرکوک و کـەرکوک نـا، کەرکوک بە جیاواز، بەڵام دهۆک و ناوچەکانی تر، بەڵام دوایە کە لە ٣/٥ لـە ڕانیـە ڕاپـەڕین دەسـتی پێکـرد دیـارە کـە بـە تـەوجیهات و بـەوەی کـە سـەرکردایەتی شـۆڕش و بـە ئێزگـە ئاگـاداربوون. ئێمـە کە هاتینـە ڕانیـە تەماشـامانکرد باروزروفەکـە لـە گۆڕاندایـە، وە بـەو شـێوەیەی کـە ئێمـە پیلانمان بۆ دانـابوو بـەو شـێوەیە ناکرێـت. بـە هـەزاران بـە دەیـان هـەزار چـەکدار لـەو ناوچـەیە خـڕ بـوو بوونـەوە، هـەم خـەڵکی ناوچـەکەو هـەم پێشمەرگەکانی کە لەو دیـوی سـنوور هاتینـەوە، هـەم ئەوانـەی کـە هـاتن پەیوەندیان پێوەمانکرد لە هەولێرو شوێنەکانی ترەوە هـاتبوون. پێمـان بـاش بـوو کـە بـە دوو میحـوەر بـچین، بـەڵێ بـە شـێوەیەك لـەو ڕانیەیـە پیلانێکمـان دانـا لەگـەڵ بـەڕێز کـاك کۆسـرەت و ئـەو برادەرانـەی کـە لـە میحوەرەکـانی کەلەگەڵمانـدابوون، کـە بـە دوو قـۆڵ بـڕۆین، لـە قۆڵێکیان بـچینە شـەقڵاوە، شـەقڵاوە ئازادکـەین، وە قـۆڵێکیش بـچێت کۆیـە ئـازاد بکات، وە لەو دوو قۆڵەوە بچینە سەر شاری هەولێر، دیارە بە تەنسیق و هاوکـاری لەگـەڵ شـانە چـەکدارەکان و ڕێکخـستنەکانی خۆمـان لـەناو شـاری هــەولێر، کــە لــە ڕێگـای ئێزگــەو لــە ڕێگـای نامــەی کەسـی و پەیوەنـدی بەردەوامـەوە ئاگـاداربوون هـەتا ڕۆژی ٣/٨ کـە شـەقڵاوەمان

گرت، ئەوانیکەش هەڵیان کوتایە سەر کۆیە، قوڵی کۆیە کە هەڵیان کوتایە سەر کۆیە، کۆیە ئەو شەوە نەگیرا، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی کۆیە گیرا، بەڵام ئێمە لەهەمان ڕۆژی ٣/٨ شەقڵاوەمان ئازادکردوو وە دوای شەقڵاوە بۆ عەسرەکەی ڕۆژی ٣/٩ چوینە مصیفو ئازادمانکرد، وە دوایی ئۆردوگای بەستۆڕەمان بۆ ١٠ی مانگ "واتە ١٩٩١/٣/١٠" لەگەڵ دەوروبەری ئازادکرد. ڕۆژی ٣/١١ لەوێش ڕاوەستاین کەھا میحوەری کۆیە هاتنە گۆمەسپانو چاوەڕێمان دەکرد بگەنە کەسنەزانو پێکەوە هەڵبکوتینە سەر هەولێر، وە ڕۆژی ٣/١١ "مەبەستی شەوەکەیە" ئەوەبوو تەوجیهات درا بە هەموو شانە چەکدارەکانو ڕێکخستنەکانمان بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵات دەست بە ڕاپەڕین بکەن.

تەقریبەن لە هەموو شوێنەکان تەقە دەستی پێکرد، وە ئێمەش کاتژمێر (٨)ی بەیانی لە بازگەی شاوێس بووین سەرەتای ئەو مقاطعەی کەلای شەقڵاوە دەهات، وە کاتژمێر (٨)ی بەیانی لە بازگەی شاوێس دوای ئەوەی بۆ ماوەی نیو کاتژمێر مقاوەمان کرد لەگەڵ چەند دەبابەیەك کە لەوێندەر لەسەر ڕێگا بوون تێك شکانو چووین لەگەڵ خەڵك تێکەڵاوبووینو دەستمانکرد بە گرتنی یەکە بە یەکەی شوێنەکان.

دیارە ئێمە کە شەو پیلانەکەمان لە مصیف باسکرد بۆچونمان وابوو کە یەکەم ڕۆژ ناو شاری هەولێر هەمووی ئازاد دەکرێو پاکی دەکەیتەوە، بەڵام پێمان وابوو معسکرو فەیلەق کە لەوێندەرێ بوو، وە ئۆردوگای ڕەشکێن با بڵێین معسکری ڕەشکێن، لەوانەیە بمێننەوە بۆ ڕۆژی دوایی، بەڵام زۆر خۆشحاڵ بووین کە بینیمان کاتژمێر (١٠)ی

بەیانی قاعد فرقەو چەند ئەفسەرێك بە هەلیكۆپتەر ڕایانكرد، وە هەمان ڕۆژ معسكریش گیرا.

پ١٠/ یەعنی گرتنی هەولێر لە دوو قۆڵەوە بوو؟

و/ بەڵێ لە دوو قۆڵەوە بوو.

پ١١/ باشە، قۆڵی كۆیە كێ سەرپەرشتی دەكرد؟

و/ قۆڵی كۆیە بەڕێز شەهید ڕێبازو مامۆستا بەكرو مامۆستا چەتۆ، وابزانم مامۆستا چەتۆ سەرپەرشتی دەكرد.

پ١٢/ ئەی قۆڵی شەقڵاوە؟

و/ قۆڵی شەقڵاوە كاك كۆسرەت سەرپەرشتی دەكرد. من "سەفین مەلا قەرە"و شەهید عەبدولڕەزاق و شەهید حەسەن كوێستانی و زۆر لەو برادەرانەی كەماون ئێستاكە، لەو پێشمەرگانەی كە لە فەرماندەكانن وەكو كاك عەبدوللا بۆرو ڕەحمان سەیدەی ڕەحمەتی و ...تاد.

پ١٣/ ڕۆڵی حیزبە ئیسلامیەكان بەتایبەتی بزووتنەوە چۆن بوو؟

و/ بزووتنەوە هەبوو لە بەرەی كوردستانی پێش ڕاپەڕین هەبوون، بارەگاكانیان نزیك بارەگاكانی ئێمە بوون. ئەو دەمە یەك پارچە بوون، نفوزیان ئەوەندە زۆر نەبوو، چەكداریان هەبوو بەڵام وەكو هێزێكی سیاسیی بچوك تەماشا دەكران، ڕۆڵێكی ئەوتۆیان نەبوو لە چونە هەولێریش ئەگەر هاتبیشن.

بەڵێ پێم وایە لەگەڵمان دابوون لە ڕۆژی ٣/٨ ئێمە كە ٣/٧ هاتین بۆ ڕانیە بۆ ئێوارەكەی لەگەڵ هاتنی كاك نەوشیروان و كادیرانی تر، ئێمە كاتژمێر (١٠)ی بەیانی هاتبووین، بەڵام ئێوارەكەی كاك نەوشیروان و كاك كۆسرەت و هەموو برادەرەكانی تریش هاتن، دیارە سەركردایەتی

پارتیش هەر لەگەڵ ئەوان هاتن، دوایی هەموو حیزبە کوردستانیەکان کە زانیان کوردستان ئازاد بووە هاتن، وە ئیسلامیەکانیش لەگەڵ ئەوان هاتن.

پ١٤/ لەناو شاری هەولێر چ حیزبێکی تری کوردستانی ڕۆڵی هەبووە لە ئازادکردنی؟

و/ بەڵێ، چەند مەفرەزەیەکی سۆسیالیستمان لەگەڵ بوو، دیارە حیزبی سۆسیالیستی ئەوسا نەك هی ئێستا.

پ١٥/ ئەگەر بکرێ ناوەکانیان؟

و/ نازانم، بەڵام حیزبی سۆسیالیست لە ڕانیە دەوری گرنگیان هەبوو، لە ئازادکردنی ڕانیەو حاجیاوە بەتایبەتی.

بەڵام لە هەولێر پێم وانیە حیزبە سیاسیەکان لەگەڵ بووبن، ئەگەر لەگەڵیش بووبن ئێمە هەستمان پێنەکردووە، وە هیچ حسابێکمان بۆ نەکردوون، با بڵێین کە قۆڵێکیان "مەبەستی میحوەری شەڕەکانە" پێ بسپێرین یان چونکە ئێمە کە لە مصیف چوینە خوارەوە ڕەتڵێکی زۆر گەورەمان لەگەڵ بوو، بورهانی سەعید صۆفی و بەکرە سور وە چەند کەسێکی تر کە لەگەڵمان دابوون لە هێزەکان. زیاتر لە (٥٠٠٠-٦٠٠٠) هەزار کەس بەرەو ناو زرارەتی و ناوچەی کەڵەك و تۆپزاوەو ئەو شوێنانە ڕۆیشتن، داوامان لێکردن کە بچن ڕێگای موصڵ قەطع کەن وە ئێمەش ئەوجار دێینە سەر هەولێر، فعلەن وەبوو ئەوان کارەکانی خۆیان زۆر بەباشی ئەنجامدا، دوای ڕزگارکردنی کەورگۆسك و ئەو شوێنانە چونە کەڵەك و تۆپزاوەو ئەو شوێنانەیان ئازادکرد. ئێمەش چووین ئەوە بوو لەهەمان ڕۆژ، بەڵام ئەوان "مەبەستی لایەنە

سیاسیەکانی تری کوردستانە" دەورێکی گرنگیان نەبوو یان بونێکی ئەوتۆیان نەبوو.

ئێمە دیارە لەسەرەتای دانانی پیلانەکە دەمانویست بەڕاستی دەسکە گوڵەکەی کە بەڕێز مام جەلال دەڵێ خەڵك ئەو ڕاپەڕینە بەهی یەك لایەن نەزانی، پێمان خۆش بوو هەموو لایەنێکی تێدابی، وە بەتایبەتی ئێمەو پارتی، کە لە زۆربەی قۆڵەکان کادیرەکانی خۆمانمان دانابوو، بەڵام حیزبە ئیسلامیەکانیش تەنسیقیان لەگەڵ کردبوو، لەگەڵ سۆسیالیستو لەگەڵ حیزبی شیوعیو لایەنەکانی کەش، ئەوە بوو ئەوان کادیرەکانی خۆیان بەسەر میحوەرەکانی ئێمەدا دابەشکرد.

پ١٦/ ڕێککەوتنی نێوان ی.ن.كو پ.د.ك لە ١٩٩١/٣/١٩ بۆ گرتنی هەردوو شاری موصڵو کەرکوك چۆن بوو؟

و/ سەرەتای ڕاپەڕین پیلان بەم شێوەیە نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی کە شوێنەکان،ئازادکران، هەولێر ئازادکرا، دوای ئەوەی کە ئێمە لە پردێ بووین کاك مەسعود بارزانی هات لەگەڵ کاك نەوشیروان مستەفا کۆبوونەوەیەکیان کرد، بەس مام جەلال ئەودەمە لە دەرەوەی وڵات بوو ئیشو کارەکانی بەڕێوە دەبرد، دیارە لە پەیوەندی بەردەوامیش دابوو لەگەڵ کاك نەوشیروانو سەرکردایەتی ی.ن.ك، بەڵام ئەوانە هاتن ئێوارەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/١٩ اتفاقەك کرا من ئاگادار نەبووم لەو کۆبوونەوەیە کە کرا، بەڵام کۆبونەوەکە لەنێوان سەرکردایەتی ئەوان "مەبەستی لە سەرکردایەتی پارتی یە"و ئێمە دابوو، کە اتفاقیان واکردبوو لەگەڵ کاك مەسعود، اتفاقەکی وا کە ئەوان بچن موصڵ بگرن، وە ئێمەش "مەبەستی یەکێتی یە" بچین کەرکوك بگرین، بەڵام ئەم پیلانە لەسەرەتاوە بەم شێوەیە نەبوو، دانەنرابوو.

پ١٧/ یەکەم جار لە هەولێر ڕاپەڕین لەکوێ سەری هەڵدا؟

و/ لە زۆربەی شوێنەکان پێکەوە، دەتوانم بڵێم لە گەڕەکی کوران و ئەوانەوە دەستی پێکرد یەکسەر هەڵیان کوتا بۆسەر طواری امن لەوێندەرێ، وە تەقریبەن لە زۆربەی گەڕەکەکان، نازانم بزەبت کامەیان پێش کامەیان زووتر ڕاپەڕینی دەست پێکرد، بەڵام لەگەڵ گەردی بەیانی لە هەموو شوێنێك تەقە دەستی پێکرد، یەکسەر هەڵیان کوتابوو بەپێی تەوجیهات و بەپێی ئەوەی کە پێیان وترابوو هەڵیان کوتایە سەر دائرەی امن و مەقەراتی حیزبی بەعس و وە ئەوانەی کە بارەگای استخبارات و ئەوانە بوون، لە بۆ سەر معسکر نا، بەڵام لە بۆ سەر ئەو شوێنانە با.

ئەوە نەبوو وەکو چالاکی پێشمەرگە کە شوێنێکی پێ سپێرابی و لەوێ وە تەقە دەست پێ بکات، نەخێر بەپێی پیلانەکان هەر کەسەو شوێنی خۆی دەستنیشان کردبوو لە شەوەوە ئیشیان بۆ کردبوو بەیانی هەر لە هەموو شوێنێکەوە هەڵیان کوتایە سەریان. نازانم لە کوێ وە تەقە دەستی پێکرد، بەڵام دوایی بۆمان دەرکەوت کە پێم وایە یەکەمجار لە طواری امن تەقە دەستی پێکردبوو کە لای کوران بوو.

پ١٨/ واتە بەرنامەیەکی دیاریکراو نەبوو بۆ گرتنی شوێنەکان؟

و/ با، شانە چەکدارەکانی بروسك و ڕێکخستنەکانیان هەریەکەو بەپێی گەڕەکەکان و شوێنەکان خۆیان ئامادەکردبوو، شوێنیان بۆ دەستنیشان کردبوون، وە ئێمە پێمان وتبون لە هەموو بارەگاکان لێ ی بدرێت.

پ١٩/ ئاستی بەرەنگاربوونەوەی ڕژێم و زیانەکانی هەردوولا و ناوی شەهیدەکان، گەر بزانی؟

و/ بەرەنگار بوونەوەی ڕژێم زۆر لاوازبوو، هێزەکانی زۆر سستو خاوبوون، وە زۆربەیان کە تەقە دەستی پێکرد هەموویان تەسلیم دەبوونو زۆر بێ مقاوەمە بوون. لە شەقلاوە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٨ منظومەی لێ بوو، تەنها منظومە مقاوەمەی کرد، وە دوای یەك کاتژمێری شەڕ، شەڕێکی قورس کە چاردەورمان گرتبوون، لیوایەکە تەسلیم بوو بوو، بە بێ تەقە هەموو شوێنەکانی کە تەسلیم بوو بوون، تەنها منظومە تەقەی دەکردو مقاوەمەی دەکرد، تەقریبەن دوای یەك کاتژمێر شەڕ، (٢٣) بیستو سێ کەسیان لێ کوژراو ئێمەش پێشمەرگەیەکمان شەهید بوو هی دۆڵی باڵەییان بوو مامی کاك صلاح دیکانی بوو، وە چەند کەسێکی کەی شەقلاوە شەهید بوون، دوو تا سێ کەس.

لە هەڵکوتانی سەر هەولێریش بەڵێ مقاوەمە هەبوو، لە منظومەی استخباراتی شمالی وە لە دائرەی امن، وە لە شوێنی ئێستای مجلسی تەشریعی کە ئێستا بینایەی پەرلەمانە، وە قاطعی جەیشی شەعبیش مقاوەمە هەبوو. بەڵێ هەندێك شەهید بوون، بەڵام بەڕاستی ناوەکانیان نازانم، بەڵام خەڵك زۆر شەهید بوون، هەم لە شانە چەکدارەکانو هەم خەڵکیش.

پ٢٠/ هەستی جەماوەرو چارەنووسی پیاوانی ڕژێم چۆن بوو؟

و/ نەخێر ئێمە تەوجیهەکەمان وابوو ئەوانە کوردە هەڵخەڵەتاوەکانن، بابڵێین پیاوانی ڕژێم هەموویان، چ ئەوەی بەشدار بێت لە ڕاپەڕین، چ ئەوەی بەشدار نەبێ لە ڕاپەڕین، هەموویان ئاشتبونەوەی گشتی یە، وە هیچیان لەسەر نەبوو، لە هەمان کاتدا کە

ئەمنەکان دەکوژران بە تەوجیه نەبوو، بەڵام خەڵك ئەوندە ڕقیان هەبوو بەرامبەریان، ئەوە بوو دەیان کوشتن.

پ٢١/ دوای ڕاپەڕین ئەو ناوچەیەی لێ ی بوویت پەشێوی پێوەدیار نەبوو؟ تا چەند حیزبە کوردیەکان ڕۆڵیان هەبوو لە کۆنتڕۆڵکردنی بارودۆخەکە؟

و/ دوای ڕاپەڕین دەکرێ ئێمە بەچەند قۆناغ باسی کەین، دوای ڕاپەڕین بەڕاستی من لە هەولێر مامەوە تەنها (٤) ڕۆژ، چوار ڕۆژەکەش تەنها خەریکی سازدانی هێزو ئامادەکردنیان بووین بۆ هەڵکوتانە سەر کەرکوك. ڕاستی ناتوانم ئەم بارودۆخە هەڵسەنگێنم، وە دەم دیت کە خەڵك زۆر خۆشحاڵە. فعلەن وەزعەکی ناخۆشیش بوو خەڵك برسی بوو خواردن نەبوو کارەبا نەبوو، وە سوتەمەنی نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك زۆر دڵی بە ئازادیەکە خۆش بوو، خۆی ئامادەدەکرد کە بێن بۆ ڕزگارکردنی کەرکوکیش.

دوای ڕاپەڕینیش، دوای چوار ڕۆژەکەی پاش ئازادبوونی هەولێریش چووین بۆ کەرکوك، وە لە شەڕەکانی کەرکوکدا هەتا ٢٩ی مانگ "واتە ١٩٩١/٣/٢٩" کە کەرکوك گیرایەوە ئێمە لە کەرکوك بووین، لە شەڕەکاندا بووین، بۆیە ناتوانم ئەو بارودۆخە هەڵسەنگێنم، چونکە لە کەرکوك ڕوداوێکی ئاسایی نەبوو، ئێمە لەناو شەڕیکاتی نەوت بووین، لەسەر ڕێی دوبز بووین، بەردەوام هێرشمان دەبردوو دوژمن هێرشی دەهێنا.

پ٢٢/ گرنگترین کارێك لە ڕۆژانی ڕاپەڕین ئەنجامت دابێت و جێی شانازیت بێت؟

و/ ئەو ڕۆژەی کە هاتمە ناو ڕانیە ١٩٩١/٣/٨ کاتژمێر (١٠) دەی سەر لە بەیانی، بەڕاستی هەم گریانو هەم دڵخۆشیو پێکەنین تێکەڵ بوو بوو، بەوەی دوای چەند ساڵ دوور کەوتنەوە لە کوردستان، خەڵك بە چ حەماسەتێکەوە پێشوازی لێکردینو وە چەندیش دڵیان خۆش بوو کە پێشمەرگە هاتنە ناو ڕانیە. ئەو ڕۆژەی کە چوبووینە هەولێر ڕۆژی ١٩٩١/٣/١١ بەڕاستی ئەو ڕۆژەش ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو، هەرچەند ماندوو و هیلاك بووین وە چارە نوسیشمان دیار نەبوو، بەلام بەڕاستی زۆر ڕۆژێکی مێژوویی بوو. بەلام گرنگترین کارێك لە ڕاپەڕین ئەنجامم دابێ، بەڕاستی ئەوە بوو لە کەرکوك شەریکەی نەوتمان گرتو ڕێی دەبزو ناوچەی سەنتی کە گرتنی زۆر گرنگ بوو. بەڕاستی لەکشانەوەمان کە دوژمن کەرکوکی گرتەوە، ئەوەی من بتوانم شانازی پێوەبکەم وەکو ئەوەی کە خەڵك هەمووی لە کەرکوك دەرچوون ڕایان دەکرد، ڕەتلێك دەبابە دەیانویست ڕێگایان پێ بگرن، وە بەڕاستی لەلای کەلی سێکانیان لەلای پردێ وە، دیارە ڕۆژی پێشی پردێ یان گرتبوو، دواتریش لە دوبزەوە لە بۆ ئەوێندەرێ هاتن، وە ئێمە ڕێگەمان لەوانە گرت، وە زیاتر لە (٣) سێ کاتژمێر مقاوەمە، تەقریبەن هەموو خەڵکی کەرکوك توانیان دەربازبن. ئەگەر ئێمە ئەو سێ (٣) کاتژمێرە مقاوەمەمان نەکردایە لەوانە بوو بەهەزاران کەس بگیرێتو بکوژرێن. بەس بەڕاستی ئێمە سێ (٣) پێشمەرگەمان لێ شەهید بوو لەو (٣) کاتژمێر شەڕە، وە بۆ خۆمان بەڕاستی بەمەرگ بازی توانیمان مقاوەمەی دەبابەکان بکەین، کە نزیکەی (٢٧) بیستو حەوت دەبابە بوون، وە چەندین مدەرەعەو شتی لەو بابەتانە بوون، بەلام لەسەر خەت ئەمنیەکەی کەرکوك لەئاستی بورجەکەی مایکرویف لەوێندەر مقاوەمان

کردو نەمان هێشت خەڵکەکە بگیرێت‌و بکوژرێت. یەعنی ئەوە یەکێك لە شانازیەکانمە.

وە دوای ئەوە لە هەولێریش ڕۆژی ١٩٩١/٣/٣٠، کە پێم وایە ئەو ڕۆژەبوو، کە لە کەرکوك گەیشتینە جێ دوای شەڕێکی زۆر ناخۆش، بەیانیەکەی کاتژمێر (٧) حەوت چوینە کەڵەك ڕێکخستنی جەبهەکانمان بکەین، بۆ ئەوەی بتوانین هەولێر بپارێزین. لە کاتژمێر (١٠) دە وە لە کەڵەك بووە شەڕ، کە بەڕاستی ئەو ڕۆژە من بۆخۆم لەوێ نەبام لەوانەبا ئەو ڕۆژە کەڵەك بگیرابا و تۆبزاواو ئەو ناوچانە بگیرابانایە، دوای مقاوەمەکی زۆر حکومەت شکاو ئێمەش چووین لەلای گوێر خەتێکی بەرگری باشمان دروستکردو هێزێکی باشمان بەرامبەر بە دوژمن داناو لێپرسراومان بۆی دانا.

پ٢٣/ ڕۆڵی ڕاگەیاندن چۆن هەڵدەسەنگێنی لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا؟

و/ زۆر دەورێکی گرنگی هەبوو، دەنگی گەلی کوردستان بەڕاستی ڕۆڵی هەبوو. بێگومان جیهازی بێ سیم‌و ئەوانەمان زۆر کەم هەبوو، وە بە زۆری تەوجیهات‌و ئەوانە کە دەدرا ناو شارەکان‌و وە جەماوەر بەگشتی لە ڕێگای دەنگی گەلی کوردستانەوە بووە، وە لەڕێگای دەنگی گەلی کوردستانیشەوە دەزانرا کە فیعلەن چ ناوچەیەك ئازاد کراوەو کێندەرماوە، وە دەنگ‌و باسەکان چی یە، وە شوێنەکان بە چ گەیشتووەو بە چ نەگەیشتووە، زۆر ڕۆڵێکی گرنگی بینی، دەتوانم بڵێم گرنگترین ڕۆڵ، دەنگی گەلی کوردستان بوو.

پ٢٤/ جگە لەو ڕادیۆیە، هیچ ڕادیۆیەکی تر هەبوو لەو سەردەمە؟

و/ هەبوو، بەڵام بەڕاستی نازانم کە ڕۆڵی چۆنیان هەبووە، خەڵکیش باسی ئەوشتە ناکات.

**پ٢٥/ بەڕای تۆ هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین چی بوو؟**

**و/** ئەوەشیان زیاتر فاکتەرەکی دەرەکی وایکرد، دوای دانیشتنیان "مەبەستی ئەمەریکاو عێراقە" لە خێمەی صفوان، وە دوای ئەوەی کە ڕۆژانە یەکتریان دەبینیو دوای ئەوەی کە هاوپەیمانەکانو ئەمەریکا بەتایبەتی دیارە ئەو دەم بەباشو بەبەرژەوندیان نەدەزانی حکومەتی عێراقی لەناو بچێ، لە عێراق ببێتە شەڕی ناوخۆ یان کۆنترۆڵی لەدەست بچێ، پێیان ناخۆش بوو وە ڕێگەیاندا کە هەلیکۆپتەر بفڕێ، ئەو هێزانەی کە لە سێگۆشەی بصرەو کوێتو ناصریە وە قواتی حرس جمهوریو باشترین دەبابەکانی عێراق لەوێندەر محاسرەبوو، پاش ئەوە ڕێگایاندا بەیەك ڕۆژ (٩٠٠) نۆسەد دەبابەیان پەڕاندەوە لە بۆ بەغدا، لە فوراتەوە پەڕاندیانەوەو ڕێگەیاندا، ئەگەر ڕێگەیان نەدابایە، حکومەتی عێراقی ئەو هێزەی نەمابوو، ئەوەبوو حکومەت ئەو شتانەی بەکارهینا لە بۆ سەر کوت کردنی ڕاپەڕین لە جنوب "مەبەستی باشووری عێراقە"، ئەوجا دوایی بەرەو کوردستان هاتەوە. دەتوانم بڵێم ئەوە فاکتەری سەرەکی بوو. چونکە بەڕاستی ئێمە نە ئەو کاتەمان هەبوو کە هێزەکانمان ڕێکبخەینو ئەو چەكو کەلو پەلانەی کە دەستمان بەسەر داگرتبوو، هەرچەند چەکی زۆر باشمان دەستکەوتبوو، بەڵام نەدەکرا لەو ماوە کەمەدا کە بەردەوامیش لە شەڕ دابووینو نەمان دەتوانی سوود لەم چەکە دەست بەسەر داگیراوانە وەربگرین، فاکتەرە دەرەکیەکان ئەساسی شکستی ئێمە بوون. جگە لەوەی کە خۆشمان هەرچەند هێزەکانمان دابەش دەکرد، بەڵام هەر ئەوەندە ڕێك دەخرا.



پ٢٦/ پەیوەنـدی راپـەڕینی کوردسـتانو خـوارووی عێـراق، وەك فاکتەرێك بۆ راپەڕینو شکستی راپەڕین، چۆنی دەبینی؟

و/ بەڵێ، کەمتر پەیوەندی پـێکترەوە هـەبووە، چونکە زیـاتر فاکتـەرە دەرکیەکان وایکرد کە حکومەتی عێراق بەهێز بێتەوەو کۆنترۆڵی هەموو عێراق بکاتەوە، کە لەلایـەن هاوپەیمانەکانـەوە رێگـەی پێـدراوە، بابڵێین تیشکی کەسکیان "سەوز" دایە هێزەکانی بگەڕێنێتـەوەو بـەکاری بینـی دژی خەڵکی راپەڕیوو.

لەکۆتایدا زۆر سوپاس کاك سەفین...

سوپاس بۆ ئێوەش...

**پێنجەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ عبدالقادر محەمەد عومەر (مەلا قادر[1])، سلێمانی- ماڵی تایبەتی خۆی، شەوی ١١-١٢/١/٢٠٠٣:**

پ١/ بارودۆخی سیاسیی شاری هەولێر بەر لە ڕاپەڕین چۆن بوو؟

و/ بارودۆخی سیاسیی شاری هەولێر، پێش ڕاپەڕین ڕژێمی عێراق بەتەواوی کۆنترۆڵی ناوچە گوند نشینەکانی کوردستانی کردبوو، هەموو گوندەکانی ڕاگواستبوو، هەموویانی لە کۆمەڵگاکان ئاخنی بوو، بۆئەوەی بەئاسانی کۆنترۆڵیان بکات، ئەمە بووە هۆی نیگەرانیەکی زۆری خەڵك، بژێوی و گوزەرانی خەڵك بەرەو تەسك بوونەوەو بەرەو نارەحەتی دەڕۆیشت. خەڵك ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هەستیان بەبێزاری دەکرد، زەختەکانی حکومەت ڕۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد، لەو سەردەمەیا دەنگە دەنگێکی وا پەیدابوو بوو لەناو خەڵك، کە بەگشتی نیگەرانی لەلایەن خەڵکی کوردەوە دەردەبڕی، تەسەوری ئەوە دەکرا کە حکومەتی عێراق لەناوچەکانی خواررووی عێراق دەیەوێت شارێکی تر بۆ کورد دروست بکات، تەنانەت ئەو کۆمەڵگایانەش لێرەش ڕابگوازێت بەناوی کوێ و کوێ شوێنی دروست دەکرد.

---

(١) ساڵی ١٩٦٠ لەگوندی سێکانیانی سەر بەناحیەی تەق تەق لەدایك بووە. لە ١٩٧٦ەوە پەیوەندی کردووە بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە. ساڵی ١٩٨٨ ڕۆڵی هەبووە لەدامەزراندنی سوپای ڕزگاری کوردستان (سرك). پێش ڕاپەڕین و کاتی ڕاپەڕینیش بەرپرسی ڕێکخستنەکانی هەولێرو کەرکوك و ئەو هێڵانەی پەیوەندی ڕێکخستنیان بەوێوە دروست بووە لە دوای ئامادەکاری بۆ ڕاپەڕین لە کوردستاندا. ڕۆڵی گرنگی گێڕاوە لە ڕۆژانی بەرپابوونی ڕاپەڕین. لەدوای ڕاپەڕینەوە خەریکی کاری ڕێکخستنە لە ڕیزەکانی ی.ن.ك دا تا ئێستاش. دوو بڕوانامەی بکالۆریۆسی هەیە لە بوارەکانی یاسا و ئەندازیاری.

ئەو ترس و سامە بەگشتی لەسەر کورد بەردەوام بوو، بە بەردەوامی خەڵك لەمێشکیا بوو کە ئەم ڕژێمە بەرنامەی تواندنەوەی مۆرکی نەتەوایەتی کوردی پێ یە، وە ئەیەوێ کورد بەتەواوی لەناوبەرێ. کورد لەوە حاڵی بووبوو بەهەموو چین و توێژەکانیەوە کە حکومەتی عێراقی بەوەندەوە ڕاناوەستێ، کە لە شارو گوندەکانی خۆی دەری کردبوون، بەڵکو دەیەوێ بەتەواوی کورد بتوێنێتەوە لەبۆتەی نەتەوایەتی عەرەبی دا، کە بەبیرێکی زۆر شۆڤینیانە کاریان بۆ دەکردو ئیشیان بۆ دەکرد، وە بە تەرتیبێکی واش کارەکانیان دەکرد کە کەس نەتوانێ لەئاستیانا سەر هەڵبڕێ یان نارەزایی دەربڕێ، یان شێوەیەکی واپیشان بدا کە ئەم کارانەی ئەمان لەگەڵ واقیعی ناوچەکانا ناگونجێ، ئەم هەموو پاڵە پەستۆو زەختانە لەسەر دەرونی کورد پەنگی خواردبۆوە، وە بوو بووە نارەزاییەکی ناوەکی لە عەقڵی هەموو ئینسانێکی کوردا لەو سەردەمەیە.

بەنسبەت واقیعی کوردستان لەدوای دەست پێکردنەوەی شەڕی عێراق ئێرانەوە، ئەوەبوو لەساڵی ١٩٨١ ڕاپەڕینێکی خوێندکاری کوردی لە زانکۆکانا سەری هەڵدا بەئامانجی ئەوەی کۆمەڵێ لە داخوازییە نەتەوایەتییەکانمان لەڕێی داوا خوێندکارییەکانمان جێبەجێ بکرێت، چونکە داخوازی خوێندکارانیش بەشێکە لە خواستی میللەتەکەمان. بۆ ئەم مەبەستە لاوە خوێن گەرمەکان، خوێندکارە خوێن گەرمەکان، ڕاپەڕینێکی زۆر مەزنیان ئەنجامدا، لە هەولێریش و لە موصلّ یش و من پێم وایە قەت لەتەسەوردا نەبوو کە گەنجی کورد، وە خوێندکاری کورد، بتوانێ لەو زەخت و زەبرو زەنگەی ئەو سەردەمدا، ئاواڕوو بەڕوو ڕابوەستێت و بێ هیچ وەسیلەیەك

بەرامبەر بە چەکەکانی ئەوان ڕابوەستن، بەڵام توانیان شتی زۆر گەورە بکەن، ڕاپەڕینێکی زۆر گەورەیان ئەنجامدا، لە هەولێرو موصڵو شوێنەکانی تریشەوە هاوکاری زۆر باش کرا. بەنسبەت زانکۆی صلاح الدین بەڕاستی ئەو خوێندکارانەی لەوێ ئەو ڕاپەڕینەیان ئەنجامدا، کارێکی وای کرد کە دەروونی خەڵکی کورد لەناو هەولێردا بەتەواوی بهەژێنێ، وە ئەمە بووە ماکێك بۆ ڕاپەڕاندنی ویژدانی نەتەوایەتی لەناو دڵو دەروونی خەڵکی ناوچەکاندا بەگشتی، ئەمە دەرگا کردنەوەیەك بوو لە عەقڵی کوردیا بۆئەوە بتوانن بە سیغەیەك لە سیغەکان ڕۆژێك لەڕۆژەکان ئەو ڕژێمەی کە خۆی کردووە بەمۆتەکەی گیانیان، لێ ی نەترسن بەسەنگو سامەی کە ئەو خۆی نواندووە.

لەدوای ئەو ڕاپەڕینانەوە ئەوەبوو وتووێژی نێوان ی.ن.كو ڕژێمی عێراق "مەبەستی وتووێژیساڵی ١٩٨٣یە" دەستی پێکردوو بەردەوام بوو تا ماوەیەكو دوایی حکومەتی عێراقی لەبەڵێنەکانی خۆی پاشگەزبۆوەو ئەو وتووێژە هەرەسی هێناو شەڕ لەنێوان حکومەتی عێراقیو شۆڕشی کورددا هەڵگیرسایەوە. ئەمجارەیان حکومەتی عێراقی بەشێوەیەکی زۆر ناشارستانیو زۆر نا مرۆڤانەو زۆر دڕندانە کەوتە وێزەی گەلی کورد، کە گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە گەلی کورد گەیشتۆتە ئەو مستەوایەی کە بەوئاستە ڕوو بەڕووی حکومەتی عێراقی دەبێتەوەو لێی ناترسێت، وەکو ئەوەی خۆی تەسەوری دەکات، کە دەبێ چۆکی بۆ دابدات. گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە کورد بەهیچ جۆرێك چۆك بۆ ڕژێمی عێراق دانادا، گەیشتە ئەوەی هێزی پێشمەرگە بتوانێ ڕووبەڕووی ئەو جەیشە زەبەلاحەی عێراق بوەستێتەوە، ناوچە بەناوچە، سەربازگە بەسەربازگە ئازادبکات، شارۆچکە بەشارۆچکە

ئازادبکات، کە بووە ترس و لەرزێکی گەورە لەبۆچوون و لێکدانەوەی حکومەتی عێراق، کە ئەم شۆڕشە بەم ئاستە بەهێزەیەوە ڕوو بەڕووی ببێتەوە لەڕۆژێکدا دادێت چۆك بە حکومەتی عێراقی دابدا. وە جەیشی عێراقی لەبەرامبەر پێشمەرگەدا گەیشتبووە حەدێك، کە لەهێزی پێشمەرگە بسڵەمێتەوە، هێزی پێشمەرگە ببون بە مۆتەکەی گیانی جەیشی عێراقی لە کوردستاندا.

بەم شێوەیە حکومەتی عێراق گەیشتووە ئەنجامێك کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر هێزی پێشمەرگەدا، بۆیە هەڵسا بە بەکارهێنانی ترسنۆکانەترین چەك لە مێژووی مرۆڤایەتی دا، وە بەدڕندانەترین شێوە بەکاری هێنا دژی جەماوەرو هێزی پێشمەرگەی کوردستان. نەبووە لە مێژووی هیچ ڕژێمێك یان هیچ دەوڵەتێك یان هیچ دەسەڵاتدارێك، کە چەکی لەناوبەری گشتی واتە جینۆساید بەرامبەر بەگەلی خۆی بکە، بەڵام حکومەتی عێراقی ئەم چەکە کۆمەڵکوژانەی بەرامبەر بە میللەتی کوردو هێزی پێشمەرگە بەکارهێنا، کە بە بڕوای خۆم ئەمە چەکی ترسنۆکانەیە، چونکە ئەم چەکە پێویستی بە مقاوەمە ناکا، کەس ناتوانێ مقاوەمەی لەبەرامبەردا بکات، وە چەکی دیفاعی نیە، چەکی شەڕنیە ئەمە، شتێکی نا مرۆڤانەو نا ئەخلاقی و هەموو شتێکە، ئەوەی کە ناشێ پێی بوترێت ئەوەیە. بە بۆچوونی من تا ئێستا ناوێك نەدۆزراوەتەوە بۆ بەکاربەری ئەم چەکە لەمستەوای ترسنۆکی ئەم قائیدانەی بڕیاری بەکارهێنانی ئەم چەکانەیان داوە.

ئەگەر بەچەکی کیمیاویش نەبایە جەماوەرو هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەرگیزاو هەرگیز چۆکیان دانادا بەرامبەر بە حکومەتی عێراقی، وە لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو چەکانەش هەر چۆکیان بەتەواوی

دانەدا، بەڵام ناوچەکە بەتەواوی چۆڵکران و قڕکران. ئەو خەڵکانەی کە کەوتنە بەردەستیان هەموو گیران و بردنیان و ئەنفال کران و تەنانەت بریندارەکانی چەکی کیمیاوی کە خۆی بریندارى کردبوون، ئەوانە منداڵ و پیرو پەك کەوتە هەموویان کوژران و لەناو بردران. هێزی پێشمەرگەی کوردستان دوای بەکارهێنانی ئەم چەکەش کە ناوچەکانی کوردستان بەتەواوی چۆڵ بوو، کە ئاوەدانی خەڵکی تیانەما، لەگەڵ ئەوەشدا مەفاریزە پارتیزانەکان هاتنە خوارەوە لەگەڵ چۆڵی ناوچەکانیشا ئەوان توانیان پەرە بەخەباتی خۆیان بدەن بەردەوام بن لەئامادەباشی خۆیان لەناوچەکاندا، وە تا ڕاپەڕینیش هێزی پێشمەرگەی کوردستان، کوردستانی ئەوجارە چۆڵ نەکردەوە، لەگەڵ ئەوەی ئاوەدانی خەڵکی تێدا نەمابوو، بەڵام ئاوەدانی هێزی پێشمەرگە لەناوچەکاندا هاندەرێکی زۆر گەورەبوو بۆ ڕێکخستنەکان، پەیوەندیەکی زۆر پتەوو بەهێز هەبوو لەنێوان ڕێکخستنەکان و ئەو مەفرەزە پارتیزانانەدا، کە ئەمە گیانی زیندووی خەباتگێڕی و خۆگرتنی بەتەواوی دەکردەوە بەبەر خەڵك داو وە بەبەر ڕێکخستنەکانیشدا.

دوای ساڵی ١٩٨٨ و دوای ڕاگواستنی هەموو گوندەکان، چۆڵکردنی هەموو ناوچەکان، گەیشتە سەر ئەوەی کە شار بەشاریش دەست پێ بکەن. شاری قەڵادزێ کە ئەوسا لەبەرنامەی دانەبوو لە دوای ئەنفالەکان، ئەوانیشیان ڕاگوێزا بەبیانووی ئەوەی لەناوچە سنووریەکاندا نزیکە، بەرنامەی حکومەتی عێراقی وابوو، کە ناوچە بەناوچە هەموو کوردستان بکات بەیەك سەربازگەو کۆنترۆڵی بکات بەئارەزووی خۆی.

پ٢/ چۆنیەتی بەڕێوچوونی کارەکانی ڕێکخراوی هەولێرو ڕێکخستنەکانی هەولێر بەر لە ڕاپەڕین چۆن بوو؟

و/ بەنسبەت ڕێکخستنەکانەوە دوای ئەوەی کاک کۆسرەت لەکۆنفرانسی کۆمەڵەدا بوو بە سەرکردایەتی، هاتە دەرەوە لەگەڵ شەهید عەبدولڕەزاق و کاک شوان و ئەمانە. کاک بێستون ببو بە لێپرسراوی ڕێکخراوی هەولێر، ئەویش دوای ماوەیەك هاتە دەرەوەو دوای ئەویش شەهید محەمەد قادر دەبێت بە لێپرسراوی ڕێکخراوی هەولێر. بەداخەوە شەهید محەمەد قادر لەگەڵ پۆلێك لە هاوڕێکانیا ئاشکرابوون و گیران و کەوتنە زیندانەوە. لەدوای ئەوە ئیتر خۆم "مەلا قادر" ئیشی ڕێکخستنەکانی هەولێرم دەکرد تا ڕاپەڕین، هەر لەساڵی ١٩٨٦ەوە تا ١٩٩١. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٦ەوە وەکو ڕێکخراو ڕێکخراو نەبوو، نەکرایەوە بە ڕێکخراو، نەمانتوانی بیکەینەوە بەڕێکخراو، بۆ پاراستنی ڕێکخستن و تەنزیماتەکان. بەڵام بەشی زۆری ڕێکخستنەکان لەلای من بوو، لەگەڵ ئەوەی بەشێکی زۆر لە ڕێکخستنەکان کە ژمارەیان کەم نەبوو پەیوەندیان بە هێڵەکانی دەرەوەی پێشمەرگایەتی و کیٚوکیٚ وە هەبوو تا ئەنفالەکانیش. ئیتر دوای ئەنفالەکان بەشێکی زۆرمان گرتنەوەو هاتنەوە لای خۆمان بەحوکمی زروفەوە. بەڵام هەندێکیان کەنەمان دۆزینەوە یان نەکرا وەریانگرینەوە، ئەوانە مانەوە تا دوای ڕاپەڕین، دوای ڕاپەڕین و لەکاتی ڕاپەڕیندا ئەوانیش کەوتنەوە ئیش.

پ٣/ چالاکیەکانی ڕێکخستنە نهێنی یەکانی ناو شار چی بوو؟

و/ تا ڕاپەڕین کۆمەڵێك ئیشی پێشمەرگایەتی و کاری لا بەلا کراوە. بەنسبەت ڕێکخستنەکانی ناو شاریشەوە، بۆ نمونە: دووەمین لێدانی

محـافظ، ڕێکخـستن بۆسـەیەکی بـۆ نایـەوەو لێیانـدا، کـە چـالاکیەکە بەدەستی (نجم الـدین قالـه باریکـە) جـێ بـەجێ کـرا. کاروچالاکی زۆر کـراوە، ئیـشی زۆر بـاش کـراوە بەنـسبەت ڕێکخـستنەکانەوە، بـەلام ڕێکخـستنەکان تـاوەکو ڕاپـەڕینیش ئێمـە زۆر بـە ووردی ئیـشەکانمان دەکـرد، توانیمـان ڕێکخستنەکان بپـارێزین‌و تووشـی هەڵـە نـەبین. وە لـەدوای ئەنفالـەکانیش مـەفاریزە پارتیزانـەکان، کـە هاتبوونـە خـوارەوە پەیوەندی توندو تۆڵ هەبوو لەنێوانمان. پێداویستی یەکان کە دەهـاتن، کـە دەگەیـشتنە ئێمـە، ئێمـە بـەهۆی هێڵـی ڕێکخـستنەکانی خۆمانـەوە دەمانگەیانـدنێ، وە لـەو ڕێگەیـەوە ئێمــە خەسارەیەکیـشماندا، (کاکـە زیاد) کە ئیشی پەیوەندیەکانی ڕێکخستن‌و هێـزی پێشمەرگەی دەکـرد، ئەو لە نەتیجەی ئەوکارەیـەوە بـوە هـۆی ئـەوەی کە ئاشـکرابێ‌و کەوتـە زیندانــەوە، بــەلام زۆر خــۆڕاگرو قارەمانانــە بــوو لــە زینــدان، هیــچی نەدرکانـدو هـەرخۆی مایـەوە لەزینـدان، تـاوەکو دوایـی ئـەویش لـەدوای ڕاپەڕین ئازاد بوو.

بەنسبەت (کاکە زیـاد)ەوە کـە کەوتـە زینـدان لـەوێش خـۆی گرتـەوە، هاتنـە بەندیخانـەی موصـڵ‌و دوای لێـدانی عێـراق لەلایـەن ئەمـەریکاوە، بەرنامەیەکیان داڕشت بۆ شکاندنی سجن‌و هەڵاتنیان‌و لـە ١٩٩١/٣/٤ دا بڕیاربوو جێ بەجێی بکەن. وە خـۆم چومە موصڵ، کە چومە موصـڵ فریـای بەرنامەکـە نەکـەوتبوون، دیـار بـوو ئـەوان پیلانەکـەیان شکـستی خواردبوو.

دوای ئەنفالـــەکان ڕێکخـــستنەکان لـــەناوەوە زۆر بـــەرجوگۆڵی‌و توندیـەوە ئیـشەکانی خۆیـان دەکـرد، لەگـەڵ ئەوەشـدا سـەرکردایەتی لەدەرەوە مشووری ناوەوەشی دەخوار، بـۆ ئـەم مەبەسـتە سـەرکردایەتی

دابەش کردبوو بەسەر چەند بەشەوە، بیری لەوە کردبۆوە ئەگەر لەدەرەوە بارودۆخەکە خراپ ببێ لەناوەوە خەڵکمان هەبێ، وە بەپێچەوانەوەش. بۆ ناو شار کاک مستەفای سید قادر نێردرابوو بۆ خوارەوە بۆ سەرکردایەتی کردنی ناو شارەکان بەگشتی، وە لە قەڵادزێ دادەنیشت تا ڕاگواستنی، بەڵام دواتر لە هەولێر نیشتەجێ بووو دەمایەوە تا گیران و زیندانی کردنی. بەهۆی دروست بوونی خەلەلێك لەناو هێڵی ڕێکخستنی ناو شارو مەفرەزە پارتیزانەکان، کاك مستەفا گیراو ئەویش دوای ڕاپەڕین ئازاد بوو، هەر وەکو چاوەڕواندەکراو زۆر قارەمانانە خۆی ڕاگرت و ناوی کەسی تری نەهێنا، ئەم گیرانەشی لە مانگی (٩)ی ساڵی ١٩٩٠دابوو. گومان لەوە بوو کە ئەمە لە ڕێگەی خەتمائیلی ناو هێڵەکانەوە بێت، بەڵام دواتر بۆمان دەرکەوت ئەمە وانیە. نەشمان هێشت کەس بەو گیرانەی کاك مستەفا بزانێت، تا دوای ڕاپەڕین کە ئازادبوو، کە ئەمە سەرکردایەتی ناوخۆ بوو. سەبارەت بە سەرکردایەتی دەرەوە، ئەمە لەدەرەوەی وولات دانرابوو، وە ژمارە تەلەفۆنی خۆی هەبوو، بۆ حاڵەتی نائاسایی، ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ شاخ پچڕا، ئەوا دەمان توانی پەیوەندی بەو سەرکردایەتی یەوە بکەین لەدەرەوە.

پ٤/ هۆکارەکانی ڕاپەڕین بەگشتی چی بوو؟

و/ پێشتر باسی زەبروزەنگی حکومەتی عێراقیمان کرد، کە چەند دڕندانە کەوتبووە وێزەی گەلی کورد، ئەم دڕندایەتیەی ڕژێمی عێراقی ئازاری لەدڵ و دەروونی هەموو کوردێکدا بەجێ هێشتبوو، بە هەموو پیاوەکانی خۆشیەوە تەنانەت ئەو پیاوانەشی کە ئەلقە لەگوێی ڕژێم بوون، خزمەتی ڕژێمیان دەکرد، برینی ئەو ئازارانە لەسەر دڵی

ئەوانیشدا دروست کردبوو، چونکە هیچ کەسێك نیە خزمێکی-دۆستێکی-برایەکی-ناسیاوێکی بەر زەبرو زەنگی حکومەتی عێراقی نەکەوتبێت. ئەمە وایکردبوو لەناخەوە هەموو مرۆڤێکی کورد ڕژێمی عێراقی نەوێت و بێزی لێی ببێتەوە. کارگەیشتە ئەوەی مغروری عێراق دوای شەڕەکانی لەگەڵ ئێران دا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆ شاییە ئابووریەی کە دروست بوو بوو لە بودجەی عێراقداو بۆ خۆ دەربازکردنی لەو هەموو قەرزە پەلاماری کوێتی دا، کوێتی داگیرکرد. وە پێشتر بەڕێز مام جەلال لە محاضرەیەکدا ئاماژەی بەوەدابوو کە ئەگەری داگیرکردنی کوێت هەیە لەلایەن عێراقەوە لەبەر هۆکاری سیاسیی و ئابووری، لەم محاضرەیەدا باسی لەم بابەتە کردبوو بەدوورو درێژی.

دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە، سەرکردایەتی ی.ن.ك دڵنیابوو لەوەی ڕژێمی عێراقی لەلایەن دەوڵەتە زلهێزەکانەوە بەتایبەتی ئەمەریکاوە لێی دەدرێت، جەزرەبەی ئەو دەست درێژییە وەردەگرێتەوە، بۆیە بیریان لەخۆئامادەکردن بۆ ڕاپەڕینێکی بەپەلە کردەوە.

ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك پێشتریش مەفاریزی چەکداری هەبوو، پێشتریش خۆی ئامادەکردبوو بۆ کۆمەڵێك شت، وە دوای ئەنفالەکان لەناو ڕێکخستنەکاندا سوپای ڕزگاری کوردستان دامەزرا لەو ڕێکخستنە دڵسۆزانەی کە ئامادەیی کاری پێشمەرگانەیان هەبوو، چەندین گروپ و مەفرەزەی تایبەتی لەو ڕۆڵە قارەمانانە تشکیل کرابوو، کلێشەیەکی تایبەتی خۆی هەبوو، کە داڕێژرابوو لەلایەن سەرکردایەتی ی.ن.ك. پێم وایە بەپلەی یەکەم ئەوانەی سەرپەرشتی ئەم بابەتەیان

دەکردو نەخشەو پلانیان بۆ کێشابوو پێکهاتبوون لە بەڕێزان (مام جەلال‌و کاک کۆسرەت‌و کاک نەوشیروان)، ئەم نەخشەیان داڕشتبوو کە نەخشەیەکی زۆر ووردو تێروتەسەل بوو، وە ژمارەیەکی باشیش لەتێکۆشەرانی تیادا کۆ بووبوونەوە. دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقیشەوە ئەم مەفرەزانە بنەمایەکی زۆر باش بوون‌و بنچینەی داڕشتنی سوپای ڕزگاری کوردستان بۆ ئەوە بوو کە هێزێکی ناوخۆیی ناو شارەکان لە پێشمەرگەی کوردستان هەبێ بۆ کۆمەڵێ ئەگەرو بۆ خۆ ئامادەکردنێکی داهاتوو بۆ ئەوەی لەناوەوە بتوانرێت زەبروزەنگی باش لە ڕژێم بوەشێنن‌و ئەو شۆڕشەی کە حکومەتی عێراقی لەدەرەوە ڕەتاندی یان بەبۆچوونی خۆی کۆنترۆڵی کردن‌و دەریانی کرد لە وولات لەناو شارەوە بەڕویا بتەقێنەوەو کە ئەمجارە بەهیچ جۆرێك نەتوانێ خۆی لەم شۆڕشە دەربازبکاو نەتوانێ کۆنترۆڵیان بکا. بەرنامەیەکی زۆر ووردی بەهێز داڕێژرابوو بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام شکور بەرنامەکەیان تەمەن کورت بوو، زۆر زوو پێگەیشت بەهۆی غەڵەتەکانی عێراق خۆیەوە. هەر ئەم مەفرەزە چەکدارانە بوون بە بنەمایەك‌و بنچینەیەك بۆ گەورەکردنی شانە چەکدارەکان، ئەوەبوو دوای نەخشە ووردەکەی سەرکردایەتی ی.ن.ك بۆ ڕاپەڕین‌و دابەزاندنی نەخشەکەو ئیش بۆ کردن‌و داواکاری یارمەتی کە هەموو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان‌و ووروژاندنی خۆئامادەکردن بەهەموو شێوەیەکی تێکڕایی‌و ئیشکردنی ی.ن.ك لەناو ڕێکخستنەکانی خۆیی‌و لەناو جەماوەردا بەشێوەیەکی زۆر چڕوپڕو تێروتەسەل بۆ ئەم مەبەستە لەناو شارەکان، لە سلێمانی شانە چەکدارەکانی (شاڵاو) دروستکران، وە لە هەولێر شانە چەکدارەکانی (بروسك) دروستکران، کە لە هەموو شوێنەکان

شانە چەکدارەکان بنەماکەیان دەتوانم بڵێم سوپای ڕزگاری کوردستان بوو، ئەو مەفرەزە پێشمەرگانەی ناو ڕێکخستنەکان کە پێشتر ئامادەکرابوون بونە هەوێنێکی زۆر کاریگەر بۆ ئەم مەبەستەو ئەم مەسەلەیە، وە سوودی زۆر گەورە لە پێشمەرگە کۆنەکان وەرگیرا بۆ دروستکردنی شانە چەکدارەکانی بروسك، چونکە ئەوان شارەزاییەکی باشیان هەبوو، خۆیان نەدۆڕاندبوو، کوڕی ئازاو قارەمان بوون، لەڕۆژە سەختەکاندا هاتبوون تەسلیم بە ڕژێم بوو بوونەوە، ئامادەیی ئەوەیان تێدا دروست بوو بوو کە بێن قەرەبوویەکی ئەم تەسلیم بوونەوەیەش بکەنەوە، کە ئەم قۆناغە لە ژیانیاندا بە فرسەتێك بۆیان هاتە پێشەوە هەروەکو ئەوەی زەمەن وایکردبێ ئەمان ڕۆڵی پێشمەرگایەتیەکەی خۆیان لێرەدا تەواوبکەن، نەك لەو دیو، دەورەکە وا گەڕایەوە.

ئەم خۆ ئامادەکردنە بە حوکمی لاوازبوونی ڕژێمی عێراقەوە بارەکە زۆر ئارام بوو بۆ خەڵکی عێراق دوای ئەوەی عێراق پەڕو باڵی تێك شکێندرابوو، ئەو ترسە گەورەیەی کەلەسەر دڵو دەروونی خەڵك پێشتر دروستی کردبوو، خەڵك ئەو ترسەی لێی نەمابوو. قەناعەتمان وابوو وە خەڵکیش گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە حکومەت کۆتایی دێت، بۆیە جەماوەریش هێزو توانایەکی زۆری تێدا بوو بۆ تۆڵەکردنەوەی ئەو هەمووە غەدرانەی کە حکومەتی عێراقی لێی کردبوو، ئامادەبوو تا ئەو تۆڵانە لە حکومەتی عێراقی بکاتەوە. ئەو خەڵکانەشی کە چەکداری ڕژێم بوون زۆری بەناچاری وە لەوانەشە لەبرسانو لەترسان یان بۆی نەلواوە بچێتە سەنگەری پێشمەرگایەتی، ناچاربووە بەلای ڕژێم دا بکەوێتو بۆ ئەوەی خۆی بژێنێ. ئەوانیش قەرەبووی ئەو هەموو غەڵەتانەی کە کردبوویان لەڕابردوودا بەرامبەر بە میللەتەکەیان، پێم

وایە ئەوەش بوو بەهاندەرێکی گەورە بۆیان بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو ڕابردووەی خۆیان بکەنەوەو پادداشتی میللەتەکەی خۆیان بەهاوکاری ڕاستەقینە بدەنەوە، بۆیە ئەوانیش زۆربەیان هیچ درێغیان نەکرد. بەهەموو لایەك هاوکارییەکی باش لەدەروونی هەموو لایەك دروست بوو، وە ئەو ڕۆژە گەیشتبووە حاڵەتێکی وا کە هیچ لەیەکتری نەترسێن‌و ترس لەدەروونیاندا نەبێت‌و بێ شەرمانە خۆیان بۆ یەکتری ئاشکرابکەن‌و قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکداو هاوکاری یەکتری بکەن‌و پەیمانی ڕاستەقینە بەیەکتری بدەن، وە ئەوە بوو سەرکردایەتی کوردیش لەدەرەوە بڕیاری (ئاشت بوونەوەی گشتی)دا بەرامبەر بەو وەعدانەی لەناوەوە هەموو لایەنەکان لەئەستۆی خۆیان بڕی بوو ئاشتبوونەوەیەکی گشتی جێ بەجێ کرا، وە هەموو قۆڵیان کرد بەقۆڵی یەکدا، وەکو واقیعێکی زۆر ڕوون ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان لەو سەردەمەدا دەورێکی هەرە کاریگەری بینی بۆ وورووژاندنی خەڵك‌و ئامادەکردنی خەڵك بۆ هاندانیان‌و خۆ ئامادەکردنیان بۆ ڕاپەڕین. ئەو هۆکارانە هەمووی تکاملی کردو گەیشتە ئەوەی بگەنە قەناعەتێکی موتڵەق، کە دەتوانن بەرامبەر بە دوژمنەکەیان بەیەکگرتوویی سەرکەوتن بەدەست بێنن‌و فعلەن وەکو کوردیش گووتەنی برا لەپشت برابێ مەگەر قەزا لەلای خودا بێ، هەم برا لەپشت برا بوو، هەم قەزاش نەبوو، خودا پاراستینی‌و سەرکەوتین بەسەر دوژمنەکەمان.

پ٥/ کاریگەری‌و

پەیوەندی نێوان ڕاپەڕینی عەرەبە شیعەکانی باشووری عێراق‌و سەرکردایەتی کوردو ڕاپەڕینەکەی چۆن بوو؟ و/

سەرکردایەتی کورد لەدەرەوەی وولات بەبیرکردنەوەیەکی زۆر وورد

. بیری لە ڕاپەڕین کردبۆوەو نەخشەی بۆ داڕشتبوو وە ئیشی باشی بۆ کردبوو، لەناوەوەش بەووره‌یەکی زۆر بەرزەوە بەقەناعەتێکی زۆر لێ هاتوانەوە ئیشی بۆ کرابوو، وە ئیشەکانیش هەمووی جێی خۆی گرتبوو. سەرکردایەتی لەدەرەوە لەگەڵ شیعەکاندا قسەیان هەبوو پێشتر کە لەیەك کاتدا ڕاپەڕین بکەن، هەموو عێراق ئازادکەن لەدەستی حکومەتی عێراقی، بەڵام دیارە برا عەرەبەکان ئەو قەناعەتەیان نەبووە کە کورد لەو گۆڕانە مێژووییە بەشداربکەن، بۆیە خۆیان پێی هەڵسابوون‌و نەیانویست کورد بەشداری ئەو وەزعەبکات‌و خۆیان پێیان وابوو دەتوانن عێراق ئازادبکەن‌و ئیتر ئەوبەشە بۆ بە کورد بدرێ، دوایی ئەگەر بەخێر شتێکیان بۆ کورد کرد یان ئەگەر بۆیان بکرێ هەربۆی نەکەن. حکومەتی عێراقیش زۆر دڕندانە وەڵامی دانەوە ئەوەش بەحوکمی ئەوەی دەستی کرایەوە، ئەمەریکاش دەستی کردەوە بۆ سەرکوت کردنی ئەو موعارەزەیە بەشێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە ئیبادەی کردن‌و ڕاپەڕینەکەی تێك شکاندن. ئەم تێك شکانەی ڕاپەڕینی خوارەوە، من بەقەناعەتی خۆم دەڵێم کاریگەری زۆر سلبی هەبووە لەسەر دەروونی سەرکردایەتی کوردی لەدەرەوە، بەرەی کوردستانی بەتایبەتی ی.ن.ك.

بۆیە ئێمە لەناوەوەش قەناعەتمان وابوو کە ئەوشکاندنەی جنوب وورده کاریگەری لەسەر دەروونی خەڵك دروست دەکات. (٤)ی مانگ بوو لە موصلْ گەڕامەوە بەبێ ئەوەی ئاگامان لەهیچ بێت، ١٩٩١/٣/٤ بووە ڕاپەڕین‌و دەوری ئۆردوگای خەبات گیرابوو، پرسیم ئەوە چیە؟ ووتیان نازانین، پاشان هاتمەوە هەولێر. لە هەولێر ووتیان لەخەبات ڕاپەڕین بووە، ڕاپەڕینێکی عەفەوی بووە، حکومەتیش دەوری

ئۆردوگاکەی گرتووە، نازانین چی هەیەو چی نەبووە، ئیتر خۆم گەڕامەوە بۆ خەبات، لەچەند لاوە چەند جارێك هەوڵمدا نەم توانی بچمە ناو خەباتەوە. لە ئاسکی کەڵەك وتیان لە بەیانیەوە دەوری ئۆردوگای خەبات گیراوەو ناهێڵن کەس بچێتە ژوورەوە، ئێمەش لەوە زۆر نیگەران بووین، من خۆم گومانم لادروست بوو لەوەی کە حکومەتی عێراقی بەرنامەی ئەوەی هەبێ خەڵکی خەبات یان ئەوانەی کە ڕاپەڕیون بیانگرێتو کۆیان بکاتەوەو ئەنفالیان بکات، بۆ ئەوەی بیانکات بەعیبرەتێك وەکو ڕاپەڕینی خوارەوە تاوەکو نەهێڵێ لە کوردستانیش ڕاپەڕین بکرێتو کەکراش سەر نەگرێت، لەوەش زۆر نیگەران بووم. بۆیە گەڕامەوە هەولێر لەماڵی خۆماندا لەگەڵ (شاسوار مستەفاو ئەحمەد ئیبراهیم) لەگەڵ هەردووکیان مناقشەی ئەو بابەتانەمان کردوو وتمان ئەوە ئەنجامی زۆر سلبی دەبێت، تێك شکاندنێکی مێژووییە بۆ بزووتنەوەی کوردی، وتیان چارچی یە؟ وتم چار ئەوەیە بە بۆچوونی من چاوەڕوانی بڕیاری سەرکردایەتی ی.ن.كو بەرەی کوردستانی نەکەین، ئەوانیش ئێستا ئەو جۆرە تێك شکاندنەیان بینیوەو بڕیاری ڕاپەڕین نادەن، بەڵام لەبەرئەوەی ئێستا جەماوەر هەستی بزواوەو حەماسەت گرتویەتی بۆیە باڕاپەڕین بکەینو سەرکەوتن بەدەست دێنین. وە لەهەموو شوێنێك خۆمان ئامادەکردووە، لەکوێ پێمان دەکرێت با بۆ بەیانی ڕاپەڕینی لێ ئەنجام بدەین، بەتایبەتی ئەو شوێنەی ڕاپەڕینی لێوە ئەنجام دەدەین با لەناوچە سنوریەکانەوە بێت، کە ئێمە لەناوچە سنووریەکان سەرکەوتنمان بەدەست هێنا هێزی پێشمەرگە ناچاردەبێت فریامان بکەوێت، کە فریامان کەوت قۆناغ بە قۆناغو دەست بەدەست شوێنەکان ڕزگاردەکەین. وتیان بۆئەمە چی

بکەین؟ گەیشتینە قەناعەتێك کە بۆ ٥ی٣ لە ڕانیەو شەقڵاوەو کۆیەوە ڕاپەڕین ئەنجام بدرێتو ببێتە تەقینەوەیەك پاشان هێزی پێشمەرگە کەهاتە ڕانیە دواتر هەموویان یەك دەگرنەوە.

بۆ ئەم مەبەستە بڕیارماندا (ئەحمەد بچکۆل) بچێت بۆ ڕانیە، وە (محەمەد قادر)یشمان نارد بۆ باینجانو بازیان، کەدوای ئازادکردنی ئەم شوێنانە بەتایبەتی کە ڕانیە ئازادکرا بۆ بەیانیەکەی ڕێگای بەینی سلێمانیو کەرکوك بگیرێت کە باینجانو بازیان ئازادبکرێت. کە ئەمەش کرا خەڵکی سلێمانی بای ئەوە خۆی ئامادەکردووەو سلێمانیش ئازاد دەکرێت، کە سلێمانی ئازادکرا حکومەت بەتەواوی شپرزە دەبێت، چونکە بەئازادکردنی ڕانیەو سلێمانی بزوتنەوەکە ناکوژێتەوەو حکومەت بۆی کۆنترۆڵ ناکرێت. کە پێی کۆنترۆڵ نەکرا دەست بەدەست شوێنەکانی تریش ئازاد دەکرێت.

فعلەن بۆ ئەم بەرنامەزیە کاك ئەحمەد بچکۆل هەرئەوکاتە بەڕێکرا بۆ ڕانیە، محەمەد قادرمان نارد بۆ باینجانو بازیان. دوو برادەری ترمان ئامادەکرد کەبیان نێرین بۆ شەقڵاوەو کۆیە، بۆ ئەوە خۆیان ئامادەبکەن تاوەکو ڕانیە ئازاد دەکرێت، ئەمانیش لەشوێنەکانی خۆیان ووروژاندنی جەماوەر بەرزبکەنەوە تاوەکو هێزی پێشمەرگە دەگاتو شوێنەکان ئازاد دەکرێن.

هێشتا ئەمان نەرۆیشتبوون بۆ ئەو شوێنانەی کەبۆیان دانرابوو، هەواڵمان بۆ هات لە ئۆردوگای خەبات کە کەس نەگیراوەو دەستیان لەکەس نەداوە، هەندێك خەڵکی ناوچەکە تداخولیان کردووەو توانیویانە بکارودۆخەکە ئارام بکەنەوە، بۆ ئەوەی چیتر نەتەقێتەوە، حکومەتیش بەمە ڕازی بووە. بەڵام ئێمە بڕیارەکەی خۆمان جێ بەجێ

کرد، سلّمان نەکردەوە لەئازادکردنی ڕانیە، لەبەرئەوەی پێمان وابوو کە سەردەمەکە کامڵ بووە، سەرکردایەتی بەرەی کوردستانیش بڕیار لەسەر ڕاپەڕین نادات وە ئێمە پێویستە بیکەینە ئەمری واقع. بۆیە بەیانیەکەی ١٩٩١/٣/٥ کە ئەو ڕۆژە ئەحمەد بچکۆل لە ٣/٤ گەیشتبووە ڕانیەو خۆیان بۆ ڕاپەڕین ئامادەکردبوو.

ڕانیە لە ١٩٩١/٣/٥ ئازادکرا، کە هێزی پێشمەرگە هێشتا نەگەیشتبووە ناویەوە. وە دوای ئەمە لە ١٩٩١/٣/٦ کاك محەمەد قادر وانیش لە بازیان و باینجان ڕاپەڕینیان کردوو ئازادیان کرد، کە ئەمانە ئازادکرانی دەنگەکە زۆر گەورەبوو کە هێشتا هێزی پێشمەرگە هێشتا هەر نەگەیشتبووە ڕانیە. ١٩٩١/٣/٧ وەکو چۆن خۆمان بۆچوونەکانمان داڕشت فعلەن لە ٣/٧ خەڵکی سلێمانی توانیان دەست بەڕاپەڕین بکەن و شەڕ بەردەوام بوو تا ٣/٨، کە ٣/٨ بەتەواوی شاری سلێمانی ئازادکرا، لەو فەترە زەمەنیەش هێزی پێشمەرگە گەیشتنە ڕانیەو سلێمانیش.

کە هێزی پێشمەرگە گەیشتە ڕانیە ئێمە ترس و دڵە ڕاوکێ کانمان نەمات، کە پاشان گەیشتە سلێمانی ئیدی بەیەکجاری دڵنیا بووین و ئیدی ڕاپەڕین مەجرای خۆی وەرگرت و هات بەدوای داو وەك ئەوەی کە چۆن ئێمە تەسەوڕمان وابوو ڕاپەڕینەکە نەکوژایەوە. بەڵام بەرنامەی سەرهەڵدانی ڕاپەڕین ئێمە خۆمان دامان ناو خۆشمان سەرپەرشتیمان کرد، بەهیمەتی جەماوەرو هێزی پێشمەرگەش هاتە دوایی و گەیشتە ئەنجام.

پ٦/ پەیوەندی نێوان جەماوەرو ڕێکخستنە سیاسیە کوردیەکان تا چ ئاستێك بوو؟ بەتایبەتی لە شاری هەولێردا؟

و/ بەنسبەت شاری هەولێرەوە ئەوە پێشتر باسی ٣/٤ی خەباتم بۆکردی کە تیایدا دوو لە ڕێکخستنەکانی ئێمە شەهید بوون (عبدالکریمو.......). جەماوەری خەڵکی شاری هەولێرو دەوروبەرەکەشی بەتەواوی لەدەوری یەکێتی ئاڵابوون، لایەنە سیاسیەکانی تر دەورێکی ئەوتۆیان نەبوو. بەڵگەش لەسەر ئەوە دوای ئەوەی کە ئێمە بەبەرنامە ڕانیەمان ئازادکرد دوایی لە ٣/٦ باینجانو بازیانمان ئازادکرد، حیزبی شیوعی لەهەولێر پێی وابوو ئەم ڕاپەڕینانە شتێکی عەفەوین، بڕیاری دابوو کە لە ٣/٦ لە هەولێر ڕاپەڕین بکات، ئێمە هەواڵەکەمان پێگەیشت پێشتر، هەواڵمان بۆناردن کە ئەمە شتێکی عەفەوی نیە بەهەڵەدا مەچن، ئەمە بەرنامە ڕێژکراوە، ئەمڕۆ لە هەولێر ڕۆژی ڕاپەڕین نیە، وە ڕاپەڕینی هەولێر کاتو ساتی خۆی هەیە، ئێستا ڕاپەڕین بکەن تێك دەشکێن، ئێمە وەکو ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك هاوکاریتان ناکەین، بەڵام ئەوان هەر گوێشیان لێ ڕانەگرتین. خەڵکانی خۆیان ڕژاندە ناو شەقامەکانو کۆمەڵێك خەڵکی خۆیان هێنایە ناو شەقامەکان لە ١٩٩١/٣/٦. کە هەندێك تەقو تۆق ڕوویداو پاشان گیرانو تێك شکان.

پ٧/ لەبەرچی ئەمە نەبووە شکست بۆ جەماوەری خەڵکی هەولێر؟

و/ لەبەرئەوە دەتوانم بڵێم بەشی هەرەزۆری جەماوەرەکەش لەژێر کۆنترۆڵی ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك بوون. ئێمە لە هەولێر (٧٠٠) حەوت سەد شانەی چەکدارمان هەبوو، بەجۆراوجۆری ژمارە کە شانە چەکدارمان هەبوو لە (٣) سێ کەس پێك هاتبوو، هەبووش لە (٧٠) حەفتا کەس پێك هاتبوو، لەبەرئەوە ئێمە زۆر بەقوڵی چوبووینە ناو

جەماوەرەوە، توانیمان تحروك بەجەماوەر بکەین زۆر بەباشی. بڵێین پارتیو لایەنەکانی تر، (نصرالدین مستەفا) کە یەکێك بوو لەشانە چەکدارەکانی ئێمەو ئێستا لێپرسراوە لەناو پارتی. وە تواجودی فعلی هاوکاری هیچ لایەنێکی سیاسیی بۆ ئێمە نەبوو، ئێمە بەپێی تحرکی خۆمان دەستمان بۆهەر شوێنێك بردبێت هاوکاریان کردووین، بەشی زۆری مستەشارەکان هاوکاریان کردوووین، کە پەیوەندیمان پێوە کردوون. تەنانەت نامەکانی مستەشارەکانی دهۆکیش ئەوانەی لەسەرکردایەتی یەوە هاتبوون من خۆم لەگەڵ (م.خالید) بردمان بۆ دهۆك. مستەشارەکانی هەولێریش زۆریان هاوکاری زۆریان کردوین بە ئەنواعی چەكو تەقەمەنی.

وە مەفرەزە چەکدارەکانی کە لەلایەن سەرکردایەتیەوە ناردرابووە خوارەوە بۆ دەوروبەری شارەکان دەورو ڕۆڵی باشی هەبوو لەسەر دەروونی جەماوەر، وەکو مەفرەزەکانی مەلا سلێمانو بورهانی سەعید صۆفیو تەحسین کاوانیو .....تاد. کە بوونی ئەمانە لەدەوروبەری شارەکانو پەیوەندی کردنیان بەخەڵکەوە، زیندوێتی باشیان بەخەڵك دابوو. ئەو کارانەی ئێمە دەمان کردو ئەوان دەیانکرد، بێ ئەوەی هیچ تەنسیقێکیش هەبێت لەنێوانمان دەبوو بەتەواوکەری یەکتری، جگە لەوەش ڕادیۆکەمان توازنێکی زۆر باشی بۆ ڕاگرتبووین.

پ٨/ ئەو هۆکارە ڕاستەوخۆیانەی کە جەماوەری خرۆشاند چی بوون؟

و/ ئەو هۆکارانەی کە خەڵکی سازداو خرۆشاندنی بۆ ڕاپەڕین، بەڕای من چەند هۆکارێك بوون وەك:

١- ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان کە ڕۆڵی زۆری هەبوو.

٢- ڕێکخستنە ننهێنیەکان کە پێشتر ئیشی زۆر باشیان کردبوو، لەو کاتەشدا کاری زۆر باشیان دەکردوو سڵیان لەکەس نەدەکردەوە، بەتایبەتی دوای دانی بڕیاری (ئاشت بوونەوەی گشتی)، کە پەیوەندیان بە هەموو جۆرە کەسێکەوە کرد، کە ئێمە (٧٠٠) شانە چەکدارمان هەبوو، ئەمەش فراوانبوو کە دەمان توانی بچینە هەموو کون و کەلەبەرێکەوە.

٣- بوونی مەفرەزە پارتیزانەکان لەدەوروبەری شارەکان، کە دەورێکی باشی هەبوو لە دڵ و دەروونی جەماوەر. کەبەبیستنی ئەوەی کە پێشمەرگەیەك بینراوە، ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی کە جەماوەر زیاتر دڵنیابن لەڕاستی بەرنامەکان و گەشبینی لە دەرەنجامی کارەکانمان.

٤- وە هۆکارە دەروونیەکانی تریش کە پێشتر باسمان کردوون کاریگەری لەسەر هەست و نەستی جەماوەر هەبوو، کە هەموو ئەوانە وایانکرد کە ڕاپەڕین ئەنجامێکی نمونەیی بەدەست بهێنێت، بۆیە دەڵێم نمونەیی، چونکە گرنگە لە شارێکی وەکو هەولێردا کە بنکەی فەیلەقی (٥) و منظمەی شمالی بوو، بتوانرێت بەهاوکاری ڕێکخستنەکان و هێزی پێشمەرگە و جەماوەر لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا هەولێر ئازاد بکرێت. جگە لەوەی کە لەڕۆژەکانی پێش ڕاپەڕین حکومەتی عێراقی بەرنامەی ئەوەی داڕشت بوو کە دەوری هەولێر بەهێزێکی نوێ بتەنێت.

پ٩/ هەڵوێستی ڕژێم چۆن بوو بەرامبەر بە جەماوەر؟

و/ تەبعەن دوای ئەوەی کە ڕانیە ئازادکراو سلێمانی و ناوچەکانی تر ئازادکرا گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ڕاپەڕین ناکوژێتەوەو پێی کۆنترۆڵ ناکرێ، دەیویست کۆنترۆڵی هەولێر بکات، بۆیە هێزێکی زۆر گەورەی

هێنایە دەوری هەولێرو دەوروبەری بەنیازی ئەوەی کە دەوری هەولێر هەموو بتەنێت‌و کە نیازی بوو ڕەشبگیری هەولێر بکات، هەرچی گەنج‌و پیاوی ناو هەولێر هەیە وەکو ئەوەی کە لە کەرکوك کردی هەموویان بگرێت‌و دووریان بخاتەوە بۆ ئەوەی نەتوانن هاوکاری ڕاپەڕین بکەن دژی حکومەتی عێراقی، بەڵام خۆشبەختانە ئێمە بەرنامەکەی حکومەت ئاگاداربووین‌و دەستی خۆمان پێش دەستی حکومەت خست‌و ئەو هێزەی کە هێنابووی ئەویشمان تەفروتوناکرد.

پ١٠/ واتە پێش ئەوەی حکومەت ڕەشبگیریەکەبکات، ڕاپەڕین بەرپابوو؟

و/ بەڵێ، هێزەکانی ڕژێم هاتبوون لە ٣/١٠ بەنیازبوون لە ٣/١١ دەستی پێ بکەن، بەڵام ٣/١١ ئێمە پێش ئەوان دەستمان پێ کرد.

پ١١/ سەرچاوەی چەکەکان؟ وە جۆری چەکەکان؟

و/ سەرچاوەی چەکەکانمان بریتی بوون لە چەکەکانی لای جاشەکان کەکاتی خۆی حکومەت دابەشی کردبوو بەسەر فەوجە سوکەکان، هەرچەندە سەردەمانێك دژی کورد بەکارهات، بەڵام ئەم چەکانە دوو سەری هەبوو، سەرێکیان سەرەتا دژی کورد بەکارهات، بەڵام سەرەکەی دووەمیان لەم دواییەدا دژی خۆی بەکارهات. وە ئەو چەکانەی کەلەدەستی ڕێکخستنەکان‌و یان هێزی پێشمەرگە دابوون ژمارەیان زۆر کەم بوو، بۆیە ئەگەر ئەم هەموو چەکە زۆرەی فەوجەکان نەبوایە نەدەتوانرا ڕووبەڕووی هێزێکی گەورە ببینەوە لە ڕاپەڕینێکی ئاوا گەورەدا. ئەمە جگە لەوەی کە کاك کۆسرەت کە هاتنم گەیشتنە شەقلاوە، بەشی زۆری ئەو چەکانەی کە گرتبوویان ئێمە بەشێکی زۆر باشمان لێ گواستەوە بۆناوشار بۆ مەفرەزەکانی خۆمان، بەڵام ئەمەش

دەتوانم بڵێم ئەگەر هەر ئەوەندە چەکە بوایە لەگەڵ ئەو چەکانەی کە لەلای خۆمان هەبوو بەشی ناکرد، ئەگەر ئەو هەمووە چەکەی کە مستەشارەکان‌و جاشەکان وەرنەگیرایە یان خۆیان چەکەکانیان ئاراستەی دوژمن (ڕژێم) نەکردبایەوە. وە جۆری چەکەکانیش بریتی بوون لە کلانشیکۆف‌و ئاربیجی کە چەکی سەرەکی بوون، وە ووردە چەکی وەك دۆشکاو بیکێسی هەبوون، بەڵام زۆر کەم بوون.

پ١٢/ ڕۆڵی ژنان چۆن بوو؟

و/ ئێمە وەکو ڕێکخستنەکانی خۆمان خەتێکی ژنانمان هەبوو، کە لە پیاوەکان ڕۆڵێکی کەمتریان نەبووە بەتایبەتی لەگواستنەوەی کەل‌و پەلە نهێنی یەکان (چەك‌و نامە). وە لە سەنگەرەکانیشدا شان بەشانی پێشمەرگە هاوکار بووینەو شەڕیان کردووە بەتایبەت جەرگ سووتاو‌و داخ لەدڵەکان، وە ژمارەشیان زۆر لەوە زیاتر بووە کە بتوانرێت ناویان یەکەیەکە بهێنێت.

پ١٣/ سەرپەرشتیاری هێڵی ژنان کێ بوو؟

و/ سەرپەرشتیاری هێڵی ژنان کچێك بوو ناوی (حەنیفە) بوو، وە یەکێکی تر ناوی (شیرین) بوو کە شیرین شووی بە (ئەحمەد) کرد، کە هێلێکی زۆر چالاك‌و گرج‌و گۆڵ بوون، تا دوای ڕاپەڕینیش زۆر بەگەرم‌و گوڕی کاریان دەکرد، بەڵام دواتر لەبەرئەوەی ئیشی من ئەوە نەما، من ئاگام لێ یان بڕاو نازانم چیان بەسەرهات.

پ١٤/ ڕۆڵی مستەشارەکان چۆن بوو؟

و/ بەنسبەت مستەشارەکانەوە لەوانەیە هەندێکیان هەستی نەتەوایەتیان هەبوووبێت، بەڵام من ناتوانم بڵێم ١٠٠٪ مستەشارەکان هەستی نەتەوایەتی پاڵی پێوە نابوون، چونکە پێشتر ئەومەجالە هەبوو

**کە ئەم هەستەیانی پیّ دەربڕن. وە بەشێکیشیان پەیوەندیان هەبووە لەگەڵ هێزی پێشمەرگە، بەڵام من ئەو پەیوەندیەشیان بە دوو فاقی دەزانم لەڕاستیدا، واتە هەم خۆشیان لە پێشمەرگە بپارێزن و هەمیش لەولا بخۆن. بۆیە بەشێوەیەکی گشتی لەبەر خۆدەربازکردن و بەڕێ کردنی دۆخەکە بووە، بۆ قەرەبووکردنەوەی کارەکانیان بووە بەهۆی لێبوردنی گشتی یەوە کە لەلایەن بەرەی کوردستانیەوە دەرچووبوو.**

**پ١٥/ ڕۆژی ٣/١١ بەپێی بەرنامەیەکی پتەوبوو؟ چەند حیزبی کوردی تیایدا بەشداربوو؟**

**و/ دوای ئەوەی کە ڕانیەو سلێمانی و ناوچەکانی تر ئازادکران، جەماوەری شاری هەولێر دەکولان، وە ڕێکخستنەکان زۆر تینیان بۆ هاتبوو تەحەمولیان کەم بوو بۆوە. لەلایەکی تریشەوە حکومەت هێزەکانی لەدەوری هەولێر کۆکردبۆوە بۆ ئەوەی هەولێر کۆنترۆڵ بکات، مەترسی ئەوەش زۆر زەق بووبۆوە. ئێمە پێمان وابوو کە هێزی پێشمەرگە دواکەوت، لە ٣/٨ هێزی پێشمەرگە نەگەیشت دواکەوتبوو بڕیارماندا ئێمە ٣/٩ خۆمان بچین بەرەو پیلیان. لە ٣/٧ کە سلێمانی ئازادکرا برادەرانی ئێمە پەلەیان تێ کەوت و من خۆم ٣/٨ بەڕێ کەوتم چووم بۆ شەقڵاوەو لەوێ تەحسین کاوانی م بینی کە پێشتر وەك مەفرەزەکانی تر هاتبووە خوارەوە، کە ئەو لەوێ جیهازێکی پێ بوو لەڕێگەی ئەو جیهازەوە پەیوەندیمان کرد بەکاك کۆسرەت بۆ ئەوەی پەلەبکەن و بێن ناوچەکان ئازادبکەن. نیوەڕۆ لەگەڵ تەحسین کاوانی لەگوندی کاوانیان نانی نیوەڕۆمان خوارد، بەنیازی ئەوەی هەرچۆنێك بێت کاك کۆسرەت و برادەران بێن و بیان بینین و شتەکانیان پێ بڵێین، لە نان خواردن بوو بووینەوە کاتێکمان زانی شەهید عەبدولڕەزاق و**

سەفینی مەلا قەرەو ئەم برادەرانە هەموو گەیشتنە کاوانیان، کە نەرم نەرمیش باران دەباری. پرسیاری کاک کۆسرەتم کرد شەهید عەبدولڕەزاق ووتی لەگەڵ شەهید حەسەن کوێستانی وا لە (بانە نۆکن). پاشان لەگەڵ ئەو برادەرانە چووین بۆ لای کاک کۆسرەت کە حەسەن کوێستانیش ئامادەبوو، لەوێ بەرنامەی چۆنیەتی ئازادکردنی هەولێرمان داڕشت.

ئێمە پێمان وابوو کە فەوری بێن کە هەرئەوشەوە یان بۆ بەیانیەکەی هەولێر ئازادبکەین، بەڵام کاک کۆسرەت پێی باش نەبوو، چونکە کاک کۆسرەت حەزی دەکرد بکەوێتە ٣/١١ لەبەرئەوەی کە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی مێژووییە، کە ١١ی ئازاری ٧٠ بەیاننامەیەکی مێژووییە بۆ کورد. وە هۆکاری دووەمیش بۆ ئەم ڕۆژە، کاک کۆسرەت پێی وابوو کە ئەو پەلە پەلەیە کارەکانمان تەکامول ناکات، ئێمە ناتوانین هەموو موقعو شوێنەکان بەتەواوی بگرین، وە دابەشکردنی پێشمەرگەکانی خۆمان بەتەواوی بکەین. ئەوە جگەلەوەی کاک کۆسرەت کەسێکە ئەزموونی لەپێشینەی هەیە لەئازادکردنی شاروشارۆچکەکان لەپێش ئەنفالەکان. بۆیە دوای ئەوەی کە هەموومان قەناعەتمانکرد بە بۆچوونەکەی کە دەبێت ٣/١١ بێت، پێکەوە دەستمانکردە دانانی نەخشەیەکی وورد بۆ ئازادکردنی هەولێر، کە دەستمانکرد بەچۆنیەتی دابەشکردنی شانە چەکدارەکانو دابەشکردنی قاتعەکانو کە لەکوێنو لەکوێ نین، وە چی بکەینو چی نەکەین، کە بەشێوەیەکی وورد ئەم بەرنامەیەمان داڕشت. هەروەها برادەران چەکێکی باشیان کۆکردبۆوە لەگەڵ خۆیان هێنابوویانو دایان بەئێمەو ئێمەش سوودی باشمان لێ بینیو لەگەڵ خۆماندا بردمانەوە بۆ هەولێر، وە من لەو سەفەرەدا دوو

برادەری ترم لەگەڵ دابوو کە بریتی بوون لە (جەبار شێخەو ئەوی تریش زاهیر بەناوی نهێنی نەدار)، پێکەوە چووینەوە بۆ هەولێرو کاك کۆسرەتیش ڕەمزێکی بۆ دانابین لە بانە نۆك لە شەقلاوە، بەناوی ئەوەی: "لەباوکی ڕێناسەوە بۆ شانە چەکدارەکانی بروسك دەست بەکاربن"، ئەوا واتە ئێمە گەیشتووین‌و ئێوەش لە کاتژمێر شەشی بەیانی دەست بەکاربن. بەم شێوەیە بەرنامەی ئازادکردنی هەولێر لە بانە نۆك کە دێیەکی نزیك بە شەقڵاوەیە لە ٣/٨ دانراو بەنهێنی‌و بەم ڕەمزەی سەرەوە چووینەوە بۆ هەولێر.

پ١٦/ باشە با بێینە سەر چۆنیەتی ئازادکردنی هەولێر؟

و/ وەکو ئیشی ئێمە کە شانە چەکدارەکان بووین نەك وەك هێزی سەربازی، هەستاین بەوەی کە هەولێرمان دابەشکرد بەسەر (٥) قاتع، بەم شێوەیە:

١- لەخەتی کۆیەوە بۆ خەتی مەخمور، کە دێدەوان سەید محەمەد لێپرسراوی بوو.

٢- لەخەتی کۆیەوە بۆ خەتی شەقڵاوە، نەدار/ زاهیر لێپرسراوی بوو.

٣- ئەوی تریان قاتعی معسکر بوو، کە لە خەتی مەخمورەوە تا دەهاتە ناو معسکر، سالارە شەل لێپرسراوی بوو.

٤- قاتعێکی تریش کە لەناوەوە بوو، بەناوی قاتعی داخلی، ئەحمەد ئیسماعیل (ئەحمەد گەل) لێپرسراوی بوو.

٥- لە خەتی شەقڵاوەوە بۆ معسکر، ئەم قاتعە مام خدر لێپرسراوی بوو.

لەڕاپەڕینی هەولێر بەهیچ شێوەیەك نەحیزبێکی ئیسلامی نە حیزبە کوردستانیەکانی تر یەك ڕۆڵیان نەبووە.

**پ١٧/ ئەی چۆنیەتی دەست پێکردنی تەقەی ڕاپەڕین لە هەولێر چۆن بوو؟**

و/ شانە چەکدارەکان هەموو ئاگادار کرابوونەوە کە ئەگەر شەوی ١٠-٣/١١ ئێوارەکەی گوێیان لە بروسکەکەبوو (باوکی ڕێناس)، ئەوا هەموو دەبێت لە کاتژمێر ١٢ی شەوەوە بچن بۆ شوێنەکانی خۆیان‌و بەیانی لەگەڵ کاتژمێر ٦ دەست بەکاردەبن‌و ڕاپەڕین دەست پێ دەکەن. فعلەن ئەمانە هەمووی کرا، پاش ئەوەی کە بروسکەکە ئێوارەی ١٠-١١/ی ٣ لە کاتژمێر ٨ی شەوەوە چەندان جار دووبارە دەکرایەوە بۆمان.

بەڵام ڕۆژی پێش ڕاپەڕین لە هەولێر کە بەرواری ١٠ی٣ بوو، حکومەت بڕیاری منع تجولی دەرکردبوو، وە هێزێکی زۆری هێنابوو بۆ دەوروبەری هەولێر، کە بەنیازبوو لە هەولێر ڕەشبگیری بکات، بەڵام ڕۆژی ١٠ی٣ ئەمەی بۆ نەچووە سەرو هەموو شوێنەکانی بەتەواوی بۆ نەگیرا، بەڵام بەنیازبوو ڕۆژی دواتر ٣/١١ دەست بکات بە ئەنجامدانی مەرامەکانی خۆی، بەڵام پێش ئەوەی ئەو دەست پێبکات ئێمە لە کاتژمێر ٦ی بەیانیەوە دەستمان بەکارەکان کردوو ڕاپەڕین چەخماخەی بەست. بەشێوەیەکی زۆر باش جەماوەرو ڕێکخستنەکان پێکەوە تکامل بوون، چونکە قەناعەتی خەڵکیش گەیشتبووە ئەو بڕوایەوە کە ئەگەر لەم ڕۆژە هەولێر ئازاد نەکرێت، ئەوا هەموو مان ڕوو بەڕووی چارەنووسێکی نادیار دەبینەوە لەو کارەی کە حکومەت بەتەمابوو ئەنجامی بدات.

بەم شێوەیە ڕاپەڕین لەهەموو لایەکی شار دەستی پێکردوو توانرا لەماوەیەکی کەم سەرکەوتن بەدەست بهێنین. خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە

لە مێژووی ڕاپەڕینی هەولێر، کە ئەویش ئەوەیە یەکێك لەپیاوانی ڕژێم کە پێشتر پەیوەندی پێمانەوە هەبوو، هاتە لام و ووتی پارێزگارو قائد فەیلەق تەکلیفیان کردووم کە یەکێك لە جەمسەرەکانی ڕابەرایەتی کردنی ئەم کارانە بدۆزمەوە بۆیان کە پەیمانیان داوە بینایەی پارێزگاو فەیلەق تەسلیم بکەن، بەمەرجێك گیانیان پارێزراوبێت. منیش بە پیاوەکەم ووت تۆ وتووتە کەس دەناسم؟ ووتی نەخێر، بەس ووتومە تاقیبتان بۆ دەکەم. دە گوتم بڕۆوە بۆ لایان بڵێ کەسم نەدۆزیەوە، چونکە ئێمە پێویستمان بە پارێزگارو قائد فەیلەق نیەو بەهێزی خۆمان شار ئازاد دەکەین، کابرا ووتی بۆ کاکە با خوێن نەڕژێت و ئەمە بۆ خراپە؟، ووتم کاکە پارێزگارو قائد فەیلەق درۆ دەکەن، ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن بابچن لەپشت ئەو گردەوە کاك کۆسرەتی لێ یە با خۆیان تەسلیم بەو بکەن و پارێزراویش دەبن، بۆ دێنە لای من چ ئیشیان بەمنە، بەڵام ڕاست ناکەن، بەڵکو دەیانەوێت بمانکەنە چەپکەگوڵی دەستی خۆیان و پێشکەشی بەعسمان بکەن. چونکە زۆر لایان مەبەست بوو کە یەکێك لە معارەزەکان بگرن و بەبەرچاوی خەڵکەوە گوللە بارانی بکەن بۆ چاوشکاندنی خەڵك و کپ کردنەوەی ڕاپەڕینەکان. بۆیە ئەمەش بە خاڵێکی گرنگی مێژووی ڕاپەڕینی هەولێر دادەنرێت، چونکە توانیمان خۆمان لەو فێڵە دەربازبکەین و تووشی مەترسی نەبین.

پ١٨/ ئەی کەش و هەوای ئەو ڕۆژە چۆن بوو؟

و/ وادێتە خەیاڵم کە ئەو ڕۆژە ساماڵ بوو، بەڵام بەهۆی دووکەڵ و بۆن و تۆزی باروت تۆزێك دنیا تەماوی بوو بوو.

پ١٩/ ئاستی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن لەساتەکانی ڕزگارکردنی شوێنەکان چۆن بوو؟

و/ پەلامارەکانی شانە چەکدارەکان‌و پێشمەرگەو جەماوەر ئەوەندە کت‌و پڕ بوو، وە لەلایەکی تریشەوە ڕاپەڕین لە شوێنەکانی تری کوردستان سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، کە ئەمەش هۆکارێکی هاندەری جەماوەربوو لەلایەك، وە لەلایەکی تریشەوە هۆکاری وورە بەردان‌و بێ وورەیی هێزەکانی بەعس‌و پیاوەکانی بوو، چونکە دەیانزانی ئەگەر مقاوەمە بکەن ئەوا ئەو ڕۆژەیە کە تۆڵەیان لێ دەکرێتەوە، بۆیە پێم وایە ئەوانیش بەشێوەی جاران بەرگریان نەکردوو هەرزو چۆکیان داداو تێك شکان.

پ٢٠/ ئەی چ شوێنێك زۆر مقاوەمەی تێداکرا؟

و/ هەولێر بە ٣ کاتژمێرێك ئازادکرا، بەڵام ئەو شوێنەی کە درەنگ ئازادکراو مقاوەمەی زۆری لێ بوو مەنزومەی ئیستخباراتی شمالی بوو، کە تاوەکو کاتژمێر ٢،٣٠ بۆ ٣ی دوای نیوەڕۆ درێژەی کێشا، پاشان بەگەیشتنی هێزی پێشمەرگە ئەوێش ئازادکرا.

پ٢١/ ژمارەی بریندارو شەهید چەند بوو؟

و/ لەهەموو قاتعەکان شەهید هەبوو کە سەرنج ڕاکێش نەبوون، واتە کەسانی گەورەو لێپرسراو نەبوون، بەڵام بریندار ژمارەیان زیاتر بوو.

پ٢٢/ ئەی چارەنووسی پیاوانی ڕژێم چی بوو؟

و/ ئەوانەی کوژران کوژران‌و ئەوانەشی هەڵاتن دەربازبوون، ئەوانەشی بەدیل گیران هەڵس‌و کەوتی هێمنانەیان لەگەڵ دەکرا. بۆ نمونە عەبدولڕەزاق ناوێك کە گیرا هێنایانە لای من، کە زۆر ڕێزمان لێ گرت‌و داوامان لێ کرد کەچی هەیە زانیاری دەربارەی بەندکراوە شاراوە نهێنیەکان پێمان بدات، تاوەکو بیکات بەدیاری خۆی بۆمان، کە

هەرچەندە زوڵم‌و زۆری لە کورد کردبوو، وەپاشان دواتر دامانە دەست بەرەی کوردستانی‌و لەکاتی هێرش‌و پەلامارەکانی ڕژێم‌و گرتنەوەی شارەکان، چارەنووسی نازانم چی لێ بەسەرهات.

پ٢٣/ زۆر باشە بابێینەوە سەرباسی شانە چەکدارەکانی بروسك‌و کورتە مێژوویەکیمان بۆ باس بکە؟

و/ دوای ئەنفالەکان کە سوپای ڕزگاری کوردستان (سرك) دامەزرا، پاشان لەکاتی گرتنی کوێت لەلایەن عێراقەوەو بەرنامە دانانی راپەڕین، بڕیارماندا کە خەڵکانی ناو ئەو سوپایە بکرێن بەهەوێنی دروستکردنی ئەو شانە چەکدارانەو کە ناومان لێنا (شانە چەکدارەکانی بروسك) لەگەڵ کاك مستەفا سەید قادر لەکۆتایی مانگی ١٠ی ١٩٩٠ بیرمان لەوە کردەوە. وە سنووری ڕێکخستنەکانی زۆر فراوان بوو، کە لە هەولێرەوە تاکو ڕانیەو لەوێشەوە تاکو دهۆك‌و کەرکوك، کە هەموو ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کەشیرازەی ڕێکخستنەکانی بەوێدا تێدەپەڕی، وە بەنسبەت لێپرسراوەکان، مسئول تەنزیماتی هەرشوێنێك لێپرسراوی ئەو شانەیە بوو. بەنسبەت هەولێرو دەوروبەری ئەوا خۆم لێپرسراوی بووم.

پ٢٤/ بارودۆخەکە دوای ڕاپەڕین چۆن بوو؟

و/ بەنسبەت ڕێکخستنەکانەوە ئێمە پێمان وابوو کەنابێت هیچ وەسائق‌و کەل‌و پەلی دام‌و دەزگاکان بفەوتێن‌و بسوتێندرێن، وە ڕێکخستنەکانی خۆشمان لەوە ئاگادراکردبۆوە کە گڕ لەهەر شوێنێك بەربدەن ئەوا خۆشی دەخەینە ناو گڕەکەوە، کە ئەوەندەی لەدەستی ئێمە دابوو. بەڵام پاش ئەوەی کە هێزی پێشمەرگە دەگەیشتە ئەو شوێنەوە ئەوا یەکسەر تەسلیمی دەستی ئەوانمان دەکرد، چونکە

پێشمەرگە هێندە لەلامان پیرۆزبوو. وە هێزی پێشمەرگەی ئەوکات یەك سەرکردایەتی هەبوو کە ئەویش بەرەی کوردستانی بوو. کە لەنێوانی لایەنەکانی ناو بەرەی کوردستانی دا لێك حاڵی نەبوونێك هەبوو، وە پێم وایە بەرەی کوردستانی چاوەڕوانی سەرکەوتنی ئاوا لەو جۆرەیان نەدەکرد، واتە تەسەوریان نەدەکرد بەم شێوە گەورەیە سەرکەوتن بەدەست بهێنین. بۆیە دوای ئازادکرنی ناوچەکان بێ ڕێکخستنیو بێ کۆنترۆڵی پێوەدیاربوو، کە بووە هۆی ئەوەی ڕێگە بەخەڵك بدرێتو دەست کرا بەتاڵان کردنو وێران کردنی دامو دەزگاکانی حکومەت، ئەمەش ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو لەسەر ئەوکەسو پێشمەرگانەی کە پێشتر لە ڕاپەڕین دەورو ڕۆڵێکی باشیان دیتبوو، بەڵام ئەوانیش بەم کارەوە خافڵانو خەریکی تاڵانو بڕۆو پاتاڵی بوون، کە ئەمەش بووە هۆی پچڕانی یەك ڕیزیو پەرتەوازەیی پێشمەرگەو هەمووی خەریکی تاڵانو پاتاڵ کردن بوون. بەمەش نەفسیەتی جەماوەر ڕووخاو مردو ڕۆییو نەما.

پ٢٥/ یەعنی جەماوەر وورەی نەماو ڕووخاو ساردبۆوە؟ یان بەواتایەکی تر وورەی جەماوەر دوای ڕاپەڕین چۆن بوو؟

و/ دوای ڕاپەڕین ئەو جەماوەرەی پێش ڕاپەڕین نەبوو، چونکە خەڵك واقعەکەی بەچاوی خۆی بینی کە خەریکی شرە خۆریو پاتاڵی بوون، کە دەیبینی هاوڕێکەی کۆڵێکی بەشانەوەیەو خەریکە شت دەربازبکات، ئەوا ئەویش قەناعەتی بەوە نەبوو کە بەرگری بکات لە کۆڵەکەی ئەو، بۆیە گیانی بەرگری کردن نەماو هەمووی ڕوی لە هەڵاتنو بیری لای دەربازکردنی کەلو پەلەکانی بوو.

پ٢٦/ تۆ گرنگترین کارێك کە ئەنجامت دابێتو جێگەی

شانازیت بێت چی بووە؟

و/ دوو خاڵی گرنگ هەبوون بەلامەوە:

١- بڕیاردان لەسەر ڕاپەڕینو دانانی بەرنامەی ڕاپەڕین بووکە سەری گرتو بووە هۆی ئازادکردنی هەموو کوردستان.

٢- ئەوەیان تایبەتە بە هەولێر کە ڕەفز کردنەوەی داواکەی پارێزگارو قائد فەیلەق بوو، کە ئەویش بووە هۆی ئەوەی ئاشکرا نەبینو ڕاپەڕینی هەولێر سەر بگرێت.

پ٢٧/ بەڕای تۆ هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین بەگشتی بۆ چی دەگەڕێنیەوە؟

و/ پێم وایە بەگشتی لەبەر ئەم هۆکارانە بوو:

١- پاتاڵیو شڕەخۆری لەلایەن خەڵکەوە.

٢- بەنسبەت هێزی پێشمەرگەوە کە ئەوکات هێزی پێشمەرگە هێزێکی ڕێکخراوی تەواو نەبوو، کۆنترۆڵ بەسەری دا نەدەکرا. هەروەها هێزی پێشمەرگەی کوردستان چاوەڕوانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەیان نەدەکرد، کە تاکو خۆئامادەکردنێکی ئاوا گەورەشی بۆ بکەن بۆ بەرگری کردن لێی.

٣- ئەو بەرنامەیەی دانرابوو بۆ بەرگری کردن، بەرنامەیەکی پتەوترو وورد تری دەویست لەچاو ڕووداوەکاندا بۆ کاتی بەرەنگار بوونەوە.

٤- بەنسبەت هەولێر ئەو خۆگرتنەوەیەی کە لە (کۆڕێ) بوو کە بووە هۆی ئەوەی کە چەندان دەبابە لە حکومەت بسوتێننو زەبرێکی کوشندە لە دوژمن بوەشێننو بەر بە هێزەکانی دوژمن بگرن، کە ئەمەش بە قەناعەتی خۆم بۆ قارەمانیەتی کاك کۆسرەت دەگەڕێتەوە.

**شەشەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ (شاخەوان عەباس[1])، سلێمانی- ماڵی تایبەتی خۆی، پێنج شەممە، شەوی ١٦-١٧/١/٢٠٠٣:**

**پ١/ بارودۆخی سیاسی کوردستان بەگشتیو شاری هەولێر بەتایبەتی بەر لە ڕاپەڕین چۆن بوو؟**

و/ دیارە بارودۆخی کوردستان ئەو سەردەمە بەگشتی سەردەمێك بوو پێشی ڕاپەڕین ئەو سەردەمانە بوو کە شەڕی نێوان عێراقو ئێران وەستابوو، عێراق خۆی بەهێزێکی یەکجار گەورە دەزانی، خۆی بە دیفاع کەری وولاتانی عەرەبی دەزانی، پاڵ پشتی لێدەکرا لەلایەن دەوڵەتە عەرەبیەکان، ئیمکانیاتێکی باشیان خستبووە بەردەستی صدام بۆ ئەوەی بەکاری بهێنێ لە شەڕ دژی حکومەتی ئێرانی، هەموو ئەوروپا بەتایبەتیو لەسەروی هەموویانەوە ئەمەریکاو بەریتانیاو ئەڵمانیا ئەوانە هاوکاری زۆری عێراقیان دەکرد ئەو سەردەمانە، بەهۆی ئەو هاوکاریە گەورەیە بەشێوەیەك شەڕەکە وەستا، خومەینی ناچار بوو بڵێ من گلاسێك ژەهرم خواردەوە. ئەوە دەبینی کە ناخۆش بوون بوو ناڕەحەت بوو کە ئەو قسەیەی کردو گوتی من گلاسێك ژەهرم خواردەوە، لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین صدام لەقمەی مغروری بوو، زۆر

---

(١) لەساڵی ١٩٧٧ پەیوەندی کردووە بەریزەکانی هێزی پێشمەرگەی ی.ن.كو ڕۆژی ١ی شوباتی ٢٠٠٤ بەدەستی تیرۆریستان لەکردەوەیەکی خۆکوژی لەبارەگای مەڵبەندی ٣ی ڕێکخستنی ی.ن.ك لە شاری هەولێر، کە یەکەمین ڕۆژی جەژنی قوربان بوو تیرۆرکراو چووە کاروانی شەهیدان. شەهید شاخەوان دواپلەی ئەندامی سەرکردایەتی ی.ن.ك بوو. لە ڕۆژانی بەرگری کردن لەدوای ڕاپەڕین لە هەولێرو دەوروبەری ڕۆڵی گرنگی بینیوە.

زۆر مغرور بوو، ئەو سەردەمانەش بوو کە چەند ڕۆژنامە نووسێك هاتبوون پرسیاریان لە جەنابی مام جەلال کردبوو، گوتبوویان پێت وایە صدام چ دەکا؟ لەوەلآمدا گوتبووی صدام کابرایەکی سەر شێتە، مەحالە ئەوهالە بووەستێت‌و پەلاماری دەوروبەری خۆی دەدات، بەتایبەتی پەلاماری کوێت دەدات.

وەزعی کوردستان ئەو سەردەمانە کە حکومەتی عێراق لە شەڕی ئێران وەستاو کۆتایی بە شەڕەکە هات، ئەو سەردەمانەش هێزێکی یەکجار گەورەی لەبەردەست بوو، دەست بەتاڵ بوو، بەهۆی ئەوەی لەسەردەمی شەڕو پێکدادانەکانی نێوان ئێران‌و عێراق هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سنوورەکانی هەولێر-سلێمانی-کەرکوك، چالآکی یەکجار یەکجار گەورەیان کردبوو، دەیان‌و سەدان نەبەردی گەورەو سەرکەوتنی گەورەو دەستکەوتی گەورەی تیا بەدەست هاتبوو، هەر لە دابان سەری ڕەش‌و لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکوك‌و وە ڕژێمی بەعس لەسەرووی هەمووشیانەوە صدام بەڕاستی لە تۆڵەکردنەوەی گەلی کورد بوو، بۆیە ئەنفالەکان دەستی پێکرد، لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی عێراق‌و ئێران، ئەنفالی یەك‌و دوو و سێ‌و چوارو ئەوانە هەر لە ناوچەی سەرکردایەتیەوە ئەنفالی یەك دەستی پێکردو بارەگاکانی سەرکردایەتی کە بۆ ماوەی (٤٠) چل ڕۆژ بەرگریان کرد، شەڕو پێکدادانێکی جەبهەیی بوو، لە جەبهەی سەرگەڵوو بەرگەڵوو و دابان‌و ئەوانە.

حکومەتی عێراق چەندین ئیمکانیاتی هەبوو خستیە گەڕ بۆ لەناوبردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی ی.ن.ك، ئەوڕۆژانە ڕۆژانی سەختی زستان بوو، بەفرێکی زۆر باری بوو، ماڵ‌و منداڵی پێشمەرگە لە وەزعێکی خراپ بوون، بۆیە دوای (٤٠) ڕۆژ مقاوەمەت بڕیاری پاشەکشەدرا، کە

شەهیدو بریندارێکی زۆر دراو حکومەتیش زیانی زۆری لێ کەوت، ئەمە ئەنفالی یەك بوو. ئەنفالی دووەمیش لە گەرمیان‌و دەوروبەری دەست پێدەکات، کە ئەو ناوچانەی هەموو خاپور کردوو لەسەرجەم چین‌و توێژەکانی کۆمەڵی بەندکردو پاشان ئەنفال کران. دوای ئەنفالەکانی ١و٢و٣و٤و ئەوانە، دێهاتەکانی کوردستانی هەموو چۆڵ کرد.

پ٢/ ئەی بارودۆخی شاری هەولێر چۆن بوو؟

و/ ئەو سەردەمانە هەولێر کە دەوروبەری هەموو تەندرابوو بە ئۆردوگا، کە خەڵکی بادینان‌و تەلەعفەر یان گواستبۆوە بۆ دەوروبەری ئۆردوگاکانی هەولێر. جگە لەمانە لەساڵی ١٩٧٧ەوە هەتاکو ئەنفالەکان‌و دوای ئەنفالەکانیش هەموو دێهات‌و قەزاو ناحیەکانی ڕاگواست‌و هێنانیە ئۆردوگاکانی دەوروبەری هەولێر. کە (١٨٢) هەزار ئینسانی کوردی ئەنفال کردوو بەمەش مەترسیەکی ئێجگار گەورە لە دەروونی خەڵك دروست بوو بوو. جگە لەوەش ئەوەم لەبیرکرد کە شەڕەکانی سەرکردایەتی دەستی پێکرد، ئیتر بووە شکاندنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ڕووخاندنی بارەگاکانی سەرکردایەتی، کە هێزی پێشمەرگە مقاوەمەیەکی بەگڕو بەهێزیان دەکرد، مقاوەمەیەك بوو کە ئەو مقاوەمەیە لایەنی دوژمنیان دەشکاند، بۆیە پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی ماددەی کیمیایی.

لەشاری هەڵەبجە زیاتر لە (٥٠٠٠) هەزار خەڵکیان شەهیدو بریندار کرد، ئەمەش بۆ شکاندنی هێزی پێشمەرگەو شکاندنی مەعنەویاتی هێزی پێشمەرگە بوو، کە لە شەڕەکانی سەرکردایەتی‌و هەروەها لە دۆڵی بالیسان‌و بادینان‌و ئەو ناوچانە بەکاری هێنا. بەڕاستی مەوادی کیمیایی بەکارهێنا مەبەست ئەوەیە کە سەردەمی ئەنفالەکان کە

دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی بڵێین مانگی ٩ی ساڵی ١٩٨٨ دەستی پێکرد بەرەو کۆتایی ئەوەبوو هیچ کەس لەسەر خاکی خۆی نەما، هەموو لە ئۆردوگاکان جێ نشین کرا، وە خەڵك لە شارە گەورەکان بەڕاستی مەترسی زۆر گەورە لەناو دڵو دەرونی جێگیر بوو بوو، بەتایبەتی لە ئۆردوگاکان هەمیشە مەترسی ئەوەدەکرا. شەوێك لە شەوەکان چواردەوری ئۆردوگاکان بگرێتو کە تەجروبەی پێشووی هەبوو، چۆن چواردەوری ئۆردوگای بارزانیەکانی لە قوشتەپەو بەحرکەو هەریرو ئەو ناوچانە گرتوو ئەنفالی کردنو زیندەبەچاڵی کردن، کە نزیکەی (٨٠٠٠) هەزار بارزانی ئەنفال کرد.

ئۆردوگاکانی دەوروبەری شاری هەولێریش بەم شێوەیە بوو، بەڵام لەڕاستی دا کۆمەڵانی خەڵکی شاری هەولێر، پیاوەتیو جوامێریو خۆگریەکیان تۆمارکرد، کە هەمیشە دەبی بیڵێینەوە، بەڕاستی ئەو سەردەمانە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانیش ئەو پیاوەتیو جوامێریەی خەڵکی شاری هەولێریان تۆمارکرد، ئەویش کە بریتی بوو لە ژمارەیەکی یەکجار زۆر کۆمەكو پیتاك، کە ژمارەیەکی زۆر لە بادینان ڕاگوێزرابوون بۆ ئۆردوگاکانی دەوروپشتی هەولێرو ڕۆژئاوای بەحرکە لەوێ نیشتە جێ کرابوون، خەڵکی هەولێر بێ ئەوەی کەس کەس بناسێت بە لۆری دۆشەكو بەتانیو پێداویستی خواردن بۆ ئەو ماڵانەی کە گوێزرابوونەوە هێنابوویان بۆ ئۆردوگاکان. ئەوانە هەمووی خەڵکی دەهێنایە جۆشو خرۆشو خەڵکی دەهێنایە ئەوەی کە مقاوەمەت بکات، خەڵکی دەهێنایە ئەوەی کە توانای ئەو کارەساتو ئەو وەزعەی کەوا بەسەر کورد دا هاتیە تۆڵەی بکاتەوە.

لە شاری هەولێر ووردە ووردە بەڕاستی لە ڕێکخستنەوە بوو، ڕێکخستنەکانی ناو شاری هەولێریش لە حەقیەتدا ئینسان نابێ ئەو مەسەلەیە فەرامۆش بکات، کە دەورێکی زۆر بالأیان هەبوو لە هاندانی خەڵك بۆ هاوکاری‌و یارمەتی دانی خەڵك، بۆ زەمینە خۆشکردنی ئەوەی کەوا خەڵك یەککگرتووبیت، خەڵك دیفاع بکات لەمەسەلە ئەساسیەکانی نەتەوەکەی. وە پێش ڕاپەڕینیش ڕێکخستنەکانی ناو شار پەیوەندیان بەزۆربەی چەکدارەکانەوە کرد، هەر لە ئامر سریەکان وە تا ئامر فەوجەکان.

پ٣/ ئایە بیرۆکەی ڕاپەڕین هەبوو کاتێك کە صدام کوێتی داگیرکرد؟

و/ کۆمیتەی سەرکرایەتی بەرەی کوردستانی یەکەم کۆبوونەوەیان لە قاسمەڕەش بوو، لەبیرۆکەی ڕاپەڕینی کۆمەلأنی خەڵکی کوردستان، بیرۆکەی ی.ن.ك بوو، لەسەرووی هەمووشیانەوە بەڕێز کاك نەوشیروان مستەفا بوو. وە نوێنەری حیزبەکانی ناو بەرەی کوردستانی بەڕاستی لەلایەن ی.ن.ك هوە ڕاکێشران بۆ ئەوەی کەوا مناقشە بکەن‌و بەرنامە دابنێن. وە هەندێك لەو حیزبانەی ناو بەرەی کوردستانی بەڕاستی زۆر بێ ئومێد بوون، کە بە بێ ئومێدیەوە قسەیان لەسەر مەسەلەی ڕاپەڕین دەکرد، وە پێشیان شتێکی ڕەوا نەبوو، وە لە ئەخیریش لە کۆڕەوەکە بوو وەکو هەندێ لەو حیزبانە بەڕاستی پەشیمان بوونەوە‌و دەیان ویست ئۆباڵەکە بخەنە سەر ی.ن.ك، کە گوایە ڕاپەڕینەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە.

لەناو شاری هەولێر چەند فەوجێك هەبوو لەلایەن ڕێکخستنەوە پەیوەندیان پێوەکرا، وە لەلایەن سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی‌و بەتایبەتی سەرکردایەتی ی.ن.ك هوە نامەی بە مۆریان بۆهات کەوا

هەموویان یەکگرتووبن و هەموویان پەیوەندی بەڕێکخستنەکانەوە هەموویان خۆیان تەیار بکەن و ئامادەبن بۆ ئەو ڕۆژەی کە ڕاپەڕین ئەنجام دەدرێ.

پ٤/ بەگشتی دەکرێ بڵێین هەموو ئەو بابەتانەی کە باسکران، هۆکارەکانی ڕاپەڕین بوون؟

و/ هۆکارەکانی ڕاپەڕین دەگەڕێتەوە سەر ئەو مەسەلانەی کە من باسم کردن، وەك مەسەلەی دەرکردنی دێهاتەکان و نەمانی هێزی پێشمەرگە لە سنوورەکان، هیچ گوندێك لەسەر خاکی خۆی نەمابوو، ژمارەیەکی یەکجار زۆر ئەنفال کرابوون، مەسەلەی هەڵەبجە هاتبووە کایەوە، مەسەلەی بارزانیەکان هاتبووە کایەوە، ڕاگواستنی ئەو کەسانەی کە بە کورد لەقەڵەم دەدران، وەکو شەبەك و بادینیەکان، کە لە شاری هەولێر نیشتەجێ کرابوون. وە ئەوانە هەموویان بوونە هۆی ئەوەی کە خەڵك بەجۆش و خرۆش بێت و خەڵك ڕاپەڕێت و وە ڕاپەڕین ئەنجام بدات، بەهەموو لایەنەکانەوە لەچوارچێوەی بەرەی کوردستانی پێکهاتبوو.

هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ڕاپەڕین ئەوەبوو کە صدام شتێکی وایکرد کە کورد جارێکی دی ببوژێتەوە ئەویش گرتنی کوێت بوو، گرتنی کوێت هۆیەکی یەکجار سەرەکی بوو، کوێت وولاتێکی دەوڵەمەندە، سەروەت و سامانێکی زۆری هەیە، پەیوەندی بە ڕۆژئاوا هەیە، لەبوونی ئەو کۆمپانیایانەی کە پەیوەندیان هەبوو بە کۆمپانیاکانی ڕۆژئاوا، وە بەرژەوەندی وولاتانی ڕۆژئاوا لە کەنداوو کوێت زۆر بوو، بە هەموو شێوەیەك دیفاعی لێ دەکرد، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە کورد جارێکی تر هەناسەیەکی بێتەوەبەر، ئەوە هۆیەکی سەرەکی و بنەڕەتی و ئەساسی بوو کە ئەمەریکا توانی ڕاپێچی

هەموو دەوڵەتانی دنیا بکات، هەم لە دەوڵەتەکانی ڕۆژئاوا وە هەم لە کیشوەری ئوستراليا وە هەم لە دەوڵەتە عەرەبیەکانەوە، هەموویان یەك دەنگ بن کەوا عێراق لە کوێت دەربکەن. دەرکردنی عێراق لە کوێت بووە هۆی ئەوەی کە ڕاپەڕین بەر پا بێت، وە ئێزگەکەی خۆشمان لەو کاتو سەردەمانە کە ئینسان نابێ فەرامۆشی بکات بەتایبەتی دەنگی کاکە (فەرهاد سەنگاوی)، کە تاکە دەنگی شۆڕش گێرانەبوو ئەو سەردەمە لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە. وە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانیش ڕۆڵی ئەساسی هەبووە، یەعنی مومکینە حیزبەکانی ئەو سەردەمە ئێزگەیان هەبووبێ، بەلأم ئەوەندەی خەڵك دەنگی گەلی کوردستانی دەکردەوە، ئەوەندەی خەڵك بە پەرۆشی دەنگی فەرهاد سەنگاوی بوو، ئەوەندە گوێیان لە ئێزگەی حیزبە سیاسیەکانی تر نە دەگرت. بەلأم لەڕاستی دا بوژاندنەوەی کوردو سەرکەوتنی کورد ڕاپەڕینی کۆمەلأنی خەڵکی کوردستان، هۆیەکی دەرەکیو هۆیەکی سەرەکی گرتنی کوێتو ئازاد کردنی کوێت بوو لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە.

پ٥/ ڕاپەڕینی شیعەکان لەخوارووی عێراق چ پەیوەندیەکی هەبوو بە ڕاپەڕینەکانی خۆمان؟ یان هەندێك بە هۆکارێکی دادەنێن بۆ ڕاپەڕین لە کوردستان؟

و/ ئەوروپا بەتایبەتیو لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمەریکا، هەموو ئێزگەکانی ئەوروپا دەنگێکی زولأڵ بوون، هەمیشە داوایان لە خەڵکی عێراق دەکرد بە کوردو شیعەو سونیەوە کە ڕاپەڕن. شیعەکان کە لە سالأنی ١٩٧٧و١٩٧٨ەوە ڕژێمی عێراق بەهێزی گەورەو تەیارەو هەلیکۆپتەری بەکاردەهێنا بۆ کوشتنیان، وە ژمارەیەکی زۆری لە

شیعەکان سەرکوتکرد، سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی شیعەکان لەسالآنی ناوەڕاستی حەفتاکان‌و هەشتاکان، هەموو ئەوانە بووە هۆی ئەوەی کە هەمیشە شیعەکان ئامادەباش بن بۆ ئەوەی کە زروفێکی لەبار بێتە پێشەوە بۆ ئەوەی شیعەکان ڕاپەڕین بەئەنجام بگەیەنن دژی بەعس. شیعەکان لەخوارووی عێراق واتە لەباشوور لە بصرەو هەم لەشارە جیاجیاکانی خوارووی عێراق ئەوانیش ڕاپەڕین کە هاوکات بوو لەگەڵ ڕاپەڕینی باکووری عێراق.

پ٦/ بەرنامەی ڕاپەڕین چۆن بوو؟

و/ دوو مانگ بەر لەوەی ڕاپەڕین بەرپابێت، بەرنامەی سەرکردایەتی ی.ن.ک‌و بەرەی کوردستانی‌و بەتایبەتی ی.ن.ک پۆل پۆل پێشمەرگەکانی دادەبەزاندە خوارەوە بەشێوەی پارتیزانی. پارتیزانەکان کۆڵە پشتیان پێ بوو، چەکیان پێ بوو، نانی چەند ڕۆژەیان پێ بوو، بۆ ئەوەی بێنە دەوروبەری شارەکان‌و دەوروبەری ئۆردوگاکان ئامادەباش بن، وە پەیوەندی بکەن بەو چەکدارانەی ئەو سنورەی نامەیان پێ بوو بۆ چەکدارەکان، بۆ ئەوەی چەکدارەکان بەو نامەیە خەڵک ئامادەباش بێت‌و تەیاربێت بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین.

پ٧/ تێبینی یەکت هەیە لەسەر یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕینی کوردستان؟

و/ لەڕاستی دا ڕۆژی ١٩٩١/٣/٥ تۆمارکراوە بۆ ڕۆژی ڕاپەڕین، بەڵام لەڕاستیەکەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٤ لە ئۆردوگای کەڵەکی یاسین ئاغا لەوێندەرێ خەڵك دەستی بە ڕاپەڕین کرد، ئەوەش بەهۆی هەڵەی هەندێ لە برادەرانی ڕێکخستن بوو کە ویستیان پەلەبکەن لەکاتەکە، وە لەوێندەر برادەرانی ڕێکخستن دەست پێشخەریان کرد، پێش ڕەوایەتی

ڕاپەڕینیان کرد، یەك دوو شەهیدیش درا، بەڵام ئەوەبوو ڕاپەڕینەکە سەرکوت کرا. بۆ ڕۆژی دوایی ڕاپەڕین لە ڕانیە هەڵگیرسا.

پ٨/ بیرۆکەی دروستکردنی شانە چەکدارەکان چۆن بوو؟

و/ ئەوشانە چەکدارانەی کە لەلایەن ڕێکخستنەکانەوە بەناوی شانەی بروسکەوە دروستکرابوون، بەهۆی پەیوەندی کردنی بەهێزە چەکدارەکانی سەر بە ڕژێم، وە بمانەویَو نەمانەویَ لەسەردەمی ئەنفالەکان ژمارەیەکی یەکجار زۆر پێشمەرگە، کە ئێمە دەربەدەر بووین، کە لە ئێران بووین، بەتەوجیهی برادەرانی سەرکردایەتی ڕەوانەی ناو شار کرانەوەو تەسلیم بونەوە. زۆر لە کادیرە سیاسیەکان، زۆر لە کادیرە عەسکەرییەکان، وە کادیرە سیاسیی و عەسکەریەکانی ی.ن.ك لەکاتی ڕاپەڕین و لەپێش ڕاپەڕین دەوری باڵایان هەبوو بەوەی کە خۆیان ڕێك بخەنەوە لە شانە چەکدارەکانی بروسك. وە پەیوەندی بەکۆمەلانی خەڵك بکەن، پەیوەندی بە چەکدارەکانەوە بکەن، ئەوانە تەجروبەیەکی زۆرو زەوەندیان هەبوو، لەشەڕو پێکدادانەکانی پێشتر لە بارەگاکان، وە لە ڕووی سیاسیەوە لەڕێگای ئێزگەکەش کە لەوێوە ئیتر پەیوەندیان پێوەدەکراو ڕێنماییان دەکراو تەوجیهاتیان دەدرایێ، وە ئەو دە ڕۆژە خەڵك حەماسەتی شۆڕشگێرانەی ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد، وە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشەوە چوون بوون.

پ٩/ چالاکی پارتە سیاسیەکان چۆن بوو بەر لە ڕاپەڕین؟

بە بڕوای من هیچ کەسێك ناتوانێت مێژوو بگۆڕێت، کە تاکە ڕێکخراوی سیاسیی ئەو سەردەمانە، کە دەوری فەعالی هەبوو، وە دەوری کاریگەری هەبوو لە سنووری شارەکانی سلێمانی و هەولێرو کەرکوك، لە ئۆردوگاکان، یان بڵێین لە دێهاتەکان، کە پێش ئەوەی خاپوور بکرێن

تەنها ی.ن.ك بوو. هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش ئەو سەردەمانە تاکە هێزی ناوچەکە بوو، ڕاستە حیزبی سۆسیالیستی کوردستان هەبوو، بەڵام بەڕاستی ژمارەیان کەم بوو، حیزبی شیوعی عێراقی ژمارەکەیان کەم بوو، تەنها لە سنوورەکانی ئێمە دەیان توانی... واتە تەنها لە سنوورەکانی ی.ن.ك دا ئازادی بیروڕا هەبوو، ئازادی هێز هەبوو، وە ئازادی سیاسیی هەبوو. حیزبی سیاسیی دەیانتوانی ئیدارەی سیاسی بکەن، هەتا پارتی گەلی ئەوکاتە لە سنووری ئێمە هەبوو، پاسۆك لە سنووری ئێمە هەبوو، بەڵام هیچ هێزێکی تر لەوسەردەمە لە بادینان نەبوو، بەڵام دواتر بۆ ململانێ کردنی ئێمە، لە ڕقی ئێمە جێگەی شیوعیان کردەوە بۆ دروستکردنی ململانێیەکی توندوتیژ لە ساحەکە.

پ١٠/ ئەو هۆکارە ڕاستەوخۆیانەی کە جەماوەری خرۆشاند چی بوو؟

و/ یەك لەوانە ئەوەبوو کە خەڵك ترسی هەبوو، جگە لەوەی ڕژێمی بەعس بە خاپوورکردنی دێهاتەکان کەلتوری کوردی لەناوبرد، بەسەدان دەستنووسی لەناو مزگەوتەکان لەناو برد، ڕوخانی مزگەوتەکان، قوتابخانەو نەخۆشخانەکان، هەموو ئەوانە مەترسیان هەبوو لەلایەن خەڵکەوە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوانیش وەك بارزانیەکان کۆبکرێنەوەو زیندە بەچاڵ بکرێن لەسەر خاكو زێدی باووباپیرانیان.

پ١١/ کاتی هەڵایسانی ڕاپەڕین هەڵوێستی ڕژێمی بەعس بەرامبەری چۆن بوو؟

و/ ڕژێم ئەو سەردەمانە کە ڕاپەڕین بەرپابوو، لە ڕاستی دا ڕژێم مەترسیەکی گەورە لەناو دەرونی دروست بوو بوو. وە ڕاگەیاندنەکانی ئەو سەردەم ئاماژەیان بەوە دەدا، کە ئەمڕۆ نا سبەی حکومەت کۆتایی

پیّ دیّت، بەرەونەمان دەچیّت و حکومەتیّکی تازە دیّتە سەرکار، ڕاپەڕین سەرکەوتن بەدەست دیّنیّت، بەڵام بەهۆی ئەوەی بارودۆخی ناوچەکە بەهۆی ئەوەی کە دەوڵەتیّکی ئیسلامی هەبوو بەناوی دەوڵەتی جمهوری ئیسلامی، کە دەوڵەتیّکی شیعە بوو، دەسەڵات لەبەردەستی شیعە بوو، وە زۆرینەی دانیشتوانی عیّراق شیعەیە، مجلسی اعلای ئیسلامی ئەو سەردەمانە بارەگاکانیان لە ئیّران بوو، کە سیاسەتی ڕۆژئاواش ترسی لەوە هەبوو کە حکومەتیّکی تری شیعە لە عیّراق دا بمەزریّت و وە شۆڕشی ئیسلامی بگوازریّتەوە بۆ عیّراق و فۆتۆکۆپی بکریّت. بۆیە تیشکی سەوزی بە صدام دا، بۆ ئەوەی هیّزەکانی بەکاربهیّنیّت بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕین لە باشوورو باکووری عیّراق. ئەوەبوو هیّزەکانی ئیّمە لە کەرکوك بەهۆی ئەوەی کە ڕژیّم بەشیّوەیەکی توند بە بەکارهیّنانی تەیارە هیّزەکانی پیّشمەرگەی شکاند.

پ١٢/ سەرچاوەی چەکەکانی پیّشمەرگە چی بوو؟

و/ لەڕاستی ئەگەر بگەڕیّینەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی نویّ، مەفرەزەکان ئەو چەکانەی کەلایان بوو هەموو چەکی کۆن بوو، ئەو چەکانە بوو کە لە دوای شۆڕشی ئەیلول لەلایەن جوتیارانەوە شاردرابوونەوە دواتر بەپارە یان بەدیاری دەیاندا بە شۆڕشی نویّ. وە لەکاتی شەڕوپیّکدادانەکاندا چەکمان دەست دەکەوت، بەڵام ئەگەر بڵیّی لەلایەن دەوڵەتیّکەوە یارمەتیمان دراوە بەپیّدانی چەك، ئەوە قەت شتی وانەبووە.

پ١٣/ باشە ئەی ڕۆڵی ژنان لە شۆڕش و ڕاپەڕیندا چۆن هەڵدەسەنگیّنی؟

و/ ئەو ژنانەی کە ڕۆڵیان هەبووە ژنی پێشمەرگەو کادیرەکان بوون لەکاتی شۆڕش. یەکەم ژنی ناو شۆڕش (مریەم) خانی خێزانی دکتۆر عەلی لە ڕانیەیە کە لە ساڵی ١٩٧٨ کە چووم بۆ سەرکردایەتی ئەویش لەناو شۆڕش بوو.

ژنان لە ڕاپەڕیندا ڕۆڵی یەکجار گەورەیان بینی، بەتایبەتی کەس‌و کاری شەهیدەکان نەك هەر لە ڕاپەڕینی ١٩٩١، بەڵکو لەڕاپەڕینەکانی پێشتر، وەکو لە ڕاپەڕینی ١٩٨٢ لەشاری کۆیە ڕاپەڕینێك بوو ژنێك لەوێ شەهید بوو بەناوی (شوکریە). لەناوچەی قەڵادزێ (سنەوبەر) بوو، وە لەناوچەی هەڵەبجەو پێنجوێن یشدا ژنان بەشداریان کرد.

لەسەرەتای شۆڕشی نوێ لە ١٩٧٦ەوە تاکو ڕاپەڕین لە ١٩٩١ دەیان‌و بگرە سەدان شەهیدی ژن دراوە، کە زۆربەیان خێزانی کادیرو پێشمەرگەکانی خۆمان بووینە. بۆیە ژنان ڕۆڵی بەرچاوو کاریگەریان گێڕا لە ڕاپەڕین، کە بەحەماسەتەوە بەشداریان تێداکردوو سەرباری ئەوەش پێش ڕاپەڕین ڕێکخستنی ژنان هەبووە.

پ١٤/ ڕۆڵی مستەشارەکان لە ڕووداوەکاندا چۆن بوو؟

و/ مستەشارەکان تووشی ئەمری واقع بوو بوون، کە ناچار بوون هاوکاربن، هەروەها لەلایەکی تریشەوە نامەیان لەلایەن سەرکردایەتی بۆ هاتبوو بۆ ئەوەی یارمەتی دەربن بۆ ڕاپەڕین. بۆیە ئەوانیش زۆربەیان بەناچاریەوە هاوکاربوون، بۆ نمونە شەهید (عەلی نەبی) لە ڕاپەڕینی ڕانیە ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاوی بینی، کە کەسێك بوو ئامر فوج بوو.

پ١٥/ بەرنامەی ڕاپەڕینی هەولێر چۆن بوو؟ چەند حیزبی کوردی تیایدا بەشدار بوون؟

و/ پاش ڕزگارکردنی ڕانیە هێزەکان چوون بۆ شەقڵاوە، لە شەقڵاوە کە کاک کۆسرەت سەرکردایەتی دەکرد، لەوێ پەیوەندی کرد بە حاجی مصیفی و دواتر مصیف یش ئازادکرا. پاشان لەدوای برادەرانی ناو شاری هەولێری نارد، کە لەشانە چەکدارە نهێنی یەکان کاریان دەکرد، کە بێن بۆ شەقڵاوەو بەرنامەی ئازادکردنی هەولێریان داڕشت. پاشان لە کۆیەوەش برادەران دوای ئازادکردنی کۆیە بەرەو کەسنەزان چوون و لەناو شاری هەولێریش ڕێکخستنەکان و جەماوەر ڕاپەڕین و بەم سێ لایە بەرنامەکە تکامل بوو، وە هەولێر ئازاد بوو.

لەهەر کوێیەك هێزی یەکگرتووی جەماوەر هەبێت، ئەوا زۆر بەهێزدەبێت، کە لەشاری هەولێر بۆ نمونە کە بارەگای فەیلەقی (٥)ی لێ بوو پڕبوو لە سەربازو چەکی قورس و کوشندە، بەڵام لەبەرئەوەی کە جەماوەرو خەڵك هەموو بەیەك دەنگ ڕاپەڕین توانیان بەرەنگاری ئەو هێزە گەورەیەی دوژمن ببنەوەو بیشکێنن. وە لەلایەکی تریشەوە ڕاگەیاندنی لێبوردنی گشتی بەناوی ئاشت بوونەوەی گشتی لەلایەن بەرەی کوردستانیەوە، زیاتر هانی پیاوانی ڕژێمی دا کەتازووە بەرگری نەکەن و ڕێزیان لێ دەگیرێت و تۆڵە بەرامبەریان ناکرێتەوەو گیانیان پارێزراو دەبێت.

پ١٦/ کاك شاخەوان کاتێك کە ڕاپەڕین لە شاری هەولێر هەڵگیرسا، تۆ لەکوێ بوویت؟

و/ ڕۆژی ٣/١١ی ئازادکردنی شاری هەولێر ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو، من ئەو ڕۆژە لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بووم لە بەیروت، کە هەواڵەکەمان بیست مژدەیەکی زۆر خۆش بوو.

پ١٧/ هەنگاونان بۆ ئازادکردنی شاری هەولێر لەچەند قۆڵەوە بووە؟

و/ لەم قۆڵانەوەبوون: ١-شەقلاوە ٢-کۆیە ٣-مەلا سلێمان لە ئۆردوگای بەحرکە ٤-مەفرەزە چەکدارەکانی پێشمەرگە لەناو ئۆردوگاو گوندە گەورەکانی کە مابوون لەدەوروبەری هەولێر.

بەڵام لەڕاستی دا قۆڵی شەقڵاوە گرنگترین دەروازەی ئازادکردنی شاری هەولێر بوو، چونکە کە شەقڵاوە ئازادکرا هێزەکانی دوژمن لەدیانەش تەسلیم بوون.

پ١٨/ ئەی ئیسلامیەکان چ ڕۆڵێکیان هەبوو لە ڕاپەڕین؟

و/ تەنها بزووتنەوەی ئیسلامی هەبوو، ئەویش ژمارەیان زۆرکەم بووە، بە پەنجەی دەست دەژمێردرا، کە هیچ ڕۆڵیان نەبوو لە ڕاپەڕین.

پ١٩/ واباس دەکرێت کە هەولێر درەنگ ئازادکراوەو درەنگ ڕاپەڕینی کردووە؟

و/ شاری هەولێر درەنگ ئازاد نەکراوە، بەڵکو بەپێی ئەو بەرنامەیەبووە کە دانرابوو، چونکە کە ڕانیە ئازادکرا دەبوو بێن بۆ ڕانیەو پاشان بۆ چوارقورنەو کۆیەو وە شەقڵاوەو لەوێشەوە بۆ مصیفو ئینجا بۆ هەولێر.

پ٢٠/ سەبارەت بە ڕۆژی ئازادکردنی شاری هەولێر لە ٣/١١ چ مەبەستێك هەبووە لەو ڕۆژە؟

و/ ڕۆژی ١٩٧٠/٣/١١ ڕۆژێکی مێژوویی بوو بۆ کورد، کە بەیاننامەی ١١ی ئازار بوو. بۆیە ئەم ڕۆژەش دانراوە لەلایەن کاك کۆسرەت کە ڕۆژێکی گرنگی مێژوویی بوو بۆ کورد، وە کاك کۆسرەت خۆی سەرکردایەتی ئازادکردنی هەولێری دەکرد.

پ٢١/ چ شوێنێك زۆر مقاوەمەی لێ کرا لە هەولێر؟

و/ ئەو شوێنەی کە مقاوەمەی تێداکرا زۆر تەنها بارەگای منظمەی استخباراتی شمالی بوو، کە بەرگریان کردو درەنگتر لە شوێنەکانی تر ئازادکرا.

با ئەوەت بۆ باس بکەم، بڕیار وابوو کە پارتی موصلّ بگرێت‌و یەکێتی کەرکوك، بەڵام بەداخەوە پارتی مواتڵەیان بەهێزەکانیان دەکردو کارەکانیان ئەنجام نەدەدا.

پ٢٢/ باشە باسی ڕۆژانی بەرگری کردنمان بۆ بکە لە هەولێرو پاشان چۆنیەتی پاشەکشەکردنتان‌و دروست بوونی کۆڕەوەکە؟

و/ ١٩٩١/٣/٢٦ گەیشتمە پردێ چەکم بەستابوو، کە چووم دۆخەکە زۆر نا لەبار بوو، ئاڵۆزبوو. ئەو هێزانەی کە لەوێ مابوون ژمارەیان زۆر کەم بوون، وە نا منظم بوون، بەتەنها کاك کۆسرەت وەکو لێپرسراوی فەرماندە لەوێ مابۆوە، شەهید عەبدولڕەزاق ئەوکات شەهید بوو بوو، وە کەرکوك‌و پردێ لەلایەن حکومەتەوە گیرابۆوە. من ئەوکاتە لەسەر داواکاری کاك کۆسرەت چوومەوە بۆ ناو شمار، کە بچم هێزێکی گەورە بێنم بۆ بەرگری کردن، بەڵام کە گەڕامەوە لەبەینی (هەولێرو قوشتەپە) تووشی کاك کۆسرەت بووم، ووتی بڕۆ ئەوە م.بەکر وا لە قوشتەپەیە، کە چوومە قوشتەپە م.بەکر یەکسەر ووتی وەرە سەرکەوە با بڕۆین، ووتم بۆ؟ ووتی کاکە ئەوە دەبابەکان گەیشتن، دوایی دەرناچین. لەو کاتەدا شتێکی سەیرم بینی، بینیم ڕۆژنامە نووسێکی ئەڵمانی کە کچ بوو خەریکی وێنە گرتن بوو. من ووتم کاکە چۆن بڕۆین ئەوا ئەو کچە لێرەیەو ئێمە چۆن بڕۆین؟ ووتی "واتە م.بەکر" کاکە دەرناچین. لەڕاستیشدا وابوو، چونکە دەبابەکان زۆر نزیك بوو بوونەوە، تەقەو بۆردومان زۆر نزیك کەوتبۆوە.

پاشان گەڕاینەوە هەولێر، کە گەڕاینەوە هەولێر، هەولێر لە دۆخێکی خراپ دابوو، وەزع زۆر نائارام بوو، کە ئەوکات ٣/٢٨ بوو، کە ئەوڕۆژە واتە ١٩٩١/٣/٢٨ قوشتەپە بەتەواوی گیرا. کە ئێمە لەدەرەوەی قوشتەپە بووین، وە هێزەکانی دوبزو کەندێناوە کە هێزەکان شکابوون لە زرگە زراو، کە شەهید ڕێبازو سەفین مەلا قەرە لەوێ بوون ئەوانیش گەڕابوونەوە بۆ هەولێر. خەڵك زۆر لەڕووی دەرونیەوە لە مەترسی دابوو، لەوەزعێکی خراپ و دژواردابوو، هەموویان مەترسی ئەوەیان هەبوو کە دوژمن دێتەوەو قەتڵ و عام دەکات و خەڵکیش لەم ترسە هەموویان ڕایان کرد بەرەو ناوچەکانی وەك کۆیەو شەقڵاوە.

بۆ ڕۆژی دوایی (واتە لە ١٩٩١/٣/٢٩) قوشتەپە بەتەواوی کەوتبووە دەست ڕژێم، من قیادەی گرتنەوەی قوشتەپەم کرد، بۆ ئێوارەکەی لەگەڵ یونس ڕۆژ بەیانی بەرنامەیەکمان دانا لە شەوی ٢٩-١٩٩١/٣/٣٠ بۆ گرتنەوەی قوشتەپە، کە هێزی عەفەوی زۆر هەبوو، کە کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن، بەبێ بەرنامە بوون، خەڵك لەخۆیەوە دەهات هێرشی دەبردو دەشکا.

هێزەکانی کە لای من بوون: عەبدوللا بۆر بوو، ڕێبین محەمەد صوّفی بوو، لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی تر. هێزەکانی لای پارتی جەمال مورتکە بوو بەسەرکردایەتی یونس ڕۆژبەیانی، کە هەریەکەو لە قوڵێکەوە بەجیا هێزەکانمان نارد،بۆ ئەوەی بچن قوشتەپە ڕزگاربکەن.

دوای ئەوە کاك کۆسرەت و زەعیم عەلی هاتن، ووتم ئەوە بەرنامەمان دانایە بۆ گرتنەوەی قوشتەپە. نزیکەی ١٢،٣٠- ١ی شەو تەقە لەناو قوشتەپە لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکرد، ووتیان قوشتەپە ئازادبووە. ئەوەی کە هات و وەی گۆت ناوی (فەرهاد ڕەسول) بوو

پارتی بوو، منیش سەرکردایەتی ئەم کارەم دەکرد، بۆیە بەسەیارەیەکەوە چووم بۆ قوشتەپە کە چوار پێشمەرگەم لەگەڵ دابوو. کاک کۆسرەت یش بەدوام داهات، بەڵام ئەم هەواڵە ڕاست نەبوو، منیش کەوتمە کەمینەوەو دواتر بە پرەپڕ دەرچووم. پاشان بۆ بەیانیەکەی کە ئومێدی ئەوەمان نەما کە چیتر هێرش بکەینەوە بۆ سەر قوشتەپەو ڕزگاری بکەین، ئەوەبوو هێزێك چووە کەسنەزان بەسەرکردایەتی کاك ڕابەر سەید برایم.

ئێمە لەگەڵ حەسەن کوێستانی، سەفین مەلا قەرە، فاقە مەخموری، مەلا سلێمان، چووینە (حی عسکری)، کە بڕیارماندا لەوێ شەڕ بکەین‌و بەرگری بکەین لە هەولێر، کە ئەمانە ١٩٩١/٣/٣٠ بوون. ئەوەبوو هێزەکانی ڕژێم لە خەتی قوشتەپەوە هێرشیان کردە سەر شاری هەولێرو نزیکەی کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ دەبابەکان گەیشتنە سەر بازگەی شەقڵاوە، کە لەوێندەر کۆپتەر بە بەردەوامی دەسوڕایەوە. لە بازگەی شەقڵاوە کۆپتەر لە سەیارەکی دا، کوڕێك شەهید بوو بەناوی (شێرزاد مەلا شینە) لەگەڵ خێزانەکەی کە ناوی (معتبر) بوو، هەردووکیان شەهید بوون. وە خەڵکێکی زۆر لەو ناوچە شەهیدو بریندار بوون، کە (بایز نانەکەلی) لەوێندەر لەناو دەغڵەکان بریندار‌بوو.

پاش ئەمانە کاك کۆسرەت وەڵامی نارد کە بگەڕێینەوەو ڕێ ی شەقڵاوە گیراوە، ئێمەش گوتمان دەچینە ڕێ ی بەحرکەوە دەچینە بەستۆڕە، کە چووینە بەستۆڕە جارێکی تر گەڕامەوە، بەم شێوەیە زۆربەی هێزەکانمان لە ڕێ ی بەحرکەوە دەربازبوون.

پ٢٣/ زۆرباشە، ئەی لە ڕاپەڕین‌و ڕۆژانی بەرگریش چەند حیزبی کوردی‌و کامانەبوون کە بەشداربون‌و ڕۆڵیان هەبوو؟

و/ بەنسبەت بەشداری حیزبە کوردیەکان هەموویان بەشێوەیەکی گشتی ڕۆڵی خۆیان هەبووە، وە پارتیش بەشداربوو، بەڵام وەك خورشید شێرەو برادەرانی تریان هەموویان لە کارەکان پرسیان بە کاك کۆسرەت دەکرد، وە ئەوکات یەکێتی ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە ڕاپەڕین، وە تەنها بارەگای کەرتی ڕێکخستن، (٢٨) بیست‌و هەشت بارەگا لەسەرجەم گەڕەکەکانی ناو شاری هەولێر هەبوو.

پ٢٤/ گرنگترین کارێك کە ئەنجامت دابێت چی بووە؟

و/ ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی کۆڕەوەکە بوو دوای ئەوەی کە لە بەحرکە دەرچووم، کە م.بەکرو حەسەن کوێستان یم لەگەڵدا بوو، ئەوان چوون بۆ هاوینەهەواری صلاح الدین‌و منیش گەڕامەوە بۆ مەلا.ئۆمەر، کە من هاتمە مەلا ئۆمەر دوو کادیری پارتی کە یەکیان (عزەتی سلێمان بەگ) بوو ئەوی تریان (ملازم دڵشاد مەجید) بوو، لەگەڵ ماڵی شێمەی هارون قسەیان دەکرد، کە بەهرامی شێمەی هارون دەیانگوت نابێ ئێوە لە مەلا ئۆمەر بمێننەوە. من قسەم کرد، ووتم کاکە من لێپرسراوم‌و لێرە بەرگری دەکەین، هەرچەندە بەهرامی شێمەی هارون ووتی ئەمە بەرژەوەندی منی تێدا نیە ئێوە لێرە بەرگری بکەن، بەڵام من ووتم کاکە ئەمە بەرژەوەندی گشتی یەو بۆ کوردە، ووتی ئەگەر وایە من باردەکەم، منیش ووتم باشە ئەگەر باردەکەی (لۆریەکت) بۆ دەنێرم بارکە بۆ مصیف صلاح الدین. من گەڕامەوە مصیف صلاح الدین‌و تۆپ باران دەستی پێکرد، لە هەولێرەوە ڕژێم تۆپبارانی مصیف‌و مەلا ئۆمەری دەکرد. مام جەلال گۆتی ئەوە چی یە شاخەوان؟ منیش ووتم وە للە مامە ئەوە حکومەت هاتیە بۆ مەلا ئۆمەرو ئەو ناوچەیە، ووتی باشە ئەی کەس لەوێ نەبوو؟ ووتم وەللە ٤٠٠-٥٠٠ پێشمەرگەی لێ بوو.

ووتی باشە ئەی بۆ بەرگری ناکەن؟ ووتم مامەگیان ئەوانە ڕاستە زۆرن، بەڵام منظم نین، هەرکەسەو سەربەخۆیەو چەکی بەشانی دا دایەو ڕادەکات.

مام جەلال‌و برادەرانی تر دوای نانی نیوەڕۆ لە مصیف ڕۆیشتن، منیش هاتمەوە بۆ مەلا ئۆمەر، کە هاتمەوە بینیم حکومەت هاتبووە مەلا ئۆمەرو یەکسەریش سەحبی کردبۆوە، کە تەنها ئەوەبوو ملازم حبیب هاتبوو، شێمەو برادەرانی تری لەگەڵ بەهرام هاتبوو ڕزگاری کردبوون‌و گەڕابوونەوە، ئەوەبوو ئێمەش لەوێ بنکەمان داناو سەنگەرمان لێدا.

دوای ئەوە هێزەکان دابەش بوون، بەشێك لە مصیف مابۆوە، منیش سەرکردایەتی سەری سەفینم کرد، کانی شیلانەو کاموسەك. جەلال ئیلنجاغی لەناوچەی سکتان دانرا، مەلا سلێمان‌و برادەرانیشی لەناوچەی زیارەت دانرا. ئەوەبوو دواتر بارودۆخەکە بەبەرژەوەندی کورد گۆڕاو هێڵی بەرگری دەستنیشانکرا.

پ٢٥/ لە کۆتایی دا دەکرێت بەچەند خاڵێکی کورت هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین مان پێ بڵێی؟

و/ بریتی بوون لە: ١- کەمی ماوە. ٢-ڕێکخستنی پێشمەرگە نەبوو، بەهۆی کەمی ماوە. ٣-هەروەها بەرنامەی دوای ئازادکردن نەبوو بۆ بەرگری کردن. واتە ئەوەنەبوو کە حیزب کۆبوونەوە بکات‌و ڕێگا چارەك دابنێت بۆ دۆخەکە.

زۆر سوپاس کاتمان گرتی...

سوپاسی ناوێ سەرکەوتووبن...

**حەوتەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ (نەوشیروان مستەفا ئەمین)، سلێمانی- ماڵی تایەتی خۆی، ڕۆژی شەممە، ڕێککەوتی ٢٠٠٣/١/١٨:**

**پ١/ هۆکارەکانی هەڵایسانی ڕاپەڕینی ١٩٩١ چی بوو؟**

و/ لەڕاستی دا خۆی عملیاتی ئەنفال‌و ئەو زەبروزەنگەی کە بەعسیەکان بەرامبەر بە خەڵکی کوردستان کردیان، وەك ڕاگوێزانی دێهات‌و بێ سەروشوێن کردنی دەیان هەزار کەس‌و لە سێدارەدانی گەنج‌و بەزێ دادانی خەڵك لەناو شارەکانداو نەبوونی ئازادی سیاسیی‌و تێکدانی ژێرخانی کۆمەڵی کورد، بەوەی کە هەموو دێهاتەکانیان وێرانکرد، کوردیان والێکردبوو تەقریبەن لە حەفتاو چەند دانە ئۆردوگایەك دا کۆیان کردبووەوە. بێجگە لە مەرکەزی شارەکان، تەقریبەن دێهات‌و ناحیەو قەزاش وانەمابوو، هەموو کوردستانی عێراقیان لەدەوروپشتی جادەکان لەچەند ئۆردوگایەکدا کۆکردبۆوە. مەسەلەن، ئۆردوگای زەرایەنیان دروستکردبوو، دەوروپشتی هەڵەبجە وێران کرابوو سید صادق وێران کرابوو دێهاتەکان وێران کرابوو ناوچەکانی قەراغ بەتەواوی وێران کرابوو شار باژێر وێران کرابوو، هەروەها کۆمەڵێك ئۆردوگایان دروست کردبوو لە بازیان‌و لە ڕاپەڕین‌و سمودو لەنێوان چەمچەماڵ‌و تەکیە‌و ناوچەکانی دەوروبەری دا، کە خەڵکەکانیان لەوێ دا کۆکردبۆوە.

ئەو زەمانە کورد هەستی بەوە دەکرد وەك دیلێك وایە لە بەندیخانەیەکی گەورەدا، بێجگە لەوە ئەو ئیهانە گەورەیەی کە بەعسیەکان بە کوردیان کردبوو، شادەماری هەستیاری کوردی بزواندبوو، لەبەرئەوە خەڵك ئەگەر چی، فەترەی ئەوەی کە ئێمە تێك شکاین لەدوای عملیاتی ئەنفال، خەڵك زۆر بێ ئەمەل بوو بوو، بەڵام

وەختێك كە عێراق كوێتی داگیركرد، سەر لەنوێ ئومێد بوژایەوە بەوەی كە عێراق بەر لێدانێك دەكەوێت، وە ئەتوانێت هێن بێت، ئەو فەترەیەی كە عێراق چوو كوێتی داگیركرد، ئێمە لە هەموو لایەكەوە دەستمان كرد بەپەیوەندی كردن لەگەڵ هەمەموو ئەو كەسانەی كە لەگەڵ ڕژێم پەیوەندیان هەبوو، هەتا ئەوانەی كە زۆر پیاوی خراپیش بوون، هەموو ئەوانە پەیوەندیمان لەگەڵ كردن بۆ ئەوەی كە ڕووداوێك هاتە پێشەوە بەشداری بكەن، هەتا ئەوانەی كە مستەشار بوون ئان ئامر مەفرەزەی طواری بوون، هەموو ئەوانە قسەمان لەگەڵ كردنو بەشێكی زۆریشیان وەعدیان دا كە هاوكاریمان لەگەڵ دا بكەن.

پ٢/ ئایە هاوكاری كردنی مستەشارەكان هۆی نیشتمانیو كوردانە بوو؟ یان نەمانی ترسی بەعسو صدام بوو؟

و/ لەڕاستی دا هەندێكیان ڕەنگە لەبەر نیشتمان پەروەری بوو بێت، بەڵام بەشی هەرە زۆریان لەبەر ئەوە بوو باوەڕیان وابوو كە صدام ڕووخاوەو نیزامەكەی ڕووخاوە، لەبەر ئەوە بوو كە خۆی پاك بكاتەوە، بۆیە بەشداری كرد لەم ڕاپەڕینەدا. یەعنی ئەگەر بیانزانیایە كە صدام ناڕوخێت، ئەوە پێم وایە بەشێكی زۆریان هاوكاریان لەگەڵ نەئەكردین، وە هەموویان.

پ٣/ لەڕووی ڕاگەیاندنەوە چ ئامادەكاریەكتان كردبوو؟

و/ بەتایبەتی ڕادیۆكەی ئێمە لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە لە ڕووی پڕوپاگەندەوە تركیزمان كردبووە سەر ئەوەی كە ڕژێمی عێراق كۆتایی هاتووەو تەواوبووە. وە ئەو زەمانە خەڵك هەموو ڕادیۆكانی ئێمەیان دەكردەوە، یەعنی پاش ئەوەی كە هێن بوو، لە پێشدا ڕادیۆكەمان زۆر بە زەحمەت وەردەگیرا، لەبەرئەوەی عێراق تەشویشی لەسەر دانابوو،

بەڵام کە شەڕەکە دەستی پێکرد، مەرکەزی تەشویشات لێی دراو تەشویش لەسەر ڕادیۆکەی ئێمە نەما، ڕادیۆکەمان زۆر بە وازحی وەردەگیرا، لەزۆر جێگا خەڵك دەیانخستە سەر میکرۆفۆنی مزگەوتەکان، یەعنی کە ڕادیۆکە ئیشی دەکرد ئەیان بەست بە میکرۆفۆنی مزگەوتەکان، هەموو ناوچەکە گوێیان لێ ی دەبوو، بۆیە ڕادیۆکە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەریان.

ڕۆژێك لە ڕۆژان بتەوێت بچیت لەگەڵ ئەو برادەرانەی کە لە ڕادیۆکە کاریان کردووە قسەیان لەگەڵ بکەی، وەك: (عباس بدری، ئازاد چالاك، شوان کەریم کابان) ئەوانە هەموو لە ڕادیۆکە کاریان کردووە، (م.محسن) کە وەزیرە "لە کاتی ئەنجامدانی ئەم چاوپێکەوتنە" ئەمیش یەکێك بووە لەوانەی کە لە ڕادیۆی ڕاپەڕینەکەدا دەوری هەبوو، چونکە دوو ڕادیۆمان هەبوو، ڕادیۆیەکیان لە سەقز بوو، ڕادیۆیەکیشیان گەڕۆك بوو لەگەڵ خۆمان دەمان گێڕا، م.محسن و م.عبدالرحمن وەکیل وەزیرە "لە کاتی ئەنجامدانی ئەم چاوپێکەوتنە" ئەمانە لە ڕادیۆ کاریان دەکرد، ئەو ڕادیۆیەی کە تەوجیهی شانە نهێنی یەکانی ناو شاری دەکرد، کە چ بکەن و چ نەکەن.

پ٤/ باشە، با بێینەوە سەر باسی هەڵو مەرجی داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق و بەرنامەی ئێوە بۆی؟

ئەوکاتەی کە عێراق چوو کوێتی داگیرکرد، ئێمە پێمان وابوو کە هەلو مەرجێکی تازە هاتتە پێشەوە، لەبەرئەوە زنجیرەیەك کۆبونەوەمان کرد خۆمان، لەو زنجیرە کۆبونەوەیەدا کۆمەڵێك ئەگەرمان دانا (ناومان نا ئەگەرەکان)، ئەگەرەکان بە معنای چی بوو:

ئەگەری یەکەم ئەوەبوو: ئەگەر عێراق لە کوێت کشایەوە.

ئەگەری دووەم: ئەگەر عێراق لە کوێت نەکشایەوە.

ئەگەری سێیەم: ئەگەر عێراق لە کوێت مایەوەو لێی درا.

ئەگەری چوارەم: ئەگەر عێراق لە کوێت مایەوەو لێی نەدرا.

یەعنی ١٥ بۆ ٢٠ ئەگەری لەو بابەتانە احتمالاتمان دانا، بۆ هەر احتمالاتێك بەرنامەی خۆمان دانا، یەعنی چی بکەین‌و چی نەکەین، تەبعەن لەدوایی دا وەکو دەرکەوت وورده وورده ڕوداوەکان بەرەو ئەوە دەڕۆیشت بینیمان عێراق دەمێنێتەوە لە کوێت وە بەر حەملەی دنیا دەکەوێت، کە بەر حملەی دنیاش کەوت ئێمە هەموو بۆچوونمان وابوو عێراق بەری ئەم شەڕە ناگریت‌و هەرەس دەهێنێت، هیچ نەبێت دام‌و دەزگاکانی لە کوردستان هەرەس دێنێت، بۆیە ئێمە چیمانکرد؟ نەخشەی کوردستانی عێراقمان هێنا، هەموو ئەو شوێنانەی کە عێراقی تێدا بوو دیاریمانکرد، ئەو شوێنانەی کە مقراتی جەیش بوو دیاریمانکرد، ئەو شوێنانەی کە ئۆردوگای زۆرە ملێ ی تێدابوو، ئۆردوگاکانمان دیاریکرد. نەخشەی ناو شاری سلێمانی‌و هەولێرو کەرکوك – یشمان هێنا، ئەوە کە پێی دەڵێن مخطط أساسی، لەسەر ئەم نەخشانە شوێنەکانی حکومەتمان دیاریکرد، بۆ نمونە: مقری حیزبی بەعس‌و ماڵی پیاوخراپ. پاش ئەوەی ئەم کارەمان کرد، دەستە بەدەستە خەڵکی ئەو شوێنانەمان هێنا، بۆ نمونە: کەرکوکیەکانمان هێنا ئیشەکانمان بەسەر دابەشکردن، سلێمانیەکانمان هێنا ئیشەکانمان بەسەر دابەشکردن، هەولێریەکانمان هێنا ئیشەکانمان بەسەر دابەشکردن. بێجگە لەوەش ئۆردوگایەکانیشمان دابەشکرد بەسەر پێشمەرگەکاندا، وە هەموو کوردستانمان کرد بە دە بەشەوە، کوردستانی عێراقمان لەسەر ئەساسی ئەو ئۆردوگایانە کرد بە دە



بەشەوە، لە هەر بەشێکدا لێپرسراوێکی ی.ن.ك مان بۆدانا، وە هێزیشمان بۆ تەرخانکرد، هێزەکەش واجیباتمان بۆی تەرخانکردبوو، یەعنی ئەوە نەبوو ئەو هێزە بە ئارەزووی خۆی بچی چی بکە. مەسەلەن هێزێك لەو هێزانەی دامان نابوو لەبەری ئەو بەری دەربەندیخانەوە لەسەر سنووری ئێران دێیەك هەیە تەپەڕەشی ناوە هێزەکانی ئەو ناوچەیەی کە دامان نابوو لەبەینی عەربەتو کفری. لە ئۆردوگاکاندا مقری حیزبی بەعسیو امنو استخباراتی تێدابوو، دامان نابوو ئەو چوار جێگەیە پەلامار بدرێتو پەلاماری سەربازو پۆلیس نە درێت، مقری امن بەدەرەجەی یەکەمو مخابراتو استخباراتو بەعس، کە ئەو چوار شوێنە دەگیرا، ئیتر شارەکە سقوتی دەکرد، ئەو چوار شوێنەشمان دانابوو کە بۆ هەر هێزێك لێپرسراوێکمان دانا بوو، کە ئەو ئیشە ئەنجام بداتو جێ بەجێ ی بکە.

پ٥/ راپەڕین بۆچی سەرەتا لە ڕانیەوە دەستی پێکرد؟

و/ راپەڕین کە دەستی پێکرد لە ڕانیەوە دەستی پێکرد، ئەویش لە ڕانیە بۆچی دەستی پێکرد؟ لەبەرئەوە نیە بڵێین وەڵا خۆیان دەستیان پێکرد، چونکە ئێمە ڕانیەمان هەڵبژاردوو لەبەرئەوە وەك مدخلێك (دروازەیەك) وابوو بۆ گەڕانەوەی ئێمە بۆ کوردستانی عێراق. ئێمە مقرەکانمان لە قاسمە ڕەش بوو، لە زەڵێ بوو، هەموو هێزەکانمان لەوێ کۆکردبۆوە، ئەگەر شاری ڕانیە نەگیرایە نەمان دەتوانی هێزەکانمان بهێنینەوە بۆ کوردستانی عێراق، لەبەرئەوە تەرکیزمان کردەوە کە یەکەم شوێن ئازاد بکرێت، شاری ڕانیە بێت، بۆ ئەوەی بێینە ناو شاری ڕانیەو لەڕێگەی ڕانیەوە بچین بۆ شوێنەکانی تر، هەرواشمانکرد.

پ٦/ شێوەو جۆری دابەشکردنی هێزەکانتان لەو سەردەم چۆن بوو؟

٥و/ ی مانگ لە ڕانیە تەقیەوە "واتە ١٩٩١/٣/٥ ڕاپەڕین لە ڕانیە بەرپابوو"، وە پێشتر ئەوەی کە بۆم باسکردی ئەو هێزانەی کە ئامادەمانکردبوون، ئێمە چەند جۆرە هێزێکمان هەبوو، هێزێکی ملتەزیممان هەبوو لە (١٢) بەتالیۆن دا ڕێکمان خستبوو، لەناو ئێراندا هەر هێزێکیان (١٧٦) کەس بوون. لەحاڵەتی پێویستدا ئەیان توانی سەرکردایەتی (٢٥٠٠) کەس بکەن، ئەو (١٧٠) کەسەی کە دامان نابوون، ڕاهێنانو مەشقیان پێکرابوو، هەموویان وەك قابگو نائب قابتو وەکو ئەوانەی کە ئەتوانن خەڵك ئیدارە بکەن، نەك وەکو پێشمەرگەی ئاسایی، ڕاهێنانو مەشقمان پێ کردبوو کە ئەو (١٧٠) کەسە ئەیتوانی ببێتە سەرکردەی (٢٥٠٠) کەس لەکاتی پێویستدا.

بێجگە لەوان هێزێکی ترمان هەبوو کە لەناو ئۆردوگایەکاندا بوون، لە خەڵکی جوتیارو خەڵکی دێهاتو ئەوانیشمان ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا ئامادەبن، لەبەرئەوەی کە ژیانیان باش نەبوو هەژار بوون، نەیان دەتوانی وەك پێشمەرگەکانی تر بێتو پیشەیی بن، واتە ژیانی خۆشیان دەکردو لەپاڵ ئەمیشدا پێشمەرگایەتیان دەکرد لەکاتی پێویستدا، ئەمەش جۆرێکی تریان بوو.

بێجگە لەوانە (٥٢٠) پێشمەرگەی پارتیزانمان هەبوو، کە ناردبوومانەوە ناو نێوخۆی کوردستانی عێراق، کە لەناوچەو شوێنە جیاجیاکان چالاکیان دەنواند. سەرەڕای ئەوەش نزیکەی (٧٠٠٠) حەوت هەزار کەسمان ڕێکخستبوو لەناو شارەکاندا، بەناوی شانەی (بروسك)و (شالاو)، شانە چەکداری شالاوو بروسك. ئەمانە لە هەولێرو

لەناو شاری کەرکوک‌و لە ئۆردوگاکان‌و لە سلێمانی، دوو سەرکردایەتی جیاوازیان هەبوو، شاڵاو جیابوو، بروسك جیابوو. یەکێکیان لەلایەن برادەرانی هەولێرەوە سەرپەرشتی دەکرا"بروسك"، وە ئەوی تریشیان "شاڵاو" لەلایەن برادەرانی سلێمانیەوە سەرپەرشتی دەکرا. ئەوانە لەهەموو جێگاکاندا هەوڵیاندابوو لەناو هێزە چەکدارەکانی حکومەتدا شانەی چەکداری نهێنی دروست بکەن، وە لەهەموو گەڕەکێك‌و ئۆردوگایەکدا ڕێکخستنیان کردبوو بۆ کاتی پێویست. هەموو ئەمانە ڕەمزیان هەبوو، یەعنی هەندێکیان سیقەیان نەدەکرد بەهی ناو شارەکان، کاغەزیان ئەنارد کە بۆ ئەوەی لە ڕادیۆکەوە ئاگاداربکرێنەوە، بۆ ئەوەی سیقەیان پێ بکەن، بۆ نمونە: شانەی کامەران لە سلێمانی، پێمان ئەوتن: بۆ شانەی کامەران پەیامەکەتان گەیشت، بۆ ئەوەی بزانن پەیوەندیان بەشوێنێکی مەرکەزی تەواوەوە هەیە.

پ٧/ کەواتە شانە چەکدارەکان ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لە ڕاپەڕین؟

و/ لەڕاستیدا شانە چەکدارەکان لە ڕاپەڕیندا ڕۆڵێکی ئەساسیان بینی‌و پێشمەرگەش دەوری پشتیوانی بینی. لەسەرەتاشدا زۆری قوربانی شەهیدو بریندارەکان شانە چەکدارەکان دایان. لە ڕاپەڕینەکە ٣/٥ لە ڕانیەو ٣/٧ لە سلێمانی‌و ڕۆژی ١١ی مانگ لە هەولێر دەستی پێکرد، لە ١٨-٣/١٩ لە دهۆك‌و دەوروبەری‌و ڕۆژی ٣/٢٠ لە کەرکوك دەستی پێکردو ڕۆژی نەورۆز کەرکوك ئازادکرا.

پ٨/ ئەی ڕاپەڕینی هەولێر چۆن بەرپابوو؟

و/ سەبارەت بە ڕاپەڕینی هەولێر، لەناو شاری هەولێر ئێمە ڕێکخستنمان هەبوو، شانەی چەکدارمان هەبوو، کە لە ڕێگەی ڕادیۆوە ڕاسپاردەو ڕێنماییەکانمان کە لە ڕانیە بوون لە ئەساسدا بۆ هەولێر

بوون. بۆ ئەوەی ڕێگای خۆیان بکەنەوە بۆ شاری هەولێرو هەولێر ئازادبکرێت. هێزەکانمان لە ڕانیە کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکیان چوون بۆ کۆیە، وە بەشێکیان چوون بۆسەر شەقڵاوە، لەڕاستیدا کۆیەو شەقڵاوە ڕاپەڕینی تێدانەبووە، بەڵکو بەشەڕ ئازادکراوە. کاتێك کە شەقڵاوە ئازادکراوە دەرگا کراوە بۆ هەولێرو پێشمەرگە بەرەو شاری هەولێر هەنگاویان ناو لەناو شاریشەوە بەهۆی جەماوەرو میللەتو ڕێکخستنو شانەی چەکدارو بە بەشداری کردنی لایەنگرانی هەموو پارتە سیاسیەکان ڕاپەڕینوپەلاماری شوێنە ئەساسیەکانیاندا، وەك مقراتی حیزبی بەعسو مخابراتو دائرەی امنو ...تاد، بەم شێوەیە ڕۆژی ١١ی ئازار (١٩٩١) شارەکە ئازادکرا. سەبارەت بەوەی کە دەڵێن هەولێر درەنگ ئازادکراوە، درەنگ نەبووە، لەبەرئەوەی (٥) ڕۆژ پاش ڕاپەڕینی ڕانیە بوو.

پ٩/ لە چەند قۆڵەوە هێرش کراوە بۆ ئازاد کردنی هەولێر؟

ئەوەی من بەبیرم بێت سەبارەت بەوەی لە چەند قۆڵەوە هێرش کراوەتە سەر شاری هەولێر، ئەوەیە تەنها لەسەرەوە بووە، واتە میحوەری ئەساسی لە شەقڵاوە وە بۆ خوارەوەو بەرەو هەولێر هێرش کراوە، واتە لە شەقڵاوە وە بۆ مصیفو لە وێشەوە بۆ هەولێر هێرش کراوە.

پ١٠/ ئیسلامیەکان چ ڕۆڵێکیان بینی لە ڕاپەڕینی ١٩٩١ی کوردستان؟

و/ حیزبە ئیسلامیەکانی ئەو سەردەم تەنها یەك حیزبی ئیسلامی هەبوو، ئەویش بزووتنەوەی ئیسلامی بوو، کە لە هەموو شتەکاندا بەشدار بوون، بەڵام کەم بوون "لەڕووی ژمارەوە"، چونکە حیزبێکی زۆر بچوك بوون. لە هەندێك شوێن شتی زۆر خراپیان دەکرد، مەسەلەن کە

چوونە کەرکوکەوە پاش ئەوەی ئەوانیش کە هاتنە کەرکوکەوە، گەورەترین کۆگای کەرکوکیان سوتاند، چونکە مشروباتی تێدابوو.

پ١١/ باشە بەر لە هەڵگیرسانی راپەڕینی کوردستان، بەڕێزتان لە کوێ بوون؟

و/ من لەکاتی ڕاپەڕین لەناو زەنگ بووم، کە لەناو خاکی کوردستانی عێراقە، وە ڕادیۆکەشمان ئەوەی کە ڕێنمایی خەڵکی دەکرد، هەر لەناو زەنگ بوو.

پ١٢/ بەگشتی هۆکارەکانی شکستی ڕاپەڕین بۆ چی دەگەڕێنیتەوە؟

و/ لەڕاستیدا ڕەنگە تۆزێك هینی تێدابووبێت ئەوەی کە دەڵێن باش هەڵنەسەنگاندن. ئێمە لەوەو پێش حسابمانکردو عێراق (٥٦) فرقە سەربازی هەبوو، لەکاتی شەڕەکانی کوێت دا ئەمەریکاو هێزە هاوپەیمانەکان بڵاویانکردەوە کە (٤٤) فرقەیان لەناو بردووە. ئێمە پێمان وابوو کە بەڕاستی ئەمەریکا درۆ ناکات، کە ئەمەش لە زۆربەی ڕاگەیاندنەکانی دنیا بڵاوکرایەوە، کە بەشێکی زۆری سوپای عێراق شکاوەو لەناو چووە، حسابی ئەوەمان نەکردبوو کە هێشتا حکومەتی عێراقی هێزە ئەساسیەکەی ماوە. هێزە ئەساسیەکەی بریتی بوو لە (حرس جمهوری) هیچی لێ بەسەر نەهاتبوو، هێزەکانی تریشی کە لە جنوب بوون هیچی وای لێ بەسەر نەهاتبوو. وە ئەو هێزانەی ئێمەو حکومەتی عێراقی زۆر نا بەرامبەر بوون لەگەڵ یەکتری. ژمارەی پێشمەرگەکانی ئێمە زۆر کەم بوو ژمارەی ئەوەمان نەبوو کە بەرامبەر بە هێرشێکی نیزامی بەرگری بکات. ئێمە هەوڵی زۆرماندا بۆ ئەوەی لەناو شارەکاندا کە بنکەو مقری زۆر بکرێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی فێری شەڕی ناو شارەکان بکەین، بەڵام ئەمە هیچ سوودی نەبوو، تێیدا

سەرکەوتوو نەبووین. بۆیە کاتێك کە حکومەت هێرشی گەورەی بە پشتیوانی هەلیکۆپتەرو چەکی قورس کرد بۆ سەر شارەکان، خەڵك هیچ بەرگری نەکردوو هەموویان ڕایانکردوو بەرەو ئەوەی کە شارەکان جێ بهێڵن‌و دوای ئەمانیش پێشمەرگەش دەستی کرد بە ڕاکردن بەدوای خەڵك دا. بۆیە لەڕاستیدا هێزی ئەساسی زەبرێکی وایان نەخواردبوو، بە سەلامەتی مابونەوە، بەمەش تا بەرامبەریەکی زۆری هێز هەبوو لەبەینی ئێمەو حکومەت، بۆیە پێشمەرگە دەرەقەتی نەهات.

پ١٣/ زۆرباشە، ئەی چەند حیزبی کوردی بەشداری کردووە لە ڕاپەڕین دا؟

و/ وەکو باسمکرد هەموو حیزبە کوردیەکان بەشداریان کردووە، بەڵام هەریەکەو بە حەجمی خۆی. وەکو چۆن ئەوەی کە باسمکرد کە کوردستانمان کرد بە (١٠) دە بەشەوە، لە هەموو بەشێکی دا ئێمە لێپرسراوێکی خۆمان دانابوو، پارتیش لێپرسراوێکی خۆی دانابوو، بەهاوبەشی ئەوەکرا، بەڵام لەهەندێك جێگە ئەوان نەهاتن، بەڵام لەهەندێك جێگەی تردا هاتن‌و بەشداریانکرد، کە لە هەولێر بەشداریانکرد، بەڵام بەگوێرەی حەجمی خۆیان.

ئەو سەردەمیش بەر لە ڕاپەڕین هێزی پێشمەرگە ژمارەی کەم بوو، بەتایبەتی لەدوای ئەنفالەکانەوە. بەتایبەتی پارتی کە زۆربەی ماڵ‌و مناڵەکانیان لە ئێران بوون بەهەزار حاڵ کۆدەکرانەوە، یەعنی ئەوە نەبوو کە هەموو دەست بەتاڵ بن‌و زگورتی بن‌و بێن سەپەرشتی هەموو ئیشەکان بکەن، بەڵام لەڕاستیدا هەموو حیزبەکان بەشداریانکرد هەرکەسەو بەتوانای خۆی.

**پ١٤/ پەیوندی لەنێوان راپەڕینی باشووری عێراق لەگەڵ راپەڕینی کوردستان هەبووە؟ گەر هەبوو چۆن بوو؟**

و/ لەپێشدا تەنسیق هەبوو، بەتایبەتی لەگەڵ مجلسدا (مجلسی اعلای ئیسلامی). خۆی ئەوکاتە کە خەریکی دانانی نەخشەی راپەڕین بووین دوو بۆ چوونی جیاواز هەبوو، ئێمە کۆمیتەیەکی عەسکەری‌و کۆمیتەیەکی سیاسیی مشتەرەکمان هەبوو، کۆمیتە عەسکەریەکە نوێنەری یەکێتی‌و پارتی‌و مجلسی اعلای تێدابوو، کۆمیتە سیاسیەکەش بەهەمان شێوەبوو. ئەو کۆمیتە عەسکەریە زنجیرەیەك کۆبونەوەمان کرد بۆ ئەوەی کە چی بکەین، پێشنیارێك هاتبووە پێشەوە کە هەموو هێزەکانی یەکێتی‌و پارتی‌و مجلسی اعلا کۆ بکرێتەوە لە مقابلی شاری مەندەلی عێراقدا بۆ ئەوەی کە کاتێك عێراق تێك چوو، لەوێوە هەموو پەلاماری شاری بەغدا بدەن‌و بەغدا بگرن، بەڵام مجلسی اعلا لە دواییدا ئەوەی پەسند نەکردو پێیان باش بوو ئێمە لە کوردستان دەست پێ بکەین‌و ئەوانیش لەخواروو. دوایی ئەگەر کرا لە بەغدا یەك بگرینەوە. ئێمە شتەکانی خۆمانمان کرد، بەڵام هەتا ئێمە شتەکانی خۆمانمان کرد، راپەڕین لە جنوب دا تێك شکایەوە، کە حکومەت سەیتەرەی کردەوە بەسەر جنوب داو راپەڕینی تێك شکاندو خەڵکێکی زۆری کوشت، کە بۆ ئەوەی ئێمە لە کەرکوکەوە بۆ بەغداو ئەوانیش (مجلس) لە حلەوە بۆ بەغدا بێن سەری نەگرت. هەرچەندە پێکەوە یەك کات دەست نیشانکرابوو بۆ راپەڕین، بەڵام لە خواروو تێك شکان.

زۆر سوپاس کاك نەوشیروان...

سوپاس بۆئێوەش...

**هەشتەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا (خدر ئیبراهیم خدر[1])،٢٠٠٣/٢/٤، قەلادزێ:**



**پ١/ پێناسێکی کورتی ئۆردوگای خەبات؟**

و/ ئەم ئۆردوگایە پێشتر بۆ دانیشتوانی گوندێ دیبەگەو بەشێك لە دانیشتوانی تری دەشتی هەولێرو دەوروبەری مەخمور کراوەتەوە، پاشان لەساڵی ١٩٨٩ دانیشتوانی ناحیەی سەنگەسەرو بەشێك لە دانیشتوانی شاری قەلادزێ ی تیدا کۆکرابۆوەو تیکرای خانوبەرەی هاولاتیان لەسەر دەستی دانیشتوانی راگویزراو خۆیان دروست کران تیایداو پێشتر حکومەت ئامادەی نەکردبوون بۆ دانیشتوان.

ئەم ئۆردوگایە لەنزیك ناحیەی خەبات دروست کراوەو لە رووی جوگرافیەوە دەکەویتە سەر ریگای گشتی هەولێر-موصلو بەهۆی هەلکەوتەی جوگرافیایی ناوچەکەوە بەئاسانی لەلایەن هێزی

---

(١) مامۆستا خدر ئیبراهیم خدر لەدایك بووی ( قەلادزێ ) ساڵی ( ١٩٧٠ ) ، دەرچووی کۆلێژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەددین ، ئێستا مامۆستایە لە خوێندنگای ( ئامادەیی ئالای تێکەڵ ) لەقەلادزێ ، لەساڵی ( ١٩٨٧ )ەوە تا ئێستا چەندین بابەتی ئەدەبی و مێژوویی و وەرگێرانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاوکردۆتەوە ، خاوەنی چوار کتێبە بەناوی ( باوەڕبەخۆبوون لەڕۆژێکدا ) و (نان)و ( نامەیەك بۆ دوایین میوانم ) و ( دەروونناسی ژیان ) . لەکاتی ڕاپەڕینی ( ٤ / ٣ / ١٩٩١ ) دا لە ئۆردوگای خەبات ژیاوەو لەوکاتەدا خوێندکاری قۆناغی یەکەمی زانکۆ بووە .

حکومەتەوە دەتواندرا ئابلۆقە بدرابایە یاخود هەرکاریکی خۆی تیداجی بەجی بکردایە.

پ٢/ روداوەکەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٤ چۆن رووی دا؟

و/ لای نیوەڕۆ چەند پۆلیس و چەکداریکی خاصە لە گەرەکی سەنگەسەریەکان داوای هویە ناسنامە لە چەند کەسیك دەکەن و یەکیك لەو کەسانە هویەی لانابی و ئەوانیش وازی لی ناهینن، بۆیە کەسەکە بەرەو ناو مالەکان رادەکاو ئەوانیش دوای دەکەون، لیرەدا دانیشتوانی گەرەك بەتایبەت ئافرەتەکان دەکەونە جنیو پی دانیان و وورده وورده خەلك کۆ دەبیتەوەو تەقە دروست دەبی لەنیوان چەکدارەکانی حکومەت و چەند کەسیك لە مالەکانەوە. لە ئەنجامدا پۆلیس و مەفرەزە خاصەکان دەترسین و یەکیك لە پۆلیسەکان بەناوی (قیس) بریندار دەبی و بەراکردن بە کۆلانەکاندا بەرەو گەرەکی قەلادزەیی یەکان رادەکەن و خەلکیش دوایان دەکەویت و بەرەبەرە گەرەکانی تریش دەگریتەوە.

پ٣/ ئایە کی بەشداری لەتەقەکان کرد؟

و/ دوای ئەوەی جەماوەر وورووژاو تەقیەوە، سەعات (٢)ی دوای نیوەڕۆ حکومەت هیزیکی سەربازی هینا بۆلای باشووری ئۆردوگاکە کە کەوتبووە سەر ریگای سەرەکی و گەراجی لی بوو، ئەوکاتەش چەند کەسیك کە چەکی کلانشیکۆفیان پەیداکردبوو لە کۆلانەکانەوە کەوتنە تەقەکردن لە هیزەکانی حکومەت تاکو نزیکەی سەعات (٥،٣٠)ی ئیوارە.

پ٤/ سەرچاوەی چەکی کلانشیکۆفەکان لە کوی وە بوو؟

و/ ئەم چەکانە لە ریگای ئەو قوتابیانەوە دەستکەوابەش کردبووتبوو، کە حکومەت پیشتر بەسەر خویندکارەکانی دا دابەش کردبوو، بەمەش پاراستنی هیمنی ئۆردوگاکە لە شەواندا کە بەنۆرە کۆمەل ئیشك بگرن.

پ٥/ ژمارەی چەکەکان چەند بوو؟

و/ لە نیوان (٣--٤) کلانشیکۆفدا بوو.

پ٦/ هەلویستی هەرکیی یەکانی بەشی باکووری ئۆردوگاکە چی بوو؟

و/ بەگشتی هەلویستیان خراپ بوو، چونکە لەوتەقانەی لە رۆژی ٣/٤ دوو چەکداری هەرکی کوژران و داوای تۆلەیان دەکرد، وە رۆژی ٣/٥ لای نیوەرۆ بۆماوەی (١٠) دەقیقە بە کلانشیکۆف‌و ئاربیجی کەوتنە تەقەکردن بەسەر ئۆردوگاکەدا.

پ٧/ ئایە لەم رۆژەا هیچ بارەگایەکی حکومی گیرا؟

و/ نەخیر، بەلام حکومەت لەو رۆژەوە چیتر نەیتوانی ئازادانە بگەری‌و لەو رۆژەوە چیتر رفیق حیزبی یە کوردو عەرەبەکان نەیان توانی بگەرین‌و ئیهانەی خەلك بکەن.

پ٨/ ئایە حکومەت پاشان هاتەوە ئۆردوگاکە؟

و/ نەخیر حکومەت نەهاتەوە ناو ئۆردوگا بەهیچ شیوەیەك، بەلام لە ئیوارەی رۆژی ١٩٩١/٣/١٠ ئاگاداری ریش سپی یەکانی ئۆردوگایان کردبوو کە دەبیت چی خویندکار هەیە چەکەکانیان ببەنەوەو تەسلیمی منەزەمەی بکەن، ئەگەر تەسلیمی نەکەنەوە لەماوەی (٢٤) سەعات دا ئەوا تۆلەیان لی دەکریتەوەو ئۆردوگاکە بەخراپترین شیوە ویران دەکریت.

پ٩/ ئایە ڕووداوەکە بەبەرنامە بوو؟

و/ نەخێر شێوەی ڕوودانەکەی عفوی بوو، بێ بەرنامە بوو، چونکە بەهیچ شێوەیەك گگونجاو نەبوو لەو ناوچە گرنگ‌و حساسە راپەڕین ببێ کە کەوتبوە ناو جەرگەی کوردستان‌و لەسەر ڕیگای سەرەکی (هەولێر- موصل) هەلکەوتبوو، وە فەیلەقی (٥) بەتەواوی لە پارێزگای هەولێردابوو. بەلام لەگەل ڕوودانی راپەڕینەکەدا کەسانی ناو ڕیکخستنەکان کەوتنە چالاکی‌و بەشداری گەورەیان لە تیکرای جموجۆلەکانی ئەو ڕۆژەدا کرد.

پ١٠/ شەهیدەکان کێ بوون؟

و/ بەختیار عومەر حەسەن (هوریوەیی)و (محەمەد دیبەگەیی).

پ١١/ کاردانەوەی ڕژێم بەرامبەر بە دانیشتوانی ئۆردوگاکە چۆن بوو؟

و/ بەدڵنیاییەوە ئەگەر راپەڕین لە ڕانیە سەری هەڵنەدابا و بەرەبەرە ناوچەکانی تری کوردستانی نەگرتبایەوە، ئەوا حکومەت بەتوندترین شێوە سزای دانیشتوانی ئۆردوگاکەی دەدا، هەروەکو (خالید دلێر) لە یەکێك لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی ئالای ئازادی ساڵی ١٩٩٢ بەڵگەنامەیەك باس دەکات، کە گوایە حکومەتی عێراق مەبەستی بووە دانیشتوانی ئۆردوگاکە ئەنفال بکات، هەروەکو خالید دلێر باسی کردووە لە ڕۆژنامەکەدا.

پ١٢/ بەشداربوانی راپەرینەکە کێ بوون؟

و/ بەشێوەیەکی گشتی خویندکاران بوون، کە بە کوڕو کچ زۆرینەی ئەو خەڵکەیان پێکدەهینا، کە لە ڕاپەرینەکەدا بەشداربوون.

زۆر سوپاس...

نۆیەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا (تاهر بەکر حسین)، ٢٠٠٣/٢/٢٥، سلێمانی:



پ١/ بەر لە ڕاپەڕین چۆن بوو ئێوە وەك مەفرەزەی چەکداری پارتیزانی گەڕانەوە بۆ دەورووبەری شارەکان؟

و/ مەکتەبی سیاسیی بڕیاری وابوو بۆ ڕاپەڕین مەفرەزەی چەکدار بنێرێتە خوارەوە بۆ دەورووبەری شارە گەورەکان، (هەولێر- سلێمانی-دهۆك) لەگەل شارو شارۆچکەکانی تر، ئەم بڕیارەش زیاتر خۆی لەنەخشەو پلانێکی کاك نەوشیروان مستەفا دەبینیەوە.

ئیمە کە پێك هاتبوین لە شەهید مەلا سلیمان-جلال ئیلنجاغی- مام ئەمیری شاخە پیسکە- مامۆستا کاوە- خۆم- خالە خولە- بورهانی سەعید صۆفی،....هتد، لە ١٩٩١/٢/٢١ لە دێی کونە مار بەرامبەر شاخی مامەندەیە بەرێ کەوتین، بەسێ-چوار ڕۆژ گەیشتینە دەشتی هەولێرو دێیەکانی ناحیەی دێگەڵە.

مەفرەزەکان زۆر بوین بەتایبەت لەکاتی هاتنە خوارەوەمان، بەڵام لەهەرشوێنێك مەفرەزەیەك دەڕۆیشت بۆ شوێنی مەبەستی خۆیی و لەکاروانەکە دادەبرا. بۆ نمونە مەفرەزەی لای کۆیە مامۆستا باپیرو کۆمەلێك پیشمەرگە بوون. مەفرەزەی ئۆردوگاکانی کانی قرژاڵەو

تۆبزاوە و بەرانەتی شەهید مەلا سلیمان بوون. مەفرەزەی شاوەیس‌و پیرزین بورهانی سەعید صۆفی بوو. ئیمە ناوچەی قوشتەپەو ئۆردوگای کەسنەزان‌و دارەتوو و بنەصلاوە بووین.

پ۲/ چ ئەرکێك بە ئێوە سپێردرابوو لەو شوێنەی خۆتان کە بۆی دەچوون؟

و/ هەریەکێکمان کۆمەلێك نامەی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك) مان پێ بوو بۆ سەرۆك جاش‌و مستەشارەکان تاکو بەشداری ڕاپەڕین بکەن، یان لەکاتی ڕاپەڕین دژی خەلکەکە نەوەستن‌و بێ لایەن بن. هەروەها شانەی ڕێکخستنەکانی خۆشمان ئاگادار دەکردەوە کە چەك کۆبکەنەوەو بەرنامەی ڕاپەڕین دابنێین، کارەکانی ئێمە زیاتر لە ئۆردوگای کەسنەزان کرا.

پ۳/ کەواتە پیاوانی سەر بە بەعس هاوکارتان بوون؟

و/ سوپای عێراق‌و هەندێك جاش نەبێ کە بەشداری سەرکوت کردنی ڕاپەڕین‌و هێرشی پێشمەرگەیان دەکرد؛ بەلام بەگشتی فەوجە سوکەکان دۆستی شۆڕش‌و خەلك بوون، بەشداربوون لە هەلمەت بردن بۆسەر مۆلگەکانی بەعس.

پ٤/ بێجگەلەوە ئێوە چ ڕۆلێکی ترتان بینی؟

و/ ئێمە ڕۆلی سەرەکیمان بینی لە ڕێکخستن‌و دروست کردنی شانەی چەکدار لە ئۆردوگای کەسنەزان، کە ئەوکاتە هێزێکی زۆری سەربازی لە هەولێرەوە بۆ کۆیە بەڕێ کەوتبوون لەکاتی ڕاپەڕینەکە، کە هێرش دەکرا سەر منەزەمەی کەسنەزان ئەرکی خەلکە چەکدارەکە بوو بە دوو ئەرك: یەکیان پەلاماری منەزەمەی بەعس بوو هاوکات لەگەل پەلامارەکە هێزیکی زۆری سەربازی شکاو لە کۆیەوە دەگەڕاوە هەولێر کە دەبابەو سەیارەیەکی زۆر بوون بۆیە لەیەك کاتدا هێرش دەکرایە سەر هەردوولا.

**دەیەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ باپیر بەکر باپیر (مامۆستا باپیر[1])، ٢/٣/٢٠٠٣، سلێمانی:**

**پ١ ) وەك دەستەی چەکداری پارتیزانی چۆن و بە چ شێوەیەك هاتنەوە بۆ دەشتی کۆیە ؟**

نزیکەی ٢٠ رۆژ پێش راپەڕین وەك مەفرەزەی دەشتی کۆیە و تەق تەق بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی لەناوزەنگەوە بەرەو سنووری کۆیە بەرێکەوتین . ژمارەمان (١٥) پ. م بوو بەسەرپەرشتی من و ، ئەوانەی لە گەڵمان بوون فەرماندەو کادیرو پێشمەرگەی قاڵبۆوە و خاوەن ئەزموون بوون . بەرێگای بناری قەندیل دا هاتینە خوارێ ، بەناو ژاراوەو بەستەستێن و سەنگەسەردا تێپەڕمان کرد ، هەموو ئەو شارو ناحیەو دێهاتانەی بینیمان قەندیل دا و هیچ خانوویەك بە پێوە نەمابوو . سەر لە بەیانی گەیشتینە گوندی (دوو گۆمان) کە ئەویش بەهەمان شێوە تەخت کرابوو . سەربازگەی سوپای عیراقی لە هەموو ناوچەکەدا هەبوو ، بۆیە ئەو رۆژە تا نزیکەی ئێوارە لە دووگۆمان ماینەوە و دەمەو ئێوارە بەرێکەوتین بەناوچەی پیرانە رەشاندا سەرکەوتین بەرەو گوندی سارتکە . ئەو گوندە بەسەر دۆڵی سەرکەپکان دا ئەڕوانێت وتەقینرابۆوە لەلایەن سوپاکەی صدام حسینەوە . لەوێوە

---

(١) مامۆستا باپیر، لەدایك بووی ساڵی ١٩٥٢- کۆیە یە، پلەی لێپرسراویەتی پێش راپەڕین، بریتی بووە لە لێپرسراوی رێکخستنی تیپی ٢١ی کەرکوك. ئێستاش لەوەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەڕێوەبەری گشتی بڕوانامەکانە.

بەرەو بەرزاییەکانی پشتی دەلالآن ڕۆیشتین ، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لەو ناوچەیە ماینەوە . بەردەوام باران دەبارەی و ئەوساڵە باران بە زۆری دەباری وتا کۆتایی نیسان باران زۆر زۆر بوو بۆ ئێوارەی ڕۆژی دووەم بەسەرکەپکان و گوندی (گەنم کەندالْ) داڕۆیشتین بەرەو ئۆردوگای حاجیاوا . لەماڵی کاک عەولآی تەها لە حاجیاوا خۆمان ووشك کردەوە چونکە بە هۆی بارانەوە هەموو گیانمان تەڕبوو بوو لە دوای نیوە شەو بەرەو بناری کۆسرەت کەوتینە ڕێ ، ماڵە مەڕدارەکانی قەمتەران کەلە ڕەشماڵآندا بوون زۆر هاوکاریان کردین لەوێوە بەرەو بناری شاخی هەیبەت سوڵتان بەدیوی چناڕۆك دا بەڕێکەوتین و ئەو ناوچەیەمان کردە شوێنی جوڵآنمان ، ئەو شوێنە ناوچەیەکی چۆڵ بوو لەبەرامبەر گوندی باداوان و هاتووچۆی بەسەرەوە نەبوو.

پ٢) چەند مەفرەزە بوون ؟

ئەو مەفرەزانەی سنوری کۆیە و دەشتی هەولێر و شەقلاوە و بەڕانەتی بەیەکەوە هاتینە ناوچەکەو لەحاجیاوەوە لە یەکتری جیابووینەوە هەر مەفرەزەیە بۆ شوێنی خۆی بەڕێکەوت . کە ئەمانە بوون :

أ. مەفرەزەی دەشتی کۆیە و تەق تەق (مامۆستا باپیر) لێپرسراویان بوو ناوی پێشمەرگەکان ئەمانە بوون :

١) باپیر بکر باپیر (مامۆستا باپیر) فەرماندەی مەفرەزە خەڵکی کۆیە .

٢) ئاشتی سابیر میرە (خەڵکی کۆیە )

٣) شەهید فریاد قەسرۆکی (سەمەد حمە زیاد تاڵەبانی )

٤) شەهید کامەران احمد (خەڵکی کۆیە )

٥) مامۆستا زیرەك خدر ( خەڵکی کۆیە )

٦) صباح بکر مەلا ( خەڵکی کۆیە ).

٧) شێروان حەسن ( خەڵکی کۆیە ) .

٨) بورهان سەلام (بورهان شەوگێڕی ) کۆیە – گوندی شەوگێڕ.

٩) محمد هەڵدێر ( خەڵکی کۆیە ) .

١٠)مەلا جمال حاجی علی ( خەڵکی گوندی مەلا زیاد سەربەناحیەی تەق تەق) .

١١) دڵزار علی حەمشین ( خەڵکی تیمارۆك ) .

١٢) شەهید برایم عوسمان ( خەڵکی کانی ڕەش ) .

١٣)هەڵۆ ڕەش سارتکەیی ( خەڵکی سارتکەی بەرامبەر دوکان ) .

١٤) شێخ کریم ( خەڵکی گوندی کاولان ) .

١٥) ئەنوەر رسول ( خەڵکی گوندی باغەجنێر ) .

ب. مەفرەزەی شەقڵاوە شەهید تحسین کاوانی لێپرسراوی مەفرەزە .

ت. مەفرەزەی دەشتی هەولێر جەلال ئیلنجاغی لێپرسراوی مەفرەزە.

پ. مەفرەزەی ناو هەولێر بەسەرپەرشتی برهان سەعید سۆفی .

ج. مەفرەزەی سنوری بەڕانەتی بەسەرپەرشتی شەهید مەلا سلێمان .

کەئەو مەفرەزانە بەیەکەوە بەرەو سنوری هەولێر بەڕێکەوتن، هەرگروپەو بۆ سنورێك دانرابوون، هەر مەفرەزەیەك ژمارەیان لە حدودی (١٠) پ.م دابوو بەیەکەوە لە سنوری هەولێر و دەشتی هەولێر و بەڕانەتی دەستیان بەکارەکانیان کرد.

پ٣) ئەرکی ئێوە چی بوو ؟

هەر لەدوای گەیشتینە ناوچەکە دەستمان کرد بە پەیوەندی کردن ، لە مەکتەبی سیاسیەوە هەندێك نامەمان هێنابوو بۆ هەندێك کەسایەتی ناوچەکەو هەندێ لێپرسراوی حکومەتیش هەروەها پەیوەندیمان کرد بە ڕێکخستنەکانی ناوشار و هەندێ پێشمەرگە کە ڕێکخرابوون وەك شانەی چەکدارلەناو شاردا لەوانە ، دەشتی حمد امین و سەفین عومەرو چەندانی تر.

وە بە هۆی جیهازی ڕاکاڵەوە پەیوەندیمان بەسەرکردایەتیەوە ئەکردو دەنگوباسی ناوچەکەمان ئەدانێ و چاوەڕێی بڕیارەکانی ئەوانمان ئەکرد . ئێمە کارەکانی خۆمان ڕۆژانە پلانرێژ دەکرد..

مەفرەزەیەکمان بە سەرپەرشتی مەلاجمال ناردە سنوری تەق تەق هەروەها مەفرەزەی دووەممان بەسەرپەرشتی ئاشتی ناردە ناو کۆیە بۆ پەیوەندی کردن و هەندێك کاری پێویست.

پ٤) ترسی ڕژێمی بەعس تان نەبوو؟

هەرچەندە هێزەکانی رژێم لەناوچەکەدا بە زۆری هەبوون بەڵام زۆر بێ وورە بوون . هێزەکانی عێراق لە خوارووی عێراق و کوێت زیاتر لە مانگێك فرۆکە جەنگیەکانی ئەمریکا پەرێشانیان کردبوون پرزەیان لێ بڕیبوون ، لە ناوچە شیعە نشینەکانی خوارووی عیراق ڕاپەرینی خەڵك دەستی پێ کردبوو . جەیشی عێراقی کەلە کوردستان جێگیرکرابوو بە هۆی ئەو دەنگ و باسانەی کوێت و ڕاپەرینی خوارووی عێراقەوە زۆر بێ وورەبوون ، داوامان لەهەر ڕەبیەیەك یا سەر بازگەیەك دەکرد زۆربەیان

وایان پیشان ئەدا کە ئەوان بەرگری ناکەن. بۆیە کارەکانی ئێمە لەوماوەیەی پێش راپەرین لەجاران بێ ترستربوو.

**پ٥) پەیوەندیتان بە کێ وە کرد ؟**

پەیوەندیمان بە بەرێوەبەری ناحیەی کۆیە و بەرێوەبەری پۆلیسی و بەشێکی زۆر لەسەرۆك جاشەکانی ناوچەکە کرد کە هەموویان بێ لایەنی خۆیان پێشانداو ئامادەی هاوکاریمان بوون . هەروەها پەیوەندیمان بەشانە چەکدارەکانی بروسك و پێشمەرگە کۆنەکانی خۆمان و چەندین کەسایەتی ترکرد کە کار ئاسانی زۆریان بۆ کردین و پێویستیەکانیان بۆ دابین کردین

ئەوانەی ئامادە نەبوون تەنها قاسم ئاغاو مەنزومەی ئیستخبارات نەبێت. تەنانەت زۆربەی سەربازەکانیش لەگەڵ خەڵك وا قسەیان دەکرد کە ئەوان بەرگری لە رژێم ناکەن ئەگەر راپەرین رووبدات.

**پ٦) کاتێ ڕاپەرین لە ڕانیە و بیتوێن هەڵگیرسا ، ئێوە لە کوێ بوون ؟**

ئێمە رۆژی پێشتر یەکتریمان گرتبۆوە جگە لە مەفرەزەی تەق تەق کەلە سنوری تەق تەق بوون ، لە چنارۆکی بڵباسانەوە سەر لە بەیانیەکەی خۆمان گەیاندە گوندی قەمتەران و لەناو مەڕدارەکانی ئەوێ بووین . من نامەیەکم نووسیبوو کە چەند ڕۆژێك پێشتر خەریکی بووم باسی ئەوەم تیا کردبوو کە ڕاپەرین زەمینەی لە باری هەیەو پێویستە لە ئێزگەکە بانگەشەی بۆ بکەین و باسی واقعەکەم تیانوسیبوو ، شەوی ٤-٥/ ١٩٩١/٣ بەرەو ڕەشماڵەکانی گوندی قەمتەران بەڕێکەوتین .

بەرەبەیانی رۆژی ١٩٩١/٣/٥ واتە ڕۆژی ڕاپەڕین چوینە ماڵی حاجی عوسمانی قەمتەران کە مەڕداربوون و دۆستی شۆرش بوون ناردم کە بچێت لە چوار قوڕنە کاك دڵشادی شکراللە ئاگادار بکاتەوە و لەگەڵ خۆی بیهێنێت تا نامەکە بە کاك دڵشاد بنێرم بۆ مەکتەبی سیاسی و کاك نەوشیروان کاتێك حاجی عوسمان چوو ئاگاداری دڵشادی کردبوو بەڵام بینیبووی لە فرقەی چوارقوڕنە عەسکەرەکان هەموویان لە ئامادەباشی دانرابوون و دابەشیان دەکردن بۆ سەر ڕێگاو بازگەکان ، گەڕایەوە گوتی ڕێگا زۆر ناخۆشەو هاتوو چۆ بڕاوە ، هۆیەکەی ئەوەبوو ڕۆژی چواری مانگ هەندێك تەقە وجموجۆڵی خەڵك لە جیاجیاوا ڕوویدابوو . کاتێك کـــاك دڵشاد هات بۆلامان لـــە نێوان کاتژمێر (١٠-١١) بەیانی بوو گوتی لە ڕانیە تەقیوەتەوە بەڵام دەنگ و باسی وورد نازانم ئێمەش خەڵکمان نارد دەنگ و باسەکەمان زانی کە شەهید عەلی نەبی دەستی بەسەر سەرای ڕانیە داگرتووە و تەقەیە لەناوشارو خەڵکی ڕانیە ڕاپەڕیوە .

جیهازێکی ڕاکاڵمان لە ماڵی مام قادر تیمارۆکی دانابوو لە دەواجنەکانی گوندی قەمتەران و پەیوەندیمان کردبە مەکتەبی سیاسیەوە ، بە بروسکەیەك بارو دۆخەکەمان بۆناردن. دوای کردنەوەی ئێزگەکە لە کاتژمێر (٣) ی دوای نیوەڕۆ ئەو بروسکەیەی ئێمە بە دەقی خۆی لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان خوێندرایەوە . دەوروبەری شاری ڕانیە و ڕێگای سەرکەپکان و ڕێگای دەربەندی تانزیکی ئێوارە سەربازگەکانیان وەك خۆیان مابوونەوە دواتر لەناو رانیە وە هێرشیان بۆ کرا و بۆ بەیانی بە تەواوی دەست بەسەر حەوزی بیتوێن داگیراو

ڕۆژی دووەم تەواوی ناوچەکە کەوتە دەستی خەڵك و سەربازەکان هەموویان خۆیان بەدەستەوەدا.

**پ٧) کۆیە چۆن ئازادکرا ؟**

ڕۆژی دوای ڕاپەرینی ڕانیە شەهید علی نەبی ترسی لێ نیشتبوو ئەگەر ڕاپەرین فراوان نەکرێت ئەوا ڕەنگە لە کۆیەوە هێرشیان بۆ بکرێت . بۆ ئێوارەی ڕۆژی دووەم هێزێکی پێکهێنابوو هێرشی کردبوو بۆ رەبیەکانی پشتی چناروك بەلآم نەیانتوانی دەستی بەسەرا بگرن ، جاشەکانی قاسم ئاغاش بەرەو بیتوین ویستیان هێرش بکەن بەلآم ئەوانیش شکستیان خواردو خەڵك تەقەیان لێ کردن و ڕایان کردەوە بەرەو کۆیە .

ئێمە دەستمان کردە جم وجۆڵ بۆ هێزکۆکردنەوە لە کۆنە پێشمەرگەکانی خۆمان و هەندێك ئامرسریەی فەوجە خەفیفەکان کە ئەمانناسین و بەردەوام یارمەتی هێزی پێشمەرگەیان دابوو . لەوانە سریەیەکی خەڵکی قەمتەران و سریەیەکی بۆلیەکان و کۆنە پێشمەرگەکان کۆبووینەوە ، بوبوین بە هێزێك کە ژمارەمان نزیکەی ١٥٠ کەس ئەبوو ،تائەمانەمان ئامادە کرد ، هێزەکانی قاسمەڕەش و ناوزەنگیش لە ڕۆژی ٧ی مانگ گەیشتنە ناوچەی ڕانیە و بیتوێن و ئەو ناوچەیەی سنوری قەلادزێ یان لەگەڵ هاتنی خۆیان پاك کردبۆوە .

لە هەولێرەوە ڕژێم هێزێکی زۆری ناردبووە کۆیە بۆ ئەوەی هێرش بکەنەوە بۆ سنووری بیتوێن ترسێکی لای خەڵکی کۆیە دروست کردبوو. بەلآم بە هۆی ڕاپەرینی سلێمانیەوە ئەوهێزە وورەیان بەردابوو . ئەو هێزەی ڕژێم لە کۆیە خەریکی خۆئامادەکردن بوون چەندین تۆپ و هاوەنیان دامەزراندبوو ، ئێمەش لە چناروکی

بلباسانەوە لە ئێوارەی ( ١٩٩١/٣/٨ ) بەرێکەوتین بۆ ناو کۆیە لەگەڵ کاک ڕەهبەروکاك توفیق کانی وەتمانی و ئەوانیش هەریەکەو مەفرەزەیەکیان لەگەڵ بوو ، هەموومان بەیەکەوە چوینە ناوکۆیە و لە گەڕەکی حەمامۆك شانەکانی بروسك هاتنەلامان و بەچاوساغی ئەوان هێزەکەمان دابەش کرد ، شەهید فریاد و مامۆستا زیرەك بۆ گەرەکی ئیسکان و کاك توفیق کانی وەتمانی بۆ لێدانی مەنزومەی ئیستخبارات، چواررەبیە لە گردەکانی پشت ماڵەکانی حەمامۆك جاشیان تیدابوو، پەیوەندیمان پێوەکردن دوانیان شوێنەکانیان تەسلیم بە پێشمەرگەکانی ئێمەکرد و دووڕەبیەشیان دۆستی حزبی شوعی بوون کانەبی گەورەکە لەگەڵ حەوت پ.م لەگەڵ هێزەکە بەشداربوون پەیوەندیان پێوەکردن و پێشمەرگەمان ناردە شوێنەکانیان ، بەمەش پشتمان قایم بوو ، من و کاك رابەر لە قەسری کاکە زیادەوە کەبوو بووە ناوەندیکی سەرپەرشتی کردن تا شەرگەرم بوو ماینەوە ، یەکەم تەقە لە مەنزومەی ئیستخبارات کراو شەڕ لە وێوە دەستی پێ کردسەر لە بەیانی رۆژی ٢٠٠٩/٣/٩ لەگەڵ گەرم بوونی تەقە خەڵکی گەڕەکی جمعیە و سەرباغ هێرشیان کردە سەر منەزەمەی حزبی بەعس ، جاشەکانی قاسماغا لەسەر قوتابخانەی کۆیەی یەکەمەوە تەقەیان لە خەڵك کرد بەڵام لە ترسا بەرەو سەراو دواتر بەرەو قشڵەی کۆیە ڕایان کرد .

ئێمەش بەرەو گەڕەکی قەڵات و ئینحساری توتن چوین بە هوتاف کێشان بەمەش خەڵکی ئەو گەڕەکە ڕاپەرینیان کردو لە ماوەیەکی کەمدا ڕاپەرین هەموو شاری گرتەوە . تەنها ئەو شوێنانەی بەرگریان کرد مەنزومەی ئیستخبارات و قشڵەی کۆیە بوون کە دواتر ئەوانیش ڕایان کرد بەرەو سەربازگەی تۆبزاوا وبووە هۆی ڕوخانی وورەی هەموو هێزەکەیان ودواتر ڕایان کرد بەرەو هەولێر و زۆربەیان خۆیان

بەدەستەوە دا ، هەموو کەل و پەل و تفاقی سەربازیان کەوتە دەستی خەڵك و تۆڵەی زوڵم وستەمی چەندینساڵیان لێ کرایەوە.

شەڕ تا ئێوارەی ڕۆژی ١٩٩١/٣/٩ بەردەوام بوو دوا بنکەیان لە قشڵە لە ئێوارەدا بەرەو سەربازگەی تۆبزاوا هەڵهاتن ، لەو ڕۆژەدا چەندین کەس بریندارو شەهیدبوون لە خەڵك و پێشمەرگە کە لەم کاتەدا هەموو ناوەکانم لەبەردەست دا نیە ، لەوانە

شەهید جەوهەری ناسکە لە هێرش کردن بۆ سەر قشڵەی کۆیە بریندار بوو، مامۆستا زیرەك خدر لە لێدانی لۆریەکی پڕ تەقەمەنی لە گەڕەکی ئیسکان کە پڕ بوو لە گوللە هاوەن دەیگواستەوە بۆ بناری هەیبەت سوڵتان بریندار بوو.

هێزەکانی ئێمە فەرمانی ئەوەیان پێ کرابوو کە :

١- دام ودەزگاکانی حکومەت بپارێزن و نەهێڵن تێك بدرێت.

٢- هەموو کەسێك بەخشراوەو سەرو ماڵی هاولاَتیان بپارێزن.

جگە لە قاسماغا هەموو مستشارو ئامرسریەی ناوچەکە خۆیان تەسلیم بە هێزی پێشمەرگە کردو بەخشران لەوانە:

١- زاهیراغا فەرماندەی فەوجی خەفیفە(مستشار).

٢- میرزای سمایل دارکیش فەرماندەی فەوجە سێ سەدیەکان.

٣- مام یحیا فەرماندەی فەوجی خەفیفە(مستشار).

٤- بەرێوەبەری ناحیەی کۆیەو پۆلیسەکانی.

٥- ئەفسەرو عەسکەری زۆر کە خۆیان تەسلیم کرد.

پێویستە بلێین کە هێزەکانی ناو شار بانقی کۆیەیان پاراست کە پارەو زێری خەلکی تێدابوو. ئەویش بە کاك رزگار قادر یاسین سپێردرابوو بە ئەمانەتەوە جێ بەجێ ی کرد.

**یانزەهەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەحمەد ئیسماعیل (ئەحمەد گەل[1])، کۆیە، ٢٠٠٧/٥/١٠:**

**پ١/کورتەیەک لەچۆنیەتی ڕزگاربوونی هەولێر لە ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١دا:**

دیارە لەدوای ئەنفالەکان بەهۆی ئەم بارودۆخە خراپەی ڕووبەڕووی هێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و خەڵکی کوردستان بەتایبەت دانیشتوانی گوندەکان بۆوە. (ی.ن.ک) بڕیاری دا کەشێوەی خەبات بگۆڕێ، بۆیە بەرنامەی هەبوو بەشێك لەسەرکردایەتی لە ئەوروپابن‌و بەشێك لە ئێران بێت‌و بەشێکیش لەناوەوەی شارەکانی کوردستان بن. بۆ ئەوەی لەمەترسی دەوڵەتی ئێران دەربچێت، بۆ هەر جۆرە معادەلەیەکی سیاسیی نێوان عێراق‌و ئێران دا.

دیارە دوای ئەوەی مەفرەزە پارتی زانەکان لەناوچەکاندا دابەشکران‌و دەست بەکاربوون. بێ ئومێدی‌و بێزاری هەڤاڵان‌و ئەندامان‌و کۆمەڵانی خەڵك لە لوتکەدا بوو. بەشێکی زۆر لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەندێك بەپرس‌و هەندێك بەبێ پرس تسلیمی

---

(١)ئەحمەد ئیسماعیل ڕەحمان ناسراو بە ئەحمەد گەل ساڵی ١٩٦٧ لەدایك بووە، لەساڵی ١٩٨٤ پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە‌و بەشداربووە لەدروستکردنی شانە چەکدارەکانی بروسك، لێپرسراوی محوەری تەنفیزی‌و تەشریعی بووە لەشاری هەولێر لەچوارچێوەی ڕێکخستنە نهێنیەکانی شانە چەکدارەکانی بروسك. بەشدار بووە لە سووپای ڕزگاری کوردستان (سرك). لەدوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ەوە بەردەوامە لەسەر کاری ڕێکخستن‌و دواکاری ڕێکخستنی لەئێستادا جێگری یەکەمی مەڵبەندی ١٤ی ڕێکخستنی کۆیەی (ی.ن.ك)ە. دەرچووی زانکۆیە‌و بکالۆریۆسی هەیە لەبواری مێژوودا.

حکومەت (عێراق) بوونەوە، بۆیە پەیوەندیەکانی ئێمە وەکو ڕێکخستن، لەگەڵ سەرکردایەتی ئاڵۆزببوو، تەنها (سێ) قەنەوات هەبوو:

١- لەڕێگەی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، بەپێی هەندێك (جفره) لەکاتی تایبەت توجیهات دەگەیشت.

٢- لەڕێگەی (تەتەر)، ئەوکاتە شەهید (کاکە زیاد) تەتەر بوو.

٣- لەڕێگەی سەفەرکردنی ئێران، ئەوەش زۆر زەحمەت بوو، کە دەبوایە هەڤاڵێك دیاری بکرابوایە.

**پ٢/کارەکانمان لەدوای ئەنفالەکان:**

هەنگاوی یەکەم:- هەوڵ دان بۆ بەرزکردنەوەی وورەی ئەو هەڤاڵانەی کە جێی گومان نەبوون، بەڵام ڕووخابوون باوەڕیان بەهیچ نەمابوو، بۆ ئەوەی تووشی هیچ هەڵەیەك نەبن، ئەنجا هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی نووسراوی تایبەت، کە خۆمان دەمان نووسی بەناو دامو دەزگاکان بڵاودەکرایەوە، بۆ ئەوەی هەم وورەی خەڵك بەرزبێتەوە، وەهەم دوژمن بزانێت یەکێتی (ڕێکخستنەکان) لەناو شارەکان بوونی هەیە.

هەنگاوی دووەم:- هەوڵ دان بۆ خۆنزیکردنەوە لەخەڵك بۆ ئەوکاتانەی کە صدام حسین سەردانی ناوچەکانی دەکرد، خەڵك بەدڵسۆزی خۆی نیشان بدات بۆ صدام حسین، وەلەهەمان کاتدا داوای ئازادکردنی ئەنفالەکان بکەن، کە ئەمەش لەچەند شوێنێك سەری گرت، بۆ نمونە: لە (هەرێر).

هەنگاوی سێیەم: پەیوەندی کردن بە هەڤاڵەکانی خۆمان، بەتایبەتی ئەو پێشمەرگانەی گەڕابوونەوە، ئەوانەی کە وورەیان

نەڕووخابوو، وە جێگەی ئومێد بوون، ئەم پەیوەندیەش تەنیا ڕێکخستن نەبوو، بەڵکو ئامادەکردنیان بوو بۆ چەکدارکردنیان لەکاتی پێویست دا، دیارە لەم بوارەشدا زۆر سەرکەوتوو بووین.

هەنگاوی چوارەم:- ئامادەکردنی ڕێکخستنەکانی خۆمان (یەکێتی)، بۆ ڕاهێنانیان لەسەر چۆنیەتی وەرگرتنی چەك لەکاتی پێویستدا.

هەنگاوی پێنجەم:- واتە دوای گرتنی کوێت (لەلایەن عێراق)، دوای دانانی بەرنامەی ڕاپەڕین لەشاخ. ئاگادارکراینەوە باشتر خۆمان ئامادەبکەین، بەتایبەت دوای لێدانی عێراق (لەلایەن سوپای ئەمەریکاو هاوپەیمانانی لەسەر پاشە نەکشەکردنی عێراق لە کوێت) کارەکان گەرمتربوون، ئەوەبوو پەیوەندیمان پێوەکرا کە زیاتر هەوڵ بدەین بۆ دروستکردنی شانەی چەکدار. ئەوەبوو ئەوکاتە دەیان نامەی بە مۆرکراومان بۆهات کە هەندێکیان دیاریکرابوون کە بۆ کێیەو هەندێکیشیان دیاری نەکرابوون، وە ڕێکخستنەکان دەسەڵاتیان پێدرا بەناوی سەرکردایەتی (یەکێتی) هەر بەڵێن و بڕیارێك دەدەن. کە دیارە ئەوکاتە (کاك مەلا قادر) سەرپەرشتی ڕێکخستنەکان و سەرجەم شانە چەکدارەکانی هەولێری دەکرد. (کاك مستەفای سید قادر) ساڵی ١٩٩٠ گیرابوو، بۆیە وورده وورده کارەکان فراوان دەبوو، چەندین مستەشاری جاش پەیوەندیان کرد، بەمەش زۆرترین سوودمان لێیان وەرگرت بۆ دابینکردنی چەك و فیشەك.

**پ٣/دابەشکردنی هەولێر بۆ ڕاپەڕین:**

یەکەم:- لە ١٩٩١/٣/٦ حیزبی شوعی لە شاری هەولێر بەتەمابوون شتێك (وەك خۆپیشاندانو ڕاپەڕین)، من (واتە ئەحمەد گەل) لە ١٩٩١/٣/٥ ناردرامە لایان بەڕەسمیو پێم گوتن هەڵەیە هەرشتێ بکەن، چونکە ئێمە جارێ دەست پێ ناکەین، نامانەوێ لەهەولێر دەست پێبکەین، تا ئەو هەموو فرقەو لیوایانەی جادەی (هەولێر- حاجی ئۆمەران)، جادەی (هەولێر- موسڵ) هەبێت لە هەولێر سەرکەوتوو نابین، بۆیە کاتی دەست پێکردنی ڕاپەڕینی هەولێر ماویەتی، بەڵام ئەوان (واتە ڕێکخستنەکانی حیزبی شوعی لە هەولێر) لەپێش مەکتەبەی تأمیم خۆپیشاندانێکیان کرد کە مێك بچوك بوو، لەئەنجام لێیاندراو شەهیدو بریندارێشیاندا، ئەوانەی تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد (مامەند قەشقە) بوو.

دیارە ئێمە (ڕێکخستنەکانی یەکێتی/ شانە چەکدارەکانی بروسك) هەولێرمان بۆ چەند پارچەیەك (میحوەر) دیاریکرد، بۆ ئەوەی لەکاتی ڕاپەڕین هەرکەسەو کاری خۆی بزانێ. دابەشکردنەکەمان بەم شێوەیە بوو:

١- شەهید (دێدەوان سید محمد) داندرا سەرپەرشتیو چاودێری خەتی جادەی هەولێر- کەرکوك تا دەگاتە ناوشار بکات، بۆ یەکەم لێدان لە داموو دەزگاکانی سنوورەکە، کە منزومە لەسەر ئەو خەتە بوو. واتە شانە چەکدارەکان دەبوایە بەر لەجەماوەر بۆ وورە بەرزکردنەوەی جەماوەر یەکەمین کەس دەست پێبکەن. دیارە هەرواش بوو، لەهەموو شوێنەکان هەر چەند تەقەیەك دوای شانە

چەکدارەکان، جەماوەر ڕووی تێدەکردو کۆتایی پێدەهێنا، بەڵام تا ڕادەیەك شانە چەکدارەکان دەوری قیادەیان دەدید.

٢- سالار، ناسراوبوو بە سالار بروسك، یاخود سالارە شەل، سەرپەرشتیو چاودێری سنووری (معسکرو حی العسکری) بوو، بەهەمان شێوە.

٣- ئەحمەد گەل، سەرپەرشتیو چاودێری سنووری (تنفیژی و تشریعی) ئەوکات بوو، واتە شوێنی پەرلەمانو ئەنجومەنی وەزیرانی ئێستا لە هەولێر.

٤- مام خدر، سەرپەرشتیو چاودێری سنووری عنکاوە بوو.

٥- (ندار) سەرپەرشتیو چاودێری سنووری گەڕەکەکانی اسکانو سیداوەو شەست مەتری بوو.

ئەوەی من ئاگادارم بەم شێوەیەبوو، بەڵام هەر لەدوای یەکەم تەقە، ئاڵو گۆڕی تێکەڵ بوون لەگەڵ جەماوەر ئەم واقعە گۆڕا، بەتایبەت کاتێ گرتنی (مەنزومەی شمالی) دواکەوت، هەموو جەماوەر بۆ ئەوێ چوون، تا هێزی پێشمەرگە گەیشت بەهەمان شێوە.

## پ٤/چۆنیەتی دەست پێکردن بە ڕاپەڕین:

دوای ئەوەی شەقڵاوە ئازادکرا، کاك مەلا قادرو کاك ندار بەیەکەوە توانیان خۆیان بگەیننە شەقڵاوەماڵی شەهید (تحسین کاوانی). دیارە لەم ناوچەیە توانیان کاك کۆسرەتو شەهید عبدالرزاق ببینن. دیارە کاك مەلا قادر بەرنامەکەی خۆمانیان، واتە ناو شاریان پێدانو تەنسیق کرا.

ئەم ڕۆژە بەلێن درا خۆمان دوابخەین بۆ ئەوەی ١٠ی مانگ ئەنجام نەدرێ با ١١ی مانگ بێت بۆ مناسبەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، دیارە دوای ئەوەی کاك مەلا قادر هاتەوە ئێمەی بینیەوەو ئەو هەڤاڵانەی سەرپەرشتی هێڵەکانیان دەکرد ئاگادرای کردین لەدەست پێکردن،

وەگۆتی ئەوکاتەی ئاگاداریان بۆ لێ دەدەن لە ڕێگەی ڕادیۆ، کە ئەوکاتە هەموو شتێك ئەم ڕادیۆیە بوو، گوتی ئەوکاتە هێزی پێشمەرگە لە مصیف دابەزیوون‌و بەئاسانی دەگەنە لامان.

ئەوەبوو ئاگادارییەکەش بەناوی: "لەباوکی ڕێناسەوە بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بروسك، دەست بەکاربن"، لەڕاستیدا ئەم ئاگادارییە چەرخی هەڵگیرساندنی ڕاپەڕین لە هەولێر بوو. دیارە لەگەڵ بیستنی ئەم ئاگادارییە هەریەکە شوێنی خۆمان دیاری کردبوو هەڤاڵەکانیشمان ئاگادارکرابوون بۆ کاتی دیاریکراو بەچەك‌و پێویستییەکان‌و دەست پێکردنی.

بەڵام بۆ مێژوو ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان ئەوەندە ئامادەیی خەڵکی هاندابوو خەڵك وەکو ئێمە بەگوڕو تین تر هەر لەگەڵ یەکەم تەقە بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٩١ جەماوەر وروژان‌و پاڵپشتی شانە چەکدارەکان بوون، وە لەماوەیەکی زۆر کەمدا هێزی پێشمەرگە گەیشتن.

هەروەها دەکرێت بڵێین ڕاپەڕین لەسەر چوار بنەما یاخود پایە بوو، کە هەر چوار پایەش (ی.ن.ك) قیادەی دەکرد، ئەوانیش:

١- ڕاگەیاندن، کە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان بوو.
٢- بەرنامەی ڕاپەڕین، کە سەرکردایەتی (ی.ن.ك) داڕێژەری بوو، ئینجا موافقەی بەرەی کوردستانی لەسەر کرد.
٣- هێزی پێشمەرگە، زۆرترین هێز قیادەی مەیدانی یەکێتی بوو.
٤- شانە چەکدارەکانی بروسك لە هەولێر، شالاو لە سلێمانی، ئەمانەش لەلایەن ڕێکخستنەکانی یەکێتی دروستکرابوون.

دوانزەهەم: چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا عەبدوڵڵای ئەنجومەن[1])، هەولێر، ٢٠٠٨/٨/١٠:



سەرەتا پێش ئەوەی پرسیارەکان وەڵام بدرێنەوە پێویستە هەندێ ڕێنوێنی وورد هەن بیانزانین سەبارەت بەخەڵکی قەڵادزێ لەناوچەکەدا (هەولێر).

دوای ئەوەی کە ڕژێمی عێراق قەڵادزێی لە ساڵی ١٩٨٩ ڕاگواست، دابەشی کرد بەسەر هەردوو پارێزگای سلێمانی و هەولێر، لەهەر یەك لەپارێزگاکانیش دابەشی سەر چەند کۆمەڵگەیەکی کردن، لەهەولێر دابەشکران بۆ ئۆردوگاکانی:

- دارەتوو: کەلەسەر ڕێگای کەرکوك هەولێرە، لەهەولێرەوە نزیکە.
- جدیدە: لەسەر ڕێگای موسڵ هەولێرە، و نزیکی ١٥-٢٠ کم لەهەولێرەوە دوورە.
- تۆبزاوە: لەسەر ڕێگای موسڵ هەولێرە و نزیکی ٢٠-٢٥ کم لەهەولێرەوە دوورە.

---

(١)مەلا عەبدوڵڵای ئەنجومەن: لەساڵی ١٩٤٧ لە گوندی هوریێوەی بناری پشدەر و رۆژهەڵاتی قەڵادزێ لەدایك بووە. لەسەرەتای شەستەکاندا خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە. لەڕاگواستنی قەڵادزێدا ماڵی دەچێتە ئۆردوگای خەبات. لەدوای ڕاپەرین لە ساڵی ١٩٩١ بە ئەنجومەنی قەڵادزێ هەڵدەبژێرێت. لەماوەی کاری ئەنجومەنیدا بەهۆی نەبوونی ئیدارەی حکومەت تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٢ هەموو کارەکانی قەزای پشدەریان بەڕێوەبردووە. تاساڵی ١٩٩٤ ئەنجومەن بووە. ئێستا لەهەولێر دادەنیشێت.

- کەوەرگۆسك: لەسەر ڕێگای موسڵ هەولێر بەدەستی چەپ بۆی لادەدەی نزیکی ٤٠-٤٥ کم لەهەولێرەوە دوورە.

- خەبات: لەسەر ڕێگای موسڵ هەولێرە و نزیکی ٣٠ کم لەهەولێرەوە دوورە.

پ١/ بۆچی رژێم ڕێگای موسڵ هەولێری هەڵبژارد بۆ ئۆردوگاکان؟

و/ لەڕاستی مەبەستی سەرەکی رژێم لەو ڕێگایە، ئەوەبوو خەڵکی قەڵادزێ کە خاوەنی هەستێکی شۆڕشگێڕی یاخی بوون بوون لە ڕژێمی بەعس، گەمارۆ بدات لەنێوان هەردوو فەلەقی هەولێر و موسڵ و جموجۆڵی چەکداری لەناویاندا کز و بەرەو نەمان ببات.

پ٢/ هەڵکەوتەی ئۆردوگای خەباتو شوێنەکەیو چۆنیەتی دروست بوونی؟

و/ ئۆردوگای خەبات بەشێك بوو ئەو کات لەناحیەی کەڵەکی سەر بە پارێزگای هەولێر، بەر لەوەی قەڵادزێییەکانی بۆ ڕابگوێزرێن خەڵکی هەرکی تێدا نیشتەجێ کرابوون، کە دەکەوتنە لای زێی گەورە، پاشانیش دیبەگی و برادۆستی و دیرەیی تێدا نیشتەجێکرابوون.

کاتێك قەڵادزێیەکان ڕاگوێزرانە خەبات، ئەوانیش بوون لە دوو گەڕەکی سەرەکی، کەواتە خەبات لە گەڕەکەکانی (هەرکی و دیبەگیی و سەنگەسەری و قەڵادزێی)یەکان پێکهاتبوو.

پ٣/ هۆکارەکانی دروست بوونی ڕاپەڕین لە ئۆردوگای خەبات؟

و/ وەك دەزانین ئەو کات ڕژێمی بەعس لەشەڕێکی مان و نەماندابوو لەبەرەکانی باشوور لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا، ڕێژەی فیرار (ڕاکردن لەخزمەتی سەربازی) لەناو کورددا زۆربوو، ڕۆژانە دەورییەکانی پۆلیسی ڕژێم بەدوای فیرارەکاندا دەگەڕان. ئەو ڕۆژە دەورییەکی

پۆلیس دەچێتە ناو گەڕەکی سەنگەسەرییەکان لەو دەیەویانەوێت چەند گەنجێك بگرن، ئیتر دەبێتە کێشمەکێشم و شەڕ لەنێوانیان و پۆلیسەکان دەکەونە بەر هێرشی گەنجەکان، ئیتر ئەو شەڕ و هەرایە کۆڵانە و کۆڵان پەرەدەستێنێت و دەبێتە راپەڕین، لەدەوری کاتژمێر ١١ی سەرلەبەیانی ئەو کێشەیە دروست دەبێت و هەرسێ گەڕەکەکانی قەلادزێیەکان و سەنگەسەریی و دیبەگەییەکان ئازاد دەکرێن. گەڕەکی هەرکییەکان هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە لەبەر ئەوەی ئەوان جاشی رژێم بوون. بگرە لەدواییدا ئەوان دەبنە داردەستی حکومەت بۆ لێدانی خەڵکی قەڵادزێ.

کاتێك بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی ناحیەی کەڵەك بەو کێشەیە دەزانێت سەرووی خۆی ئاگادار دەکاتەوە، لەو کاتەشدا لەناو قوتابیانی قەڵادزەییەکاندا کلاشنیکۆف دابەش کرابوو لەلایەن (ئیتحاد تەڵەبە)وە، ئیتر ئەو کلاشینکۆفانە کەوتە دەست گەنجەکان و راپەڕینەکە تا رادەیەك هێز و توانای بەخۆییەوە بینی.بۆ رۆژی دواتر چوار دەوری ئۆردوگاکە بە جەیش و دەبابە گیرا و لەلایەن رژێمەوە داوای تەسلیم کردنەوەی چەکەکان دەکرا، لەو نێوانە کۆمەڵێك ریش سپی قەڵادزێیی هەستان بە دانوستان لەگەڵ رژێمدا، ریش سپییەکان ئەمانە بوون (مەلای نورەدینی، حەمەسووری مینە عارەب، مەلا سەید سلێمان، حەمە عارەب، حاجی حمد خدر، حاجی سلێمانی نورەدینی، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا).

لەکاتی دانووستانەکاندا رژێم هەرکییەکانی هاندا تاوەکو لەگەڵ قەڵادزێیەکاندا کێشە دروست بکەن و شەڕ بنێنەوە، کاتێك هەرکییەکان هێرشیان هێنایە سەر قەڵادزێیەکان (برایم ئاغا) هەستا بەدابەشکردنی چەك بەسەر خەڵکی داو شەڕی نێوان هەرکی و قەڵادزێییەکان گەورە

بوو، هەرکییەکان نەیتوانی هیچ کارێك بۆ دوژمن بکەن، دانووستانەکان بەردەوام بوو لەنێوانی رژێم و ریش سپییانی قەڵادزێییدا. تا راپەڕینی گەیشتە هەولێر لە ١٩٩١/٣/١١ دا.

پ٤/ چەند کەس کوژران‌و شەهید بوون؟

و/ لەو راپەڕینە قەڵادزێییەك بەناوی (بەختیار هورێوەیی) و کوڕێکی دیبەگی شەهید بوون، لەگەڵ دوو کەسی تری هەرکی کوژران.

پ٥/ کێ ڕۆڵی باڵای هەبوو لەو راپەڕینە؟

و/ زۆرن ئەوانەی دەووری باڵایان هەبوو لەو راپەڕینەدا بەڵام هەڵگریسێنەری راپەڕینەکە گەنجێك بوو بەناوی (عەلی مەحمودی ئەحمەدی خوبی)ە.

پ٦/ ئایە ئەو راپەڕینەی خەبات بەرنامەی بۆ دانرابوو یان کارێکی عەفەوی بوو؟

و/ لەرووی بەرنامە رێژییەوە هیچ بەرنامەیەك بۆ ئەو رۆژە لەئارادا نەبوو بۆ راپەڕین، کەواتە دەتوانین هیچ لایەنێکی سیاسی لەپشت ئەو راپەڕینە نەبوو، بەڵام رێکخستنە نهێنییەکان لەکاتی بەرپابوونی راپەڕینەکە کاریگەرییان هەبوو.




نەخشەی پارێزگای هەولێر



**کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی- جەلال تاڵەبانی- شەهید حەسەن کوێستانی دوای ڕاپەڕین هەولێر ۱۹۹۲**



دەستەی پێشمەرگە پارتیزانەکانی ی.ن.ک لەکاتی گەڕانەوەیان بۆ کوردستان بەر لەڕاپەڕین مانگی شووباتی ١٩٩١



دەستەی پێشمەرگەکانی قۆڵی ڕزگارکردنی کۆیە

چناڕۆك ١٩٩١/٣/٨

م.باپیر- شەهید تەحسین کاوانی- م.زیرەك- ئاشتی سابیر میرە

لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەی دیکە



دەستەی پێشمەرگەکانی قۆڵی ڕزگارکردنی کۆیە
چنارۆک ١٩٩١/٣/٨



بەشێك لە باڵەخانەی داموو دەزگەكانی ڕژێمی بەعس،
لەلایەن جەماوەری ڕاپەڕیوو سوتێندراوە.



**ژنە تێکۆشەر (ئومێد فەتاح تۆفیق)**

**ئەو ژنەی یەکەم هاواری ڕووخانی ڕژێمی بەعسی فاشی دا،**

**لە ڕێککەوتی ٦/٣/١٩٩١ی خۆپیشاندانەکەی حیزبی شیوعی لە هەولێر**

## سوپاس نامە

- زۆر سوپاس بۆ برای بەڕێزمان بەڕێز کاك (کۆسرەت ڕەسول عەلی)، کەوا ئەرکی لەچاپدانی ئەم بەرهەمەی گرتە ئەستۆی خۆی.
- سوپاس بۆ بەڕێزان کاك (ممتاز حەیدەری)و مامۆستا (عەبدولواحید)و مامۆستا (باپیر) لەمەڕ دابینکردنی چەند وێنەیەك بۆ پاشکۆی ئەم کتێبە.
- سوپاس بۆ برای ئازیزم مامۆستا (ئاراس عەبدولڕەحمان)، کە چەند بەڵگەنامەیەکی مێژوویی گرنگی پێدام، سەبارەت بە شانە چەکدارەکان و ڕێکخستنە نهێنیەکانی شاری هەولێر.

لەناوکی ڕێناسەوە بۆ گشت شانە چەکدارەکانی بزووسک، دەست بەکاربن

## دەربارەی ئەم کتێبە

ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەگشتیو ڕاپەڕینی شاری هەولێر بەتایبەتی ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ بوو لە مێژووی نەتەوەی کورددا، چونکە ئەو شارە یەکەم جاربوو ئەو ئازادییە بەخۆیەوە ببینێ، هەروەها کاریگەری گەورەشی بەسەر شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستاندا هەبوو، بەتایبەتی بوو بەرێگەیەکی سەرەکی بۆ ئازادکردنی شاری کەرکوك لە دواتردا، بەڵام تائێستاش ئەم ڕووداوە مێژووییە بەشێوەیەکی زانستیانە لێی نەکۆڵراوەتەوە، بەڵکو نووسینەکان زیاتر لەشێوەی ووتاردا بڵاوکراونەتەوە یاخود گوزارشتی لە بۆچوونی لایەنێك لەلایەنە سیاسیەکانی کوردستان کردووە. هەموو ئەمانەش هاندەری سەرەکیم بوون تا بەشێوەیەکی زانستیانە قۆناغەکانی ڕاپەڕینی شاری هەولێر لە ئازاری ١٩٩١دا لە توێژینەوەیەکی زانستی سەربەخۆدا بە پشت بەستن بە چەندین سەرچاوەی زانستیو مەیدانی، بخەمە ڕوو.